


**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ژنە فەیلەسوفەکانی جیهانی کۆن** (ژن لە فەلسەفەدا) (٤)
- **نووسینی:** د. ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام
- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:** هاوار محەمەد
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **سەرپەرشتی پرۆژە:** هاوار نەسرەدین
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩٥١) ساڵی ٢٠١٣ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٥٧)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

# دەروازەیەکی گشتی

﴿قَالَت يَا أَيُّهَا المَلَؤُا أَفتُونيِ فيِ أَمري مَا كُنتُ قِاطِعَةً أَمراً حَتَّى تَشهَدُونِ﴾
(سورة النمل: الآية ٣٢)

«جنس الذكر أصلح للرئاسة من جنس الأنثى، ومن ثم فتسلط الرجال على النساء مسألة طبيعية جداً»..!
أرسطو (السياسة ١٣٥٩ ــ ١)

ئەم کتێبە ــ کە ژمارەی چوارەمە لە زنجیرەی "فەیلەسوف و.. ژن" بانگهێشتێکە بۆ ژنی عەرەبی تا متمانەی بە خۆی بۆ بگەڕێتەوە، تۆزی چەندین ساڵەی نەزانی و دواکەوتوویی لەخۆی بتەکێنێت. ئەوە بانگهێشتێکە بۆ ئەفرۆزکردنی ئەو بیرۆکە ساویلکانەیەی کە دەڵێت: «عەقڵی ژن کەمترە لە عەقڵی پیاو» یاخود سۆز و هەڵچوون بەسەر بیرکردنەوەی ژندا زاڵە، حوکمەکانیشی دڵگەرمی و هەڵەشەییان تێدا باڵادەستە و خاڵین لە هەر دیدگایەك و توانای هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی نییە. نە ئایین شتێکی لەم چەشنەی گوتووە و نە زانستیش دانی پێدا دەنێت، نە مێژووش گەواهی بۆ راستی هیچ تێڕوانینێکی لەم جۆرە دەدات.

ئەوەی راستی بێت ئەرستۆ ــ مامۆستای یەکەم ــ باوەڕی بەم بیرۆکە ساویلکانەیە هەبو، ئینجا ئەم تێڕوانینە هەم لە جیهانی عەرەبی و هەم لە جیهانی رۆژئاوا بڵاو بوویەوە، بووە رێنما و رێنیشاندەری ژنان بە گشتی، ئیدی ژن بووە "پیاوێکی نوقسان"، کە لەم دنیایەدا جگە لە وەچەخستنەوە و پەروەردەی منداڵ هیچ رۆڵێکی تری نییە. ئەوەی لە تیۆرەکەی ئەرستۆدا زۆر مەترسیدارە ئەوەیە کە

پێی وایە سروشت "کە هیچ شتێك لە خۆڕا ناکات" وای لە ژن کردووە لەو ئاستە نزمەدا بێت و لێرەشەوە داب و نەریتەکان یان کردەکانی کۆمەڵگە —بەتایبەت کۆمەڵگەی نێرسالاری ــ هیچ دەستێکی لە دیاریکردنی ئەم ئاستە نزمییەدا نییە[١].

سەیر ئەوەیە جیهانی عەرەبییش ــ لەبەر پێویستی خۆی ــ بە خۆشحاڵییەوە باوەشی بۆ ئەم تیۆرە ئەرستۆییە کردۆتەوە، شتێکیش لە مۆرکی پیرۆزیی خستۆتە سەر. با خوێنەران خۆیان بە ویژدانەوە بەراوردی ئەو ئایەتە پیرۆزە بکەن کە کردومانەتە دەستپێکی ئەم دەروازەیە و گەواهبن لەسەر عەقڵ کۆکی و دروستی بۆچوونەکانی، حیکمەتی ژن لە هەڵسوڕاندنی کاروباری فەرمانڕەواییدا، ئەوەش لە وێنەی "بەلقیس"ی شاژنی سەبەئدا خۆی دەنوێنێت، دوای ئەوەی نامەیەکی لە سولەیمانی داناوە پێدەگات، ئەویش لەگەڵ خانەدانەکانی گەلەکەیدا گفتوگۆ دەکات، دە با بەراوردی ئەمە بکرێت لەگەڵ گوزارەکەی ئەرستۆ کە ئەویشمان کردۆتە دەستپێکی ئەم دەروازەیە، تا خوێنەر بزانێت چۆن سەرلێشێواو دەمێنێتەوە گەر پێی وابێت ئەوە ئایینە کە لەبارەی عەقڵ نزمیی و بێ توانایی مێینە لە بەڕێوەبردنی فەرمانڕەواییدا، پشتیوانی لە بیرۆکە ساویلکانەکەی ئەرستۆ دەکات! پاش کەمێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ ئەم دوو بیرۆکەیە.

گەر بێتوو ئێمە لە ڕێگەی گەواهییەکانی مێژووەوە سەلماندمان تاکە ژنێك هەبووە خەریکی فەلسەفەکاریی بووە، یاخود بەڵگە بێت لەسەر خودان عەقڵی و ژیریی و هزردروستی لای ژن، ئەوا بەم کارە هەزاران نموونەی ئەرێنی تێك دەشکێنین کە شوێنکەوتووانی بیرۆکە پاشکەوتووە ئەرستۆییەکە بڕوایان پێیەتی، کە چاوی خۆی دەنوقێنێت تا نموونە ڕۆشنەکانی ژنە ژیرەکان نەبینێت، ئەو ژنانەی کە دروست بیریان کردۆتەوە، بۆچوونەکانیان ڕاست بووە، وەك کەمێکی تر دەیبینین.

ئەوەتا ئێمە، لەم کتێبەدا، نموونەگەلێکی "ژنانی فەیلسووف"ی جیهانی کۆنت پیشان دەدەین، کە بە پشتیوانی خوا بە دوایدا کتێبێکی دیش دێت و دەبێتە تەواوکەری ئەمیان کە لەوێدا "ژنە فەیلەسوفەکان" لە جیهانی نوێدا باس دەکەین،

بەڵام بەر لە هەموو شتێك دەبێت لەسەر دوو بیرۆکەی گرنگ کۆك و هاوڕا بین، ئەوانیش:

یەکەم: لە فەلسەفەی زانستدا ڕێسایەکی سەرەکی هەیە کە دەڵێت تاکە دیاردەیەکی نەرێنی دەیان جار گرنگترە لە هەزاران دیاردەی ئەرێنی، خۆ ئەگەر تۆ هەزاران پارچە ئاسن کۆ بکەیتەوە کە بە گەرمی دەکشێن، پاشان تەنیا یەك پارچە ئاسنت بێتە بەردەست، کە هەرچۆن لە نێو ئاگری دابنێیت ناکشێت، ئەوا ئەو تاکە پارچە نەرێنییە (کە ناکشێت) لەو هەزاران پارچە ئەرێنییە گرنگترە کە کۆتکردوونەتەوە. ئەوەش لەبەرئەوەی دەستبەجێ ئەو یاسایە پووچەڵ دەکاتەوە کە دەڵێ: «ئاسن بە گەرمی دەکشێت».. هەمان شت لەبارەی "کولانی ئاو" و "سەرئاوکەوتن" یان لەبارەی یاسا ناسراوەکانی تریشەوە بڵێ، لەم دۆخەدا دەبێت بەدوای یاسایەکی تردا بگەڕێیت، کە ئەو هەزاران دیاردە ئەرێنییە و دیاردە نەرێنییەکەیش کە تازە دۆزیوتەوە، بگرێتەوە، ئیدی تا ئەو کاتە ئەو "یاسا"یەی دەڵێت «ئاسن بە گەرمی دەکشێت» پووچەڵە.

دووەم: دەبێت زۆر بە باشی ئاگامان لەوە بێت ئێمە لەو ڕێگەیەوە دەمانەوێت ئەو گوزارەیەی کە زۆرجار باس دەکرێت و زۆر خراپیش بەکارهێنراوە، دوور بخەینەوە کە دەڵێت: «هەموو ڕێسایەك دەراوتە*ی هەیە». ئەو گوزارەیە بیرکردنەوەی زانستییانەی دروست ڕەتی دەکاتەوە، چونکە لە یاسادا دەراوتن نییە، بەڵکو دەبێت یاسا سەرجەمی ئەو دیاردانەی کە راڤەیان دەکات لەخۆ بگرێت. دیارە گوزارەی «لە هەر یاسایەکدا هەڵاوێر» هەیە پەیکەرتاشەکان دایانهێنا کاتێك نەیاندەتوانی وشەگەلێك لەو ڕێسا زمانەوانییە هەڵکۆڵن کە دایان دەنان، بۆیە بەم گوزارەیە خۆیان دەپاراندەوە، بەڵام ناتوانیت هیچ شتێکی لەم جۆرە لە یاسای زانستیدا بدۆزیتەوە، بۆیە ناتوانیت بڵێیت ئاو لە ١٠٠ پلەی سیلیزیدا (بە گوێرەی دۆخێکی دیاریکراو) دەکوڵێت، جگە لەم بڕە کەمە ئاوەی کە لە ماڵەکەی مندایە چونکە ئاوێکی ئاوارتەیە و هەموو ڕێسایەکیش ئاوارتەی هەیە! بیرکردنەوەی زانستی دروست پێت

دەڵێ دەبێت یاسا هەمەکی و گشتگیر بێت، واتە: بەسەر هەموو بەشەکانی ئەو دیاردەیەدا کە لێی دەکۆڵێتەوە جێ بەجێ ببێت. گرنگی تاکە دیاردەیەکی نەرێنیش هەر لێرەوە دێت، چونکە خەسڵەتی "هەمەکیبوون یان گشتگیری" تێکدەدات و ئینجا یاساکەش پوچەڵ دەکاتەوە و کارپێکردنی رادەگرێت تا ئەوەی یاسایەکی فراوانتر و گشتگیرتر دەدۆزرێتەوە کە لە یەك کاتدا، دیاردە ئەرێنییەکان و دیاردە نەرێنییەکانیش بگرێتەوە.

ئەم بەرچاو روونییە پێویسە بۆ ئەو شتەی کە ئێمە دەمانەوێت لەم کتێبەدا بیخەینەڕوو، ئەویش ئەوەی راهاتووین لە سەر عادەتێك کە لە خۆیدا بۆتە شتێکی ئێجگار نزیك لە بەڵگە نەویستێکی روونەوە، ئەگەر بڵێین: مێژووی فەلسەفە، بەتایبەت فەلسەفەی کۆن، بریتییە لە مێژووی فەیلەسوفانی پیا و، ئینجا: ئاشنا نین بەوەی کە "ژنانێکی فەیلەسووف" هەبووبن، تەنانەت خوێنەر ئەگەر لەناخی خۆیەوە گاڵتەی پێ نەیەت ئەوا لە ناونیشانی ئەم کتێبە سەری دەسوڕمێ! ئەوەتا سەرەتاکانی یەکەم فەلسەفە لە وڵاتی یۆنان لە سەدەی شەشەمی پێش لە دایکبوونی مەسیح، لە ناوچەی ئەیۆنیا، بە دیاریکراویش لە شاری ماڵتە Miletuse ـــ تۆمار کراوە، ژمارەیەکی کەم لە پیاوان بەرهەمیان هێناوە، کە سێ فەیلەسووفی پیاو بوون، ئەوانیش: تالیس Thales (دەوروبەری ٥٨٥ پ.ز) و ئەنەکسیمەندەر Anaximander (دەوروبەری ٥٦٥ پ.ز) و ئەناکسیمنس Anaximens (دەوروبەری ٥٤٦ پ.ز) ئەندامانی قوتابخانەی ئەیۆنیای کۆن، زانا سروشتییە یەکەمینەکان بوون، پاشانیش کاروانێك پیاوانی فەیلەسوفیان بەدواداهات: هیراکلیتس و فیساگۆرس و پارمەندیس و زینۆن و ئەنکساگۆراس و دیمۆکریتس..هتد، تا دەگەینە سەردەمی زێڕینی فەلسەفەی یۆنانی: سەردەمی سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ..، دوای ئەمانیش کاروانەکە بەردەوام دەبێت تا لە سەدەی سێیەمی مەسیحیدا دەگەینە بزووتنەوەی تەباکاری.

خۆ ئەگەر رێکەوتی مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوایی، گێڕانەوەی مێژوونووسەکانی وەکو: فیندلبانت و کۆنۆفیشەر و کۆپلستۆن و ئەمیل بریهییە (و تەنانەت مێژوونووسە

فەیلەسوفەکانی وەکو: هیگڵ و ڕەسڵ..)ت کردبێ، ئەوا بۆت دەردەکەوێ ئەو مێژووە خستنەڕووی هزری پیاوان و ڕێبازەکانیانە، ئیدی تۆ ئاماژەیەك بە فەیلەسوفانی ژن نابینیتەوە جگە لە یەك دانە سەر بە ڕێبازی ئەفلاتونیزمی نوێ، ئەویش بە خێرایی و — بەشەرمەوە ــ باسیان کردووە، ئەویش: هیپاشیا Hypathia ی ژنە فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەسکەندەری بووە، کە بەهۆی ئەو ناوبانگە گەورەیەوە لە مێژووی فەلسەفەدا، بۆیان سەخت بووە چاوپۆشی لێ بکەن.

خۆ ئەگەر لەم پیاوانە بپرسیت: بۆچی بەدرێژایی مێژوو "فەیلوسوفی ژن" نابینینەوە؟ ئەوا زۆرینەیان بەم جۆرە وەڵام دەدەنەوە: چونکە ژن ناسکە، سۆزدارە، خوێن گەرمە، توانای بیرکردنەوەی ئەبستراکتی نییە، یاخودا فەلسەفە ــ دواجار ــ "عەقڵە" و ژنانیش "لە توانا عەقڵییەکانیاندا نوقسانن" و لە زیرەکی و بلیمەتیدا ناگەنە پیاوان[٢]. لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە لە وڵاتی ئێمەدا، خەڵکانێك هەن ئەم بیرۆکە ساویلکانە، ئەم بۆچوونە هەڵانە دەدەنە پاڵ ئیسلامی مەزن، کە نموونەگەلێکی نایابی ژنانی پێشکەش کردوین، نە هەڵچوون بەسەریاندا زاڵ بووە و نە ملکەچی سۆزداری خۆیان بوون، نە ڕەفتاریشیان سەرگەرمی پێوە دیار بووە! هەر لێرەشدایە گرنگی ئەو ئایەتە پیرۆزە دەردەکەوێت کە لە زمانی "بەلقیس"ی شاژنی سەبەئەوە کردومانەتە دەستپێکی ئەم دەروازەیە، کاتێك نامەی سولەیمانی دانای پێدەگات نە لە وەڵامدانەوە پەلە دەکات و نە هەڵدەچێ و نە سەرگەرمیش دەبێ، بەڵکو بەرلەوەی بڕیارێکی مەترسیدار بدات کە زیان بە تەواوی شانشینەکە بگەیەنێت، گەلەکەی بانگ دەکات بۆ ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە «قالت یا أیهاالملأ أفتونی فی أمری ما کنت قاگعە أمراً حتی تشهدون» (النمل ــ ٣٢)، لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز وێنای هەڵچوونی ڕاوێژکارە پیاوەکانمان بۆ دەکات کە چۆن دڵگەرمبوون و پێداگرییان لەسەر بەکارهێنانی هێز کردووە «قالوا نحن أولوا قوە و أولوا بأس شدید و الأمر الیك فانڤری ماڗا تأمرین» بەلقیسیش ئاگاداری کردنەوە کە «الملوك إڗا دخلوا قریە أفسدوها و جعلوا أعزە أهلها أڗلە و کڗلك یفعلون» (النمل ــ ٣٤).

بە داخەوە ئێمە ئەم ئایەتە روون و رۆشنەمان واز لێهێناوە و دوای بیرکەکەی ئەرستۆ کەوتووین کە دەڵێت توانا عەقڵییەکانی ژن کەمترن لە تواناکانی پیاو، ئەوان بە کەڵکی فەرمانڕەوایی نایەن، تەنانەت ناتوانن کاروباری ماڵیش هەڵسوڕێنن! لەبەرئەوە «ڕەگەزی نێر لە رەگەزی مێ بۆ سەرکردایەتیکردن باشترە». بەم جۆرەش دەسەڵاتداری پیاوان بەسەر ژناندا دەبێتە شتێکی زۆر ئاسایی..! ئێمە دەستمان بە بیرۆکە وەسەنییەکەی ئەرستۆوە گرتووە، چاویشمان لەو ئایەتە رۆشنانە داختووە کە باس لە ژیریی عەقڵی ژن و دروستیی بۆچوونی ژن دەکەن، بە ئاشکرا لە ژنانێك دەدوێن کە لە فەرمانڕەواییدا دەیان جار لە پیاوان زیاتر لێهاتوویی و ژیریی و توانا و ئاسۆبینی بەرفراوانی خۆیان سەلماندووە. لەوانەیش "مارگرێت تاتشەر" لە ئینگلتەرا و ناسراو بە ژنە ئاسنینەکە و "بی نەزیر بۆتۆ" لە پاکستان و "ئەندێرا غاندی" لە هندستان و "جولدا مائیر" لە ئیسرائیل کە تاڵاوی زۆرمان بە دەستی چەشتووە[٣].

ئەگەر ئەو بیرۆکەیە پەسەند بکەین کە ئەم دەروازەیەمان پێ دەست پێکرد ئەویش ئەوەی کە، لە دیدگای بیرکردنەوەی زانستییەوە، دیاردەیەکی نەرێنی "یەك دانە" لە دەیان دیاردەی ئەرێنی گرنگترە ئەوا دەرەنجام بریتییە لە تێکشکانی ئەو بیرۆکە بڵاوەی کە لە بارەی لاوازی ژن و عەقڵ نوقسانی و زاڵێتی هەڵچوون و سۆزدارییەکان بەسەریدا و باڵادەستی و دڵگەرمی و خوێنگەرمی...هتد لە ئارادایە. ئەوانە هەر هەموو کۆمەڵێك وەهمن "عەقڵی پیاو" دروستی کردوون و ئەو واقیعە زیندووەیشی کە تێیدا دەژین ئەم وەهمانە لەنێو دەبات!

راستییەکەی ئەو هەڵمەتەی کە دژی "عەقڵی ژن" بەرپا دەکرێت و بانگەشەی ئەوە دەکات کە توانای فەلسەفاندنی نییە، بڕوای بەوەیە کە مێژووی فەلسەفە بریتییە لە مێژووی فەیلەسووفە پیاوەکان ـــ ئەم هەڵمەتە ئەو رۆڵە زەق و دیارە فەرامۆش دەکات کە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئایینی دەیگێڕن و بە کۆیلەکردنی ژنان لەلایەن پیاوانەوە و باڵادەستیی لەمێژینە بەسەریاندا و لێکەوتەکانی، هەموو ئەمانەیش لە هەل پێنەدان بە ژنان بۆ فێربوون و دەرخستنی توانا عەقڵییەکانیان..هتد دەرکەوتووە، بە کورتی: بێ

ئاگاییەك هەیە لە رۆڵی "ژینگە" لە رووتكردنەوەی تواناكان و دەرنەخستنیان، تەنانەت بەلای پیاوانیشەوە. ئەم هەڵمەتە لەو گوتەیەی رۆژئاواییەكان دەچێ كە «عەقڵییەتی خۆرهەڵاتییەكان لاوازترە لە عەقڵییەتی ئەوروپییەكان»، لە مەشدا ئەو كاریگەرییە خراپەی ژینگەی رۆژهەڵاتیان لەبیركردووە و چاوپۆشییان كردووە لەو نموونە رۆشنانەی عەقڵی رۆژهەڵاتی كە دەركەوتوون و هەڵاتوون و هەر كاتێكیش هەلیان بۆ هەڵكەوتبێت بایەخی خۆیان سەلماندووە: مەجدی یەعقوب ــ حاڵی حازر لە ئینگلتەرا لە بواری پزیشكیدا ناوێكی دیار و ناسراوە ــ لە كۆمەڵگەكەی خۆیدا هیچ نەبو، پاشان لە بواری نەشتەرگەری دڵدا بووە هەموو شتێك، بێ گۆڕینی هیچ شتێك جگە لە ژینگەكەی كە بەم عەقڵییەتە زۆرداره دەورەدراوە! هەمان شت لەبارەی زانایەكی دیكەوە بڵێ، ئەویش (فاروق ئەلباز)ە كە بۆتە روناكی بەخش لە بواری گەشت بۆ بۆشایی ئاسمان، خۆ ئەگەر لە میسر بمابایەوە كەس گوێی لێ نەدەگرت! ئێمە بە سوێوە پیاوانی بەهرەمەندی خۆمان دەكوژین چ جای ژنان!؟.

ئەوەی كە بگوترێت "عەقڵی ژن" كەمتر لێهاتووترە لە عەقڵی پیاو و مێینە توانای فەلسەفاندنی نییە ــ عەقڵی مرۆیی دەكات بە دوو كەرتەوە، یاخود دەیكات بە دوو جۆری جیاوازی لێك دابڕا، ئەوەش گوتەیەكە پوچییەكەی ئاشكرایە و كتومت لەو كێشەیە دەچێ كە زۆرجار رۆژهەڵاتناسەكان لەبارەی شیاوێتی "عەقڵی عەرەبی" و توانای فەلسەفاندنەوە وروژاندوویانە، نكوڵییان لەوە كردووە كە فەیلەسوفانێكی موسڵمان بوونیان هەبێت: كەندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد...هتد هیچ نین جگە لە كۆپییەكی رووزەردی ئەفلاتوون و ئەرستۆ یان تێكەڵەیەك لەم دووانە، بە هەرحاڵ خۆیان توانای ئافراندن و داهێنانیان نەبووە، هەر بۆیەشە فەلسەفەیەكی تایبەت بە خۆیان نییە!.

مامۆستا عەقاد بۆ لەنێوبردنی ئەم بانگەشانە دەنگی هەڵبڕی[4] و گووتی: «لەو مەرجی بە ناڕەوا تۆمەتباركردنانە، كە لەلایەن زاناكانەوە ستایش ناكرێت ئەوەیە بگوترێت عەقڵی عەرەبی بە هیچ جۆرێك توانای فەلسەفەكاریی نییە»[5]... ئەم بۆچوونە

لەنێو ئەوروپپییەکاندا بێ تاوتوێکردن و مشتومڕ برەوی پێدراوە: چونکە جێی سەرسامی و ڕەزامەندیی خۆ ــ گەورەبینی و هاوکاتیش بەرژەوەندییان بووە. مایەی ڕەزامەندیی خۆ ــ گەورەبینیان بووە چونکە پاساوی کۆلۆنیالیزەکردن و ژێردەستکردنی ڕۆژهەڵاتی داوەتەوە، ڕۆژهەڵاتیش ئەم درۆ و دەلەسەیە ڕەت دەکاتەوە بەوەی کە دەڵێت: «ڕاستییەکەی لەڕووی ریشەی سروشتییەوە جیاوازی نییە لەنێوان عەقڵی گریکی و عەقڵی مرۆیی لە بنەماڵە ڕۆژهەڵاتییەکاندا، بەڵکو بۆچوونی دروست کە لۆژیك و زانست وەکو یەك پەسەندی بکەن ئەوەیە کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەم فەلسەفە، جا نەتەوەکان لە هەرناوچەیەکی زەمین بن، بنەماڵەیان سەر بە ڕەگەزی هەر نەژاد و گەلێك بێ، هەر یەك شتە، خۆ ئەگەر گریکەکان لە شوێنی عەرەبەکان بوونایە بە فەلسەفەکارییەوە سەرقاڵ نەدەبوون، عەرەبەکانیش لەجێی گریکەکان بوونایە ئەوا لە بواری فەلسەفە و توێژینەوەی زانستەکاندا لەوان کەمتر نەدەبوون»[٦]. سروشتی عەقڵی مرۆیی هۆکار نییە بۆ نەفەلسەفەکاریی ڕۆژهەڵاتییەکان بە گشتی، عەرەبەکان بە تایبەتی، ئەی بە بۆچوونی مامۆستا عەقاد هۆکارەکەی چییە؟ ئەو دەڵێت: «ئەم لێکۆڵینەوە (فەلسەفییانە) لای گریکەکان بۆیە ڕێ پێدراو بووە چونکە وڵاتەکەیان لەسەرپێی خۆی وەستاوە و گەشەی کردووە، بە بێ ئەوەی پاشایەکی بەهێز یان کاهینێکی بەهێز تێیدا گەشە بکات، خۆ ئەگەر لای ئەوان دەوڵەتێکی بەهێز، کەهەنووتیەکی بەهێز سەری هەڵبدایە، وەك ئەوەی لە میسر و بابل هەبوون، ئەوا ئەوانیش وەك بابلییەکان و میسرییەکان بایەخیان بە نهێنییە ئایینییەکان و پرسە لاهوتییەکان دەدا»..[٧] .

کورتەی ئەو پرسیارانەی کە مامۆستا عەقاد دەیانوروژێنێت، ئەمانەن:

١- سروشتی عەقڵی مرۆیی لای هەموو ڕەگەز و نەژادەکان یەك جۆرە، عەقڵێکی مرۆیی نییە کە لای گروپێك یان کۆمەڵێك یان تاقمێکی خەڵکی هەبێت و جیاواز بێت لە عەقڵی گروپ و کۆمەڵەکانی دیکە.

٢- بیرۆکەی بوونی فەرق و جیاوازی لەنێوان عەقڵە مرۆییەکاندا هەڵەیە، ئەم بیرۆکەیە ئەوروپییەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان برەویان پێداوە.

٣- هۆکاری سەرەکی لەوەی کە رۆژهەڵاتییەکان خەریکی فەلسەفەکاریی نەبوون رەوشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینییەکە بووە، کە رۆژهەڵاتی پێدا تێپەڕووە، لە هەموویشیان گرنگتر —لە روانگەی عەقادەوە ــ ستەمی فەرمانڕەوا و باڵادەستی پیاوانی ئایین بووە.

٤- دوا بیرۆکە کە دواتر مامۆستا عەقاد دەیوروژێنێت ــ بەرپەرچدانەوەی ئەو گوتەیەی ئەوروپییەکانە کە گوایە رۆژهەڵاتییەکان شتێکی تازەیان لە فەلسەفەدا دانەهێناوە.. هەموو ئەوەی کە موسڵمانەکان کردوویانە باسکردنەوەی فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرستۆ یان ئەم دووانەیە پێکەوە ــ عەقاد لە بەرپەرچدانەوەی ئەم بوختانەدا وای بۆ دەچێ کە توانای عەقڵی تەنیا مانای داهێنانی شتێکی نوێ نییە، بەڵکو "تێگەیشتن" و شرۆڤەکردن و هەرسکردن، نواندنەوەی ئەو فەلسەفەیەشە کە هەیە، ئەمە لە خۆیدا بەڵگەیەکی زەقە لەسەر توانایەکی گەورەی عەقڵی، تەنانەت ئەگەر بڕواشمان بەو ئەرگومێنتە هێنا کە موسوڵمانەکان تەنیا شرۆڤەی فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرستۆیان کردووە، ئەوا ئەمە بەڵگەیە لەسەر بوونی توانای عەقڵییان.

ئەم چوار خاڵە بە تەواوی لەسەر پرسی نا ــ فەلسەفەکاریی ژنانیش لە مێژوودا دەچەسپن، یاخود گەر ئێمە "ژنە فەیلەسووف" نابینین یاخود مێژووی فەلسەفە تەنیا مێژووی فەیلەسووفانی پیاوە، ئەوا نابێت بگوترێت هۆکارەکەی ئەوەیە عەقڵی مێینە جیاوازە لە عەقڵی نێرینە، کە عەقڵی نێرینە بە سروشتی خۆی باڵاتر و بەرزتر و زیرەکتر و بلیمەتتر و...هتد، ئەوە بیرۆکەیەکە پیاوان برەویان پێداوە چونکە دەبێتە مایەی رەزامەندی خۆگەورەبینییان و، ەدیهێنەری بەرژەوەندییان، هەڵبەت —بەرژەوەندییان لەوەدایە ژن لە ئاستێکی نزمدا بهێڵنەوە بۆ ئەوەی هەر خەریکی خزمەتکردنیان بن، کاتی پێویستییان پێ بدەن تاکو مومارەسەی ژیانیان بکەن و لە غەمی ئەو ئامانجەدا بن کە خۆیان پێیان وایە ئامانجی باڵایە..هتد. لەبەرئەوە دەبینین بە توندی داکۆکی لە

هێشتنەوەی ڕەوشی نزمی ژن دەکەن و لەوەش خراپتر بڕوا بە ڕەسانەیەتی ئەم بیرۆکەیە دێنن و تیۆریزەی دەکەن و وەك "ئەستۆ" کردی دەیکەنە فەلسەفەیەکی تەواو. مەترسییەکەش هەر لێرەدایە! تۆ دەبینیت گەورە فەیلەسووفەکان بە تەواوی نەوەی سەردەمەکەی خۆیان بوون، دەبینیت داب و نەریتەکانی سەردەمەکەی خۆیان دەرهەق بە ژن لە بۆچوونە ئەبستراکتەکاندا پوختە کردۆتەوە و تیۆرگەلێکی فەلسەفییان پێشکەش کردووین کە گەشە بە کینەیەکی لەمێژینە بەرامبەر بە ژنان دەدات، ئەمە لەکاتێکدا دەبینیت لە بوارەکانی تردا ئەم فەیلەسووفە پیاوانە "شۆڕشگێر" بوون.

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو ژینگەیەی کە ژن بە درێژایی مێژوو تێیدا ژیاوە و ئەو کارکرد و ڕەوشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی و ئابوورییانەی دروستیان کردووە بۆتە هۆی ڕێگریکردنی ژن لە فەلسەفەکاریی، نەك بە هۆی "نوقسانی" یان "شێواوی" لە توانا عەقڵییەکانیدا! ئەو ڕەوشەی کە ژنی پێدا تێپەڕیوە وایکردووە کە پیاوان توانای بەکۆیلەکردنیانیان هەبێت و لە سووچێکی دوورەدەستی ماڵدا گیریان بدەن و دەستەواژەی "حەریم"ی بەسەردا ببڕن، کاتێکیش پیاو لە مێژوودا ملکەچی ستەمکارەکان بوون فەلسەفەکارییان لێ قەدەغە کراوە، وەکو ئەوەی "نیرۆن"ی ئیمپراتۆری ڕۆمانی و ئەوانی تر کردیان، ئا لەوێدا فەلسەفە تەنانەت لای پیاوانیش پاشەکشەی کردووە و بزر بووە، مانای وایە ئەگەر پیاوانیش لەجێگای ژنان بوونایە و بە هەمان ڕەوشدا تێپەڕ ببوونایە لەڕووی عەقڵییەوە نزمتر و کەم عەقڵتر دەبوون، یاخود نەیاندەتوانی فەلسەفەکاریی بکەن.

دوا خاڵ لە گوتەکانی "عەقاد"دا و لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کە تەنیا "تێگەیشتن لە فەلسەفە" بەڵگەیە لەسەر بوونی توانایەکی پێشکەوتووی عەقڵی. مانای ئەمەش ئەوەیە ئەگەر ئێمە لە ژناندا نموونەگەلێکمان بەرچاوکەوت توانای تێگەیشتن لە فەلسەفە و تاوتوێکردنی بابەتەکانی و بۆچوونیان لەبارەی پرسەکانییەوە هەبێت، ئەوا ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر توانا عەقڵییەکانیان، تەنانەت ئەگەر بۆخۆیشیان فەلسەفەیەکی سەربەخۆیان دانەهێنابێت!.

راستییەکەی وێڕای ملکەچی لە مێژینەی ژن بۆ پیاو، بەکۆیلەکردنیان و دوورخستنەوەیان لە ژیانی گشتی و کەمکردنەوەی هەلی فێربوون لە بەردەمیاندا، بەڵکو هەل پێنەدانیان بە هیچ کلۆجێك بۆ بەشداریکردن لە کولتووری سەردەمدا ــ وێڕای هەموو ئەوانە دەتوانیت لێرەو لەویێ ژنگەلێکی درەوشاوە بدۆزیتەوە کە هەر لە بەرەبەیانی فەلسەفەوە رۆڵیان هەبووە لە "گەڕان بەدوای حیکمەتدا". راستە ئەوە رۆڵێکی بەشەکی و کەم بووە، بەڵام هەرچۆنێك بێ توانای ژنان دەسەلمێنێت لە گێڕانی رۆڵی گەورەتردا ئەگەر بێتوو هەلیان بۆ بڕەخسێت و ئەو ژینگە بەرتەسکەی کە کار لەسەر چەپاندنی تواناکانیان دەکات و لە دەرکەوتنیان رێگری دەکات، بگۆڕێت.

لەم کتێبەدا کۆمەڵێك گوزارە دێنە رێمان کە دەگەڕێنەوە بۆ فەیلەسووفانێکی ژن لە جیهانی کۆندا ــ بە تایبەت بەر لە سەرهەڵدانی مەسیحییەت ــ ئەگەرچی گوزارەگەلێکی کەم و سادەن، یان تۆ بڵێ: لێرەو لەویێ کۆمەڵێك فراگمێنتی پەرش و بڵاون، بەڵام گوزارشتن لە هزر و بۆچوون و هەڵوێست، ئینجا جۆرێکن لە فەلسەفاندن و خوێنەر ناتوانێت دژکار بنوێنێت بەوەی کە تەنیا "گوزارە"ی کەم و سادەن، چونکە فەلسەفە لە سەرەتاکانییەوە هەر بەم جۆرە بووە: لە تالیسی یەکەم فەیلەسووف هیچ نەزانراوە جگە لەوەی کە گوتویەتی «ئاو سەرچاوەی هەموو شتەکان» و «جیهان پڕییەتی لە خواکان»، ئەوانی تریش گوتوویانە بنەمای شتەکان هەوا، یان ئاگر، یان خاك، یان هەر چوار رەگەزەکەیە. ئەمانە هەموو کۆمەڵێك گوزارەی کەم و سادەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە فەیلەسووف بوون و هەندێ کات خاوەنی رێبازە فەلسەفییە "سروشتییەکان" و هەندێ کاتیش "میتافیزیکییەکان" و هەندێ کاتێ تریش "ئەخلاقییەکان" بوون.

وەك چۆن دەبینیت فەیلەسووفە پیاوەکان کتێبگەلێکیان هەبووە بەڵام فەوتاوە، جگە لە چەند پەرەگرافێك هیچیان لێ نەماوەتەوە، کتومت ئاوها فەیلەسووفە ژنەکانیش کتێبەکانیان نەماونەتەوە، بۆ نموونە کتێبەکانی "ئیزارا Aesara" جگە لە

چەند فراگمێنتێکی کەم لە کتێبی "لەبارەی سروشتی مرۆییەوە Om Human Nature" نەبێت ئیدی شتێکی دی نەماوەتەوە، وەك دواتر دەبینین.

هەروەها وەك چۆن فەلسەفەی رۆژئاوایی لە سەدەی شەشەمی پێش زایین، لە یۆنانەوە —بە قوتابخانەی ئەیۆنی (تالیس و قوتابخانەکەی) — دەستی پێکرد، هەر بەو جۆرە مێژووی ژنە فەیلەسووفەکانیش لە سەدەی شەشەمی بەر لە زایین لە قوتابخانەی فیساگۆرییەوە دەست پێدەکات (فیساگۆرس لە دوورگەی سامۆس Samos لە دەریای ئیجە بەرامبەر شاری مالّتە لەدایك بووە). ژنی فیساگۆری هەلێکی گرنگی لە بەردەمدابووە کە وای لێکردووە بتوانێت بخوێنێتەوە و بنووسێت، بەر لە هەموو شتێکیش توانی بیربکاتەوە و مشتومڕ بکات و عەقڵی بخاتەگەڕ و بە یەکسانی لەگەڵ پیاودا لەسەر پێیەکانی وەستا. بڕوای باو لای "کۆمەڵی فیساگۆرییەکان" ئەوەبوو کە وێڕای ئەوەی سروشتی ژن جیاوازە لە هی پیاو، وەلێ ئەوە هیچ شتێکی لێ کەم ناکاتەوە، نە لەڕووی توانایەوە و نە لەڕووی بەهایەوە.

لێرەدا ژنە فیساگۆرییەکان رۆشنبیر بوون و بواری بایەخدانێکی هزری و ئەدەبی دیاریان هەبوو، لەسەروبەندی دامەزراندنی یەکەم قوتابخانەی فیساگۆریدا ژیاون، لە هەموویشیان بەناوبانگتر سیانۆ Theanoی هاوسەری فیساگۆرس Pythagoras بوو. ئەو لەگەڵ هەر سێ کچەکەیدا: ئەریگنۆت Arignote و مییا Myia و دامو Damo ـدا سەرپەرشتی قوتابخانەی فیساگۆریان کرد و دوای مردنی فیساگۆرسی دامەزرێنەری قوتابخانەکە، ئەوان بەڕێوەیان دەبرد[٨].

هەندێك لە دێڕەکانی سەرەتای ئەو فراگمێنتانەی کە ماونەتەوە ئەوە ئەهێنن بە بیردا —یەکەم ژنە فەیلەسووفەکان لە مێژوودا — تەنیا لە بارەی ئابووریی ماڵ و ماڵدارییەوە نووسیویانە، یاخود ئەو بابەتانەی کە لەبارەیانەوە دوواون لە دەوری چاودێریکردن و پەروەردەکردنی منداڵ، رۆڵی ژن لە ماڵ و کۆمەڵگەدا..هتد دەسوڕێتەوە، بەڵام خوێندنەوەیەکی رەخنەیی و هەنووکەیی بۆ ئەو فراگمێنتانە وا لە خوێنەر دەکەن بگاتە ئەنجامێکی جیاواز: ئەو ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییانە چەمکی

"هارمۆنیا Harmony ــ گونجاویی و تەبایی"ـان شیکردۆتەوە لە هەوڵیاندا بۆ دەرخستنی ئەو رێگەیەی کە دەکرێت بە هۆیەوە ئەم چەمکە بەسەر بونیاد و بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، بەسەر بونیاد و هەڵسوڕاندنی خێزاندا، وەك ئەوەی بەراورد بە دەوڵەت جیهانێکی چکۆلەیە، پراکتیزە بکرێت.

خۆ ئەگەر فەیلەسوفە فیساگۆرییە پیاوەکان هەوڵی خۆیان لە راڤەکردنی جیهانی گەورە Macroscomsm ـدا بە پێی راڤەیەکی بیرکارییانە چڕ کردبێتەوە، کە پێکهاتەکەی بکاتە "ژمارە و تەبایی"، ئەوا فەیلەسووفە فیساگۆرییە ژنەکان هەوڵی خۆیان لە جیهانی چکۆلە microscosm ـدا چڕ کردەوە، واتە: لەسەر ئەو فەلسەفەیەی کە بە مانای فراوانی وشەکە لە یەك کاتدا خێزان و دەوڵەتیش دەگرێتەوە، ئەوان مشتومڕی ئەوەیان کردووە کە ژن چۆن دەتوانێ "پرەنسیپی هارمۆنیا" (گونجاوی، تەبایی) لەسەر پێگەیاندنی منداڵ پراکتیزە بکات، تا لە قۆناغی پێگەیشتندا بووبێتە کەسێکی بە ویژدانی خاوەن فەزیلەت، کەسێکی کۆك. هەروەها لەو رێگەیەشیان کۆڵیوەتەوە کە ژن بەهۆیەوە دەتوانێت ئەم پرەنسیپە لە بوارەکانی تریشدا و لە کایە هەمەجۆرەکانی ژیانی رۆژانەیدا جێ بە جێ بکات، ئەوەش هیچ پەیوەندییەکی بە ئابووریی ماڵ و ماڵدارییەوە نییە، وەك ئەوەی هەندێك لەو پیاوانەی دەیانەوێت لە رۆڵی ژنان لە فەلسەفەی فیساگۆریدا کەم بکەنەوە باسیان لێوە کردووە، بگرە ئەوە توێژینەوە و پراکتیزەکردنی تیۆرێکی ئاکاریی بووە لای فیساگۆرییەکان، لەگەڵ تەواوکردنیدا بە لایەنەکانی دەروونناسیی گەشەی ئاکاریی، ئەمە وێڕای تیۆری پەیوەستی خێزانی و بابەتە زۆر و زەوەندەکانی تر.

ژنە فیساگۆریەکان لە قوتابخانەی یەکەمی فیساگۆری و قوتابخانەی فیساگۆرییەکانی پاشین (المتأخرە)ـدا، لە جیهانی کۆندا تاکە ژنانێکی فەیلەسووف نەبوون، بەڵکو زۆرێکی تریش هەن، ئەوەتا جیل میناج Gilles Menage (١٦١٢ ــ ١٦٩٢) –کە لە سەدەی حەڤدەدا پارێزەرێکی رۆشنبیر و توێژەرێکی بواری زمان و کلاسیکیات بوو ــ توێژینەوەیەکی لەبارەی ژنە فەیلەسووفەکان لە جیهانی کۆندا

ئەنجامداوە، گەیشتووە بەو دەرەنجامەی کە شەست و پێنج ژنە فەیلەسووفی بینیوەتەوە و ئەم دۆزینەوەیەشی لە کتێبێکدا بە ناوی "مێژووی فەلسەفە" تۆمارکردووە و ساڵی ١٦٩٠ و پاشانیش ١٦٩٢ز بڵاو کراوەتەوە[٩]. کتێبەکەش لە سەردەمی ئەودا و لە سەردەمی ئێمەشدا گرنگییەکی لەڕادەبەدەری هەیە، چونکە بەشدارییەکی زووکات (مبکر) پێکدێنێت لە لایەنێکی فەرامۆشکراوی مێژووی فەلسەفە و مێژووی عەقڵی ژندا بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەش بووە خاڵی دەستپێکی کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی نوێ لەم بابەتەدا[١٠].

ئێمە بە تەمای ئەوە نین هەر ئەو شەست و پێنج ژنە فەیلەسووفەی "میناج" لە کتێبەکەیدا لێی کۆڵیونەتەوە باس بکەین. گرنگ ئەوە نییە "ژماردن"ـێکی گشتگیری هەموو "ژنە فەیلەسووفەکان" بە درێژایی مێژوو، بکەین، بەڵکو ئەمانەوێت نموونەگەلێکیان لێ بخەینەڕوو بۆئەوەی ئەو بیرۆکە باوە ساویلکانەیەی پێ تێك بشکێنین کە لە تواناکانی ژنان دێنێتە خوارەوە، ئەمەش بە ئامانجی ئەوەی کە ژنی عەرەبی دووبارەی متمانە بە خۆی بکاتەوە و بە پاڵ پیاوانەوە کار بکات بۆ سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگەکەمان، کە بێگومان بەلای منەوە پاشەکشەیەك لە جیهانی ژناندا روویداوە[١١] لە بەرەنجامی ئەو داخرانە هزرییەی کە لە سەردەمی شۆڕشی میسرییەوە روویداوە.

بۆ نموونە ئێمە لەبارەی ئەو ژنەوە قسە ناکەین کە دیۆجین لائیرتی پێی وایە: یەکەم ژن بووە (ناوی کلیۆبولینا Cleobulina بووە، دەوروبەری ٦٠٠ پ. ز) کە دەکرێت لە کۆنتێکستی هەوڵەکانی فەلسەفەی یۆنانیدا باس بکرێت. هەر ئەویش بووە هەندێك مەتەڵێ فەلسەفی داناوە، رێیشی تێ دەچێ دایکی تالیس بووبێت کە هەمووان بە باوکی فەسەفەی کۆسمۆلۆژیی سەدەی شەشەمی پێشی زایینی دادەنێن.

دیۆجین وا باس لە کلیۆبولینا دەکات کە "خۆڕاگرترین ژن"[١٢] بووە، میناجیش لەوەوە ئەم زانیارییانەی گواستۆتەوە، ئەگەرچی ئەوەش زیاد دەکات کە لای (پلوتارك)ـیش لە کتێبی "خوانی حەوت فەرمانڕەواکە"دا بوونی هەیە. هەروەها نە

باسی هیپۆ Hippoـی کچی خیرۆنی دانا دەکەین[13] و نە "میرۆ Myro" کە فەرهەنگەکەی سویداس ناوی "ژنە فەلەسووفی رووس"ی لێناوە...هتد[14]، نە باسی دەیانی تریش دەکەین، بەڵکو تەنیا ئەو کەسانەی کە زۆرتر گرنگییان هەبووە پیشان دەدەین.

لەبەرئەوەی قوتابخانەی فیساگۆری بواری رەخساندوە بۆ فێربوونی ژن و بەشداریکردنی لە ژیانی عەقڵی و پرسە فەلسەفییەکاندا، ئەوا بەشی یەکەمی ئەم کتێبە تەرخان دەکرێت بۆ ئەم قوتابخانەیە: دامەزراندنی، بونیادی، رێساکانی..هتد، بۆئەوەی لە بەشی دووەمدا لە هەندێ ژنی زووکاتی فیساگۆری بکۆڵینەوە، ئەمە لە کاتێکدا بەشی سێیەم تەرخانە بۆ "ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکانی پاشین". هەرچی بەشی چوارەمە دەربارەی ژنێکە کە ئەفلاتوون یەك گفتوگۆی تەواوی بۆ تەرخان کردووە ــ ئەم ژنەیش ئیسپازیایە، مامۆستای رەوانبێژی "کە سوکرات بۆتە مەراقی، دانی بەوەدا ناوە ئەو بووە گوتاری جەنازەیی بۆ پێرکلیس، کە لە یادی شەهیدانی ئەسینا لە جەنگ لەگەڵ ئیسپارتە پێشکەشی کردووە، داناوە.. لە بەشی پێنجەمدا دەپەرژێینە سەر "دایۆتیما.. مامۆستای سوکرات" و باس لە تیۆرەکەی لەبارەی خۆشەویستی و نەمریی روح، وەك ئەوەی ئەفلاتوون لە دایلۆگی "خوان"ـدا باسی دەکات، مشتومڕ لەبارەی کەسایەتی مێژوویی ئەم ژنەوە دەکەین.

لە بەشی شەشەمدا باس لە "جولیادونا.. یان جولیانای ژنە فەیلەسووف" و بەدەمەوەبوونی فەیلەسووفان و زانایانی بواری بیرکاری و پزیشکی، لەونەیش ئەلیکسەندەر ئەفرۆدیس و گالینۆسی پزیشك و فلوستراتوسی فیساگۆری، دەکەین. لە کاتێکدا بەشی حەوتەم تایبەتە بە "ماکرینا.. ژنە قەدیسی زاهید". بەشی هەشتەم و کۆتاییش تەرخانە بۆ ژنە فەیلەسووفێکی میسری کە ناوبانگی بە جیهانی کۆندا بڵاوبۆتەوە، ئەویش "هیپاشیا.. ژنە فەیلەسووفی ئەسکەندەری"ـیە.

خۆ ئەگەر خوێنەر وا هەست بکات دەقەکانی ژنە فەیلەسووفەکانی جیهانی کۆن کەمن، ئەوا دەبێت لای روون بێت کە لای پیاوانیش لە فەلسەفەی کۆندا هەمان دۆخە،

خۆ سوكرات خۆی یەك پیتی نەنووسیوە، بەڵكو ئێمە بەتایبەتی لەڕێگەی قوتابییەكەیەوە "ئەفلاتوون" بە بیروبۆچوونەكانی ئاشنا بووین. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە كە بە درێژایی مێژوو هیچ كتێبێكی فەیلەسووفە ژنەكان نادۆزینەوە، هەر كات هەل بە ژن بدرێت بەرهەمێكی فەلسەفی نەمر دەنوسێت و لە دوای خۆی بەجێی دێڵێت: وەك ئەوەی بۆ نموونە لای ژنە فەیلەسووفی ئینگلیزی سوزان ستیبنج Susan Stebbinge (١٨٦٥ ــ ١٩٤٣) زانای لۆژیك، یاخود لای ژنە فەیلەسووفی ئەمریكی بواری ئیستاتیكا و زانای لۆژیك سوزان لانجە Susan Langer (١٨٩٥ ــ ١٩٨٥)، یان ژنە فەیلەسووفی فەرەنسیی بونگەرا سیمۆن دی بوڤوار Simone de Beavoir (١٩٠٨ ــ ١٩٨٦) كە لە بارەی "ڕەگەزی دووەم" و لەبارەی "ئاكار" و لەبارەی "پیرێتی"ــیەوە نووسیویەتی، ئەوە جگە لە رۆمان ــ یش تەواو وەك ئەوەی سارتەر كردی، دەیبینینەوە. لە ئەڵمانیاش هانا ئارێنت Hanna Arendt (١٩٠٦ ــ ١٩٧٥) فەیلەسووفی بە رەگەز ئەڵمانی، كە بەهۆی نازییەكانەوە بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هەڵات، بووە تیۆرسێنێكی سیاسی، لەبارەی "بنچینەكانی تۆتالیتاریزم" و "لەبارەی شۆڕشەوە" و "لەبارەی توندوتیژییەوە" و "لەبارەی ئازادییەوە" و "لەبارەی ژیانی عەقڵەوە" نووسیویەتی، دەیانی تریش.

من لەم كتێبەدا هیوام بەوەیە كە خوێنەر چاو بخشێنێتەوە بەو بۆچوونە ساویلكانەیەدا كە لە كۆمەڵگەكەماندا لەبارەی ژنەوە باوە، هەروەك ئاواتەخوازم شتێكم پێشكەش كردبێ كە كۆمەك بە ژنی عەرەبی بكات لە بێداربوونەوەی و سەرلەنوێ هەستانەوەی، تا لە بەخشینەكەی پێش شۆڕش (شۆڕشی میسر. و.) بەردەوام بێت.

داوا لە خوا دەكەین هەموومان ڕێنمونی بكات بۆ ڕێی ڕاست

ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام

كوەیت ــ یەنایەری ١٩٩٦

# بەشی یەکەم

## یەکەم: "فیساگۆرس و.. قوتابخانەکەی"

ئەرکی مرۆڤە بە بێ سوێند راستگۆ بێت.
فیساگۆرس

## یەکەم: کورتەیەك دەربارەی فیساگۆرس

کاتێك قوتابخانەی فیساگۆرس یەکەم قوتابخانەیە کە بواری بۆ ژن رەخساندووە تا بچێتە نێوییەوە، وەك چۆن لە دواتریش یەکەم قوتابخانە بوو کە ژن تێیدا ناوبانگی پەیدا کرد و "ژنە فەیلەسووفەکان"ی تێدا دەرکەوتن، ئەوا لەسەرمان پێویستە بەشی یەکەم بۆ ناسینی فیساگۆرس و تاقمی فیساگۆرییەکان، سیستەمیان و فەلسەفەیان..هتد، تەرخان بکەین.

دیۆجین لایرتی Diogenes Laertius بە گواستنەوە لە ئەستیوسی قۆرینائیەوە، لە کتێبی "پزیشکەکان"ـدا دەڵێت: «فیساگۆرس ناوی کەوتە نێو ناوان چونکە وەك کەسێکی بێ بەری لە هەڵە "حەقی دەگوت"، هەر وەك ئەوەی عەرافەکەی دلفی بەناوی Pythian دەیکرد»[١٥]، ویل دیۆرانتیش لەبارەی واتای ئەمەوە دەڵێت: « وشەی فیساگۆرس واتە "قسەکەری فیسی" بە زمانێك کە لە دلفییەوە سروشی دەهێنایە خواریّ، زۆرێکیش لە شوێنکەوتووانی لەبارەیەوە دەڵێن ئەو خودی ئەپۆلۆیە»[١٦]. زۆرێك وای بۆچوون کە ئەو کوڕی هاونیشتمانییەکی خاوەن پێگەیەکی بەرز بووە، ئەویش منیسارخوس Mnesarchos ـە، ئەمە لە کاتێکدا ئەوانی تر پێیان وابووە ئەو کوڕی ئەپۆلۆی خواوەندە. وەك راسڵ دەڵێ با خوێنەر خۆی سەرپشك بێ لە هەڵبژاردنی ئەم دوو ئەلتەرناتیڤە[١٧]. گێڕانەوە جۆراو جۆرەکانیش دەڵێن ئەو لە دوورگەی سامۆس Samos لە دەریای ئیجە بەرامبەر شاری مالّتە لەدایك بووە و لە دەروروبەری ساڵی ٥٣٢ پ.ز پێگەیشت، ئەم گێڕانەوانە وا باسی دەکەن کە فیساگۆرس سی ساڵی رەبەقی لە گەشت و گەڕاندا بەسەر بردووە. هیراکلیتس لەبارەیەوە دەڵێ: «فیساگۆرس لێکۆڵەرێکی زۆر کۆڵنەدەربوو»[١٨].. وا دەردەکەوێت لێرەدا هیراکلیتس ئاماژە بە گەشتە زۆر و زەوەندەکانی دەکات. ئەوەش لەبەرئەوەی ئەو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پۆلیکراتس Polycrates ـی ستەمکاری سامۆسدا لەدایك بووە، لەبەر ئەم هۆکارە بۆ هەڵاتن لە ستەمکاری لە نیشتمانەکەی خۆی کۆچی کردووە، یەکەمجاریش چووە ماڵتە و چاوی بە "تالیس" و

"ئەنەکسیمەندەر" کەوت و زانستیان لێوە فێر بوو. دواتریش چووە سیرۆس Syors —یەکێکی تر لە دوورگەکانی دەریای ئیجە ــ بۆئەوەی لە فیریکیدس Pherekydes ــی فەیلەسووفەوە فێر ببێت. لەم سێ مامۆستایەوە فیساگۆرس یەکەم بێداربوونەوەی زانستی و عەقڵی خۆی ئەزموونکرد، ئەو کاتەیش کە لە ئاوی حیکمەتیانی خواردەوە گەنجێکی کەم تەمەن بوو[19]! دیۆجین لایرتی ئەوە دەگێڕێتەوە کە «فیریکیدسی فەیلەسووف کاتێك فیساگۆرس چوو بۆ لای لە دوورگەی دیلۆس (نەك لە سیرۆس) دەژیا، هەر لەم رووەوە دەڵێ فیساگۆرس قوتابییەکی فیریکیدسی دانای دیلۆسDelos بوو»[20] و واش پێدەچێ فیساگۆرس چووە بۆ دوورگەی دیلۆس بە سیفەتی ئەوەی ئەوێ شوێنی پیرۆزی لەدایکبوونی ئەپۆلۆی خواوەندە بووە[21]، ڕەنگە ئەمە هۆکای ئەوە بوویێت کە ئەم خواوەندە بۆتە ڕەمزیی باڵای هزری ئایینی فیساگۆرس، وەك چۆن ئەم دوورگەیە سەنتەری رۆشنبیریی ئایینی ئەیۆنیا بووە[22].

پاشان سەردانی فینیقیای کرد، لەوێشەوە رووی کردە میسر و وەك ئەوەی یامبلیخۆس Lamblichus دەیگێڕێتەوە دوازدە ساڵ تێیدا نیشتەجێ بوو[23]، لەمیسر کەهەنەی هیلیۆپۆلیس قەبووڵی نەکرد تا ببێتە قوتابی و زانستییان لێوە فێر ببێت. هەروەها کەهەنەی "مەمفیس"یش رەتیان کردەوە و بگرە قەبووڵیان نەبوو کە پێشوازی لە "بەربەرییەك" بکەن[24] تا بێتە نێو قوتابییەکانیانەوە و نهێنییەکانیان فێر ببێت، بۆیە ئامۆژگارییان کرد کە بەرەو باکور بڕوات. بەم جۆرە فیساگۆرس هەر لەنێو شارە میسرییەکاندا لە هاتوچۆدا بوو تا ئەوەی —وەك فرفۆریۆس دەیگێڕێتەوە ــ لە ساڵی ٥٣٥ پ.ز کەهەنە رازی بوو بەوەی ببێتە قوتابی بەڵام بە مەرجێك کە هەندێك تاقیکردنەوەی بکرێت، ئەگەرچی ئێمە شتێك لەبارەی سروشتی ئەم تاقیکردنەوانەوە نازانین جگە لەوەی کە «ڕێگاگالێکی سەیر بوون وەك ڕێگا هیلینییەکان»، ئەویش لە دواتردا لە قوتابخانەکەی خۆیدا هاوشێوەی ئەم تاقیکردنەوانەی ئەنجام دەدا، دەبوو فیساگۆرس قژی بتراشێت تا ڕێگەی پێ بدرێت بچێتە نێو پەرستگە میسرییەکانەوە، هەروەها دەبوو پەیڕەوی لە حەرامکراوەکانی

میسر بکات، بۆ نموونە لای میسرییەکان ژمارەیەك ئاژەڵ و باڵندەی پیرۆز هەبوون، جا سەربڕین و خواردنیان قەدەغە بوو، هەروەها کەهەنە میسریەکان ڕێگرییان لە خۆیان دەکرد لە خواردنی بیبەر چ بە کاڵی و چ بە کوڵاوی (چونکە بە نارِەحەت هەرس دەبوو!) لەوانەیە لێرەدا شتێکمان لەبارەی بنچینەی حەرامکراوە بە ناوبانگەکانی فیساگۆرسەوە گوتبێت[٢٥]، زیاد لەوەش بێدەنگی و نهێنیکاری لە خەسڵەتەکانی کەهەنەی میسری بوون[٢٦].

فرفۆریۆس ئەوە دەگێڕێتەوە کە فیساگۆرس تا ئەو رادەیە فێری زمانی کۆنی میسریی بوو کە توانای هەبوو کتێبە پیرۆزەکانیان بخوێنێتەوە، بەشداریش بوو لەو نهێنی و ریتواڵانەدا کە لە پەرستگە میسریەکاندا ئەنجام دەدران.

وا پێدەچێ فیساگۆرس لەسەر دەستی کەهەنە مەجوسییەکانیش لە وڵاتی فارس زۆر شت فێر بووبێت، بەتایبەتیش پاکبوونەوە لە گوناهەکانی ژیانی پێشتر، و ئەو ڕێگەیەی کە کەسی حەکیم بەهۆیەوە بە پاکی و بێ گەردی دەمێنێتەوە، وەك چۆن گوێبیستی کۆمەڵە وانەیەك بوو لەبارەی سروشتەوە کە دەستپێشخەری میتافیزیکییانەی گەردوونی دەردەخست.

هەروەها زۆر شت لەبارەی خراپەوە فێر بوو، ئەوەش فێر بوو کە خراپەی رەها بوونی نییە، بەڵکو ئەویش بە جۆرێك لەجۆرەکان چاکەیە: چونکە هارمۆنیایەکی ستاتیکی دروست دەکات. خۆ ئەگەر خراپە لە گەردووندا مایەی بێزارییە، کەوایە هەر ئەویشە هۆکاری پیسبوون و نەخۆشخستنی دەروون. هەروەها فیساگۆرس سەردانی "بورجەکانی بێدەنگی"ی زەردەشتایەتی کرد و لە ماناکانیان ورد بوویەوە[٢٧].

## دووەم: دروستکردنی قوتابخانەکە

ژیاننامەی کەسایەتییە مێژینەکان بۆمان ناگێڕنەوە کە فیساگۆرس چۆن لە دیلێتی فارس ئازاد بووە، ئەوەتا "یامبلیخۆس" دەڵێت: «ئەو دەستبەسەرێك بوو

نەك كۆیلە، یان زیندانییەكی جەنگ (واتە كۆیلەیەكی كاتی) بوو كە دەتوانرا دیلییەكەی هەڵبوەشێنرێتەوە، لە هەركاتێكا بێت ئازادیی خۆی بكڕێتەوە. ڕەنگە فیساگۆرس ئەمەی كردبێت. یاخود ڕەنگە كاریگەرییەكی كاریزمایی Charisma كردبێت. وا پێدەچێ ئەم ڕاڤەی دواییان زاتر جێی پەسەندی بووبێت[٢٨].

فیساگۆرس گەڕایەوە بۆ دوورگەی سامۆس —هەڵبەت بە جیاوازی مێژوونووسەكان لەبارەی مێژووی گەڕانەوەی، بەڵام كۆكن لەسەر ئەوەی گەڕانەوەكەی لە نێوان ساڵانی **٥٢٩** پ.ز و **٥٢١** پ.ز بووە، لەو كاتەیشدا تەمەنی **چل** ساڵان بووە (هەندێكی تر وای دەگێڕنەوە كە تەمەنی پەنجا ساڵ یان پەنجا و شەش ساڵ بووە!)[٢٩] ـــ زۆری نەبرد سامۆسی بەجێهێشت و بەرەو دیلۆس و كریت ملی نا، دواجار لە كرۆتۆن Croton لە باشووری ئیتالیا جێی بەخۆی گرت و هەر لەوێش قوتابخانەكەی كردەوە[٣٠].

سەرەڕای ئەوەی ئەفلاتوون دەیویست شارێكی ئایدیال دروست بكات كە كەسانێكی فەرمانڕەوا لە پیاو و ژن لە خۆیدا كۆ بكاتەوە، بەڵام ئەوە وەدی نەهات، وێڕای هەوڵە بەرودواكانی هەرگیز نەهاتە بوون. خۆ سێ سەركێشییەكەی كە لەپێناو هێنانەدی ئەم خەونەدا لای دیۆنیسۆسی باوك و ئینجا دیۆنیسۆسی كوڕ، ستەمكاری سیراقۆستەی ئەنجامیدا[٣١] سەری نەگرت و ئەكادیمیای ئەفلاتوونیش تەنیا قوتابیگەلێكی تایبەتی لەخۆدا جێ كردبوویەوە. ئینجا دواتر ئەفلۆتین (٢٠٤ ـــ ٢٧٠ ز) لەسەردەمی گالینۆس Gallienus ی ئیمپراتۆری ڕۆمانیدا (ئیمپراتۆری ڕۆما لە ٢٥٣ ـــ ٢٦٨ ز) هەوڵیدا شارێكی فیساگۆری بۆ فەیلەسووفەكان دروست بكات، بەڵام حكومەتی ڕۆمانی بەرهەڵستی وەدیهێنانی ئەم خەونەی كرد، وەك چۆن ئەنجومەنی پیرانی كۆنەپارێز ئەم بیرۆكەیەی ڕەت كردەوە، ئیدی ئەفلۆتینیش وازی لەوە هێنا كە قوتابخانەیەك دابمەزرێنێت ژنانیش لەخۆ بگرێت.

لێرەدا ئەو قوتابخانەیەی كە فیساگۆرس لە كرۆتۆن لە باشووری ئیتالیا دایمەزراند یەكەم قوتابخانەیە پێشوازی لە ژنان كردووە و فێری كردوون، لەگەڵ ئەوەی دانی ناوە

بە جیاوازی تایبەت لەنێوان ئەو دوو رەگەزەدا، بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازییە سروشتییەکانی نێوانیان، لێرەوە ژن فێری فەلسەفە و ئەدەب دەکرا، وەك چۆن فێری بەڕێوەبردنی ماڵ و دایکایەتی دەکرا، تا ئەوەی ژنی فیساگۆری لە زەمانی کۆندا وەك باشترین ژنانی گریك ناوبانگیان رۆیشت، کاتێکیش ئەم قوتابخانەیە وەکو یەك پیاوان و ژنانی هەموو چینەکانی لە خۆ گرتبێت ــ کەوایە لەبەر ئەم هۆکارە لە کۆمەڵگەیەکی ئایدیالی چووە[٣٢].

قوتابخانەی فیساگۆرییەکان سیستەمێکی برایەتیان هەبوو، وەك ئەوەی دێر یان پەرستەگەیەك بێت، سەرجەم قوتابییەکان یەك پۆش بوون ئەویش بەرگێکی سپی بوو، بە یەك جۆریش دەژیان ئەویش ژیانی زوهد و تەقەشوف و سادەیی بوو، —زۆربەی وەختەکانیش ــ پێڵاویان لەپێ نەدەکرد بەڵکو بە پێی پەتی دەهاتن و دەچوون، کە لەدواتردا ئەمە کاری لە سوکراتیش کرد و وەکو ئەوەی لە دایلۆگی "فایدون"ــەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆر لەژێر کاریگەری پێڕۆکانی فیساگۆرییەکاندا بووە، زۆر خواکانیان تێکەڵ بە گفتار و کردەی رۆژانە نەدەکرد «چونکە ئەرکی مرۆڤە بە بێ سوێند راستگۆ بێت»، هەروەها لە کۆتایی رۆژدا لێپرسینەوەیان لە دەروونی خۆیان دەکرد دەربارەی ئەوەی بە درێژایی رۆژ ئەنجامیان داوە، هەر یەکێکیان لەبارەی ئەو خراپەیەی کە کردوویەتی، ئەو چاکەیەی کە ئەنجامی داوە، ئەو ئەرکەی کە پشتگوێی خستووە، پرسیاری لەخۆی دەکرد.

فێربوون بە نووسین نەبوو، بەڵکو: گوێگرتن و وتنەوە و فێربوونی زارەکی بوو لە مامۆستاوە بۆ قوتابییەکان، شتێکیش لە فیساگۆرس جێنەماوە کە بیسەلمێنێت کتێبێکی نوسیووە. فێربوونەکانی قوتابخانە نهێنی بوون و هەرکەسێکیش بیدرکاندنایە بە دەرکردن سزا دەدرا، بۆیە ئەندامەکانی زۆر بە وردی پەیوەست بوون بە نهێنیپارێزییەوە، تا ئەو رادەیەی نهێنییەکان تا سەردەمی سوکرات و ئەفلاتوون نەزانران، ئەویش کاتێك فیلۆلاوس Philolaus ــی فەیلەسووفی فیساگۆری لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا کتێبێکی —وەك دەوترێت بەهۆی مکوڕبوون لەسەر

پێویستی بە پارە ـــ لە سێ بەرگدا نووسی و "دیون"ی فەرمانڕەوای سراقۆستە بە لەگوێگرتنی ئامۆژگاریی ئەفلاتوون لێی کڕی ئەم نهێنییانە باسکرا بوون. هەروەها "بێدەنگی" یەکێك لە ئادابەکانی قوتابخانە بوو، تا ئەو رادەیەی وای بۆچوون کە پێویستە لەسەر قوتابی نوێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ بێدەنگ بێت، بەو هۆیەشەوە بە بێ پرسیار و مشتومڕ قەبووڵی ڕێنماییەکانە دەکەن.

بەڵام ئەمە هیچ نییە جگە لە بیرکەیەکی گشتگیر لەبارەی قوتابخانەی فیساگۆرسەوە کە —بۆ یەکەمجار ـــ ژنان و پیاوانی لە پەیمانگایەکدا کۆکردەوە، هەلێکی کەمی بۆ ژن ڕەخساند تا لەنێو ئەوەی پێی دەگوترێت کۆمەڵی فیاگۆرییەکان توانا عەقڵییەکانی خۆی دەربخات. ئەی کەواتە ئەم کۆمەڵەیە کێن؟ بونیاد و ڕێساکانی چییە؟

## سێیەم: کۆمەڵی فیساگۆریەکان

دوای ماوەی دیلییەتی لای فارسەکان ـــ فیساگۆرس لە کرۆتۆن نیشتەجێ بوو، ئەویش کۆلۆنییەکی یۆنانی بوو لە باشووری ئیتالیا و سەنتەرێکی بازرگانی گرنگ، بەندەرێکی بازرگانیی دەرەکی بوو. ڕەنگە هەر لە بەر ئەم هۆیەش بێ کە ئایینی ئۆرۆفیزمی تێدا بڵاوبوویەوە[٣٣].

ئەگەرچی ژیانی ئایینی لەم شارەدا لەچاو شارە یۆنانییەکانی تردا وشکتر بوو، بە جۆرێك کە هەرگیز گوێبیستی هیچ ڕێبازێکی عەقڵی لای فەیلەسووفەکانی ئەیۆنیا نەبوون، بەڵام هەر بەزوویی فیساگۆرس ئەم کەم و کوڕییەی بۆ پڕکردنەوە[٣٤].

لەنێو لێکۆڵەرەکاندا مشتومڕێکی دوورودرێژ ورووژا لەبارەی ئەم کۆمەڵەوە کە فیساگۆرس کاتێك گەیشتە کرۆتۆن، لە باشووری ئیتالیا دایمەزراندووە. ئەوان لەبارەی سیفەتەکانی ئەم کۆمەڵەوە رای جیاوازیان هەبوو: ئایا کۆمەڵەیەکی سیاسی بوو؟ ئایا فیساگۆرس سەرقاڵ بوو بە سیاسەتەوە؟ لە راستیدا دژوارە بگوترێت کۆمەڵی فیساگۆرییەکان ڕێکخراوێکی سیاسی بووە، بەڵکو زیاتر کۆمەڵێکی سۆفیگەریی

فەلسەفی بوو بەشێوەی ئەو شانە ئۆرفییەی کە لە یۆنان و ئیتالیا بڵاو بووبوونەوە. رەنگە رێنماییە فیساگۆرییەکان بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەکە هەندێك بەرەنجامی سیاسی هەبووبێت، بەڵام بەرەنجامگەلێکی مەبەستدار نەبوون، ئەو کۆمەڵەیە هەرگیز هەوڵی بۆ فەرمانڕەواییکردنی کرۆتۆن یان هیچ شارێکی تری ئیتالی نەداوە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا فیساگۆرس بە تەواوی خۆی دوور گرت لەوەی بچێتە نێو بواری سیاسییەوە[٣٥].

"یامبلیخۆس" دەڵێ: «فیساگۆرس هەر راستەوخۆ دوای گەیشتنی بە کرۆتۆن کۆمەڵەکەی دامەزراندووە». شاری کرۆتۆن یەکەم شار بووە کە تێیدا فیساگۆرس ژمارەیەك قوتابی لەخۆی کۆکردۆتەوە، رووداوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن زیاتر لە شەش سەد قوتابی بەشدارییان لە یەك ژیاندا کردووە بە گوێرەی رێنماییەکانی. ئەم قوتابییانە فەیلەسووف بوون، هەروەها گوێگرانێکی دیکەشیان لەنێودا بووە کە پێیان گوتوون Acousmatics[٣٦].

بێگومان ئەم وەسفە زیادەڕەوی زۆری تێدایە، چونکە ماقوول نییە فیساگۆرس هەر کە کۆمەڵەکەی دادەمەزرێنێت دەستبەجێ قوتابیان بچنە نێوییەوە، بە جۆرێکی وا خۆیان لە چەند سەدێك بدەن، ئەمە وێڕای چەند هەزار گوێگرێکیش[٣٧].

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە وتار و گفتارەکانی فیساگۆرس کاریگەرییەکی بەهێزییان هەبووە کاتێك وەك کەسایەتییەکی کاریزمی charismayic خاوەنیان بووە[٣٨].

کۆمەڵی فیساگۆرییەکان ــ وەك ئەوەی یامبلیخۆس وەسفی کردووە ــ کۆمەڵەیەکی ئایینی و فەلسەفی بووە نەك رێکخراوێکی سیاسی. لێرەشەوە کۆمەڵێك یاسا و رێسای تایبەت بەخۆی هەبووە، وەك ئەوەی "دەوڵەت لەنێو دەوڵەت " بووبێت، بەجۆرێك کە ئەندامەکانی جیا بوون لە هەموو دانیشتوانی کرۆتۆن. ئەو تێرمەی کە بۆ وەسفکردنی ئەم گروپە بەکار دەهێنرێت بریتییە لە "هۆماکیۆن

Homikoeion" واتە: ئەو شوێنەی کە خەڵکی تێدا بە پاڵ یەکترییەوە کۆدەبنەوە بۆ گوێگرتن لە بۆچوونەکانی فیساگۆرس کە لە سەرەتادا پێشڕەوی ئەم کۆمەڵە بووە.

گومانی تێدا نییە کە فیساگۆرس لە سەرەتادا سەری ئەم کۆمەڵەیە بووە، ئەندامەکانیشی شوێنکەوتووان و قوتابی فەلسەفەکەی بوون، هەندێك کات ئەوان سیفەتی پیرۆزییان داوەتە پاڵی و زۆرجار بردوویانەتەوە سەر خودی ئەپۆلۆی خواوەند.

وا دەردەکەوێت فیساگۆرس توێژینەوەی لە بواری ئایینێکی فەلسەفیدا کردووە، کە هەندێك لایەنی پشتی بەستووە بە پەرستنی ئەپۆلۆی خواوەند. رەنگە ئەمە هۆکاری ئەوە بووبێت کە "کرۆتۆن" دراوێکی لە سککە دا ناوی ئەپۆلۆی خواوەندی لەسەر نەخشێنرا. دەبێت باس لەوەش بکەین کە خواوەندی پارێزەری ئەم شارە "هرقل" بووە، وەك ئەوەی فیساگۆرس لە وتارێکیدا بۆ گەنجەکان ئاماژەی پێ دەدات[٣٩].

ئەم کۆمەڵەیە لە سەردەمی ژیانی فیساگۆرسدا نەشونومای کردووە، بەڵام دوای مردنیشی لە گەشەکردن نەوەستاوە. لە راستیدا قوتابخانەیەکی تری فەلسەفی لە جیهانی کۆندا نابینیتەوە کە بە خێرایی و هێز و گوڕی قوتابخانەی فیساگۆری بڵاو بووبێتەوە" گۆڕانکاری و دەستکارییەکان لە تیۆرە بنچینەییەکاندا تێهەڵکێش بوو بە بیروباوەڕە فیساگۆرییەکان لە بەرەنجامی ئەوەی گوایە لەگەڵ روحی فیساگۆرسدا کە هەمیشە ئامادەیە خۆیان دەگونجێنن. لە کۆتاییدا پەرەسەندنەکان دابەش بوون و جیاوازی کەوتە نێوانیان. یان بڵێ "هارمۆنیا Harmonia" لە مێژینەکە لە زنجیرەیەك کێشمەکێش و دابەشبوونی نێو کۆمەڵەکەدا، تێکچوو. فەلسەفەی ژمارە بووە مایەی بەرەنجامگەلێکی جیاواز، تەنانەت هەندێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵەکە نهێنییەکانی مامۆستاکەیان درکاند و بزووتنەوەی تایبەت بە خۆیان دروست کرد: بۆیە ئەوە دەرکەوت کە پێیان دەگوت فیساگۆریزمی پاشین و فەیلەسووفی فیساگۆری فیلولاوس لە سەرەوەیدا بوو، ئینجا دوای ئەوە جارێکی تر لە شاری ئەسکەندەرییەش دەرکەوتەوە..هتد.

### چوارەم: بونیاد و ڕێساکانی کۆمەڵەکە

ئێستا پێویستە لە بونیادی کۆمەڵەکە و ئەو ڕێسایانەی کە بەڕێوەیان دەبرد ورد ببینەوە. سیستەم لە کۆمەڵی فیساگۆرییەکاندا بەشێوەی هیرارکیی سەربەرەوژوو بوو، کە لە ترۆپکەکەیدا خودی فیساگۆرس وەستا بوو، پاشانیش بەرەوخوار تا بناغەکەی، کە بۆ دوو بەشی جیاواز دابەش دەبوو: فەیلەسووفەکان ژمارەیەکی زۆر کەم بوون ئەگەر بەراورد بکرێن بە گوێگرەکان. وا پێدەچێ کە فەیلەسووفەکان گەنجانێك بوون توانای توێژینەوەی بیریکاریی فیساگۆرسیان هەبووە، بەڵام گوێگرەکان کەسانی پیر و خاوخێزانیان تێدا بووە. ئەوە جێی قەبووڵ نەبووە کە قوتابخانەکە تەنیا بۆ پیاوان بێت، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر ژنیشی لەخۆ گرتبوو، لێرەشدا کۆمەڵێك ناو هەیە کە بە هەڵە بۆ کۆمەڵی فیساگۆرییەکان بەکار هاتووە، دەگوترێت کۆمەڵێکی "برایان" بووە ــ واتە پیاوانی برا بوون ــ فیساگۆرییەکان ــو پەرەسەندنیان لە نیو فیساگۆریزمەوە بۆ نیو ئەفلاتونیزم ــ تاکە تاقمی فەلسەفی بووە کە ژنانێکی فەیلەسووفی بەناوبانگی بۆ جیهان بەرهەم هێنا بێت، هەر لە سیانۆ Theano ــی هاوسەری فیساگۆرس و سێ کچەکەیەوە: ئەریگۆنت Arignote و میباMiya و دامۆ Domo کە دوای مردنی دامەزرێنەرەکەی سەرپەرشتی قوتابخانەی فیساگۆرییان کردووە، تا دەگات بە هیپاشیا Hypathia ــی ژنە فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەسکەندەری وەك ئەوەی دواتر دەیبینین. فیساگۆریزم تاکە قوتابخانە بووە کە بەم شێوەیە ڕێی بە ژنان داوە بچنە نێوییەوە و بەشداری لە ژیانیدا بکەن و هەلی فێربوونیان پێ بدات..هتد، ئەمەش وای لە لێکۆڵەرێکی وەك لیڤی Levy کردووە کە لە کتێبەکەیدا "لێکۆڵینەوەکان لەبارەی سەرچاوەکانی ئەفسانەی فیساگۆرسەوە" هەوڵ بدات بۆ بەراوردکردنی ژنانی شوێنکەوتووی فیساگۆرس بە ژنانی شوێنکەوتووی مەسیح بەتایبەتیش ئەو سێی ژنەی کە ناویان مریەم بووە[٤٠].

یامبلیخۆس لەبارەی دابەشبوونی کۆمەڵی فیساگۆرییەوە دەڵێت:

«ئێستا لێگەڕێ با پێت بڵێیم کە فیساگۆرس چۆن ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی، دوای ئەوەی بەپێی لێهاتوویيان (و دوای بڕینی تاقیکردنەوە پێویستەکان) دابەش کردبوو، بە بۆچوونی ئەو گونجاو نەبوو ئەندامەکانی کۆمەڵەکە بە یەکسانی بەشداری لە هەمان کاروباردا بکەن، تەنانەت گونجاو نەبوو بەشداری لە هەموو ئەو هزرانەشدا بکەن کە پێگەیەکی باڵایان هەیە، کەچی ئەوانی دیکەش بە تەواوی فەرامۆش بکرێن، چونکە ئەوە نە دادوەرییە و نە هەقبەشی (إنصاف)* و بگرە ژیانی بە کۆمەڵیش نییە. بەڵام دابەشکردنی بەشی گونجاو لە تیۆرە سەرەکییەکان بەسەر هەموو ئەندامەکاندا، ئەوە بە پێی توانا بۆ هەمووان بەسوودە. هەروەها بەو هۆیەوە دەیتوانی ئامرازێکی عادل بەکاربهێنێت، بە هەر ئەندامێك ئەو ڕێنمایانە بدات کە ئەندامەکە شیاوی بووە. دەبینین بە پێی ئەو هێڵی بیرکردنەوەیە، ناو لە هەندێك ئەندام دەنێت "فیساگۆرییە ڕەسەنەکان". پێی وایە دەبێت ئەم ئەندامانە بەشداری لە هەموو شتێکی هاوبەشدا بکەن، بە درێژایی کاتیش بە جۆرێك بژین کە بڕێك لە هاوبەشێتی تێدا بێت. بەڵام ئەوانی تر ڕێیان پێدراوە کە موڵکی تایبەتییان هەبێت، "لە هەمان شوێنەوە بێن بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ یەکتردا"»[٤١].

وێڕای ئەوانەش، فیساگۆرس ناوی "ڕێکخەرەکان" لە "فیساگۆرییە ڕاستەقینەکان"، بە ژن و پیاوەوە، دەنێت، بەڵام ناوی "گوێگرەکان" لەوانی دیکە دەنێت. دەستەی یەکەم بەشێوەی ژیانی هاوبەش دەژین، شتی تایبەتییان نییە بەڵکو موڵکایەتی لەنێوانیاندا هاوبەشە، ئەمە لە کاتێکدا دەستەی دووەم مافی خۆی بوو موڵکی تایبەتی هەبێت (ئەوەش ڕیشەکانی ئەو بیرۆکەیەیە کە لە دواتردا ئەفلاتوون لە کۆماردا دەیخاتە ڕوو)[٤٢] ـــ دەستەی یەکەم لەنێو قوتابخانەکەدا دەژین، دەستەی دووەمیش ماڵی تایبەت بەخۆیان هەیە و دوای تەواوبوونی وانەکان بۆی دەگەڕێنەوە (گوێگرەکان زۆرینەی هەرەزۆری شوێنکەوتووەکان پێکدەهێنن). بەم جۆرەش هەر لە سەرەتاوە بەڕوونی دوو دەستە یان بەش لە قوتابخانەی فیساگۆریدا بوونیان هەبووە، لە دوای ئەمانیشەوە گروپەکانی تر دەردەکەوتن، هەندێك لە شوێنکەوتووانی فیساگۆرس

خۆیان تەرخان کردبوو بۆ هزریی تیۆری، هەر ئەندامێکیشان نازناوی "شکۆدار" یان "ڕێزدار"ی هەبو، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەوانی تر خۆیان بە توێژینەوە لە کاروبارەکانی مرۆڤ خەریك دەکرد.

«هەرچی دەستەی یەکەمە (کە گرنگی بە هزریی تیۆری دەدات) خۆی بە بیرکاری و ئەندازە و فەلەکەوە سەرقاڵ کردبوو. هەر لەبەر ئەم هۆیەش ناوی "ڕێکخەرەکان"ـیان لێ نراو، ئەندامەکانی ئەم دەستەیە ڕاستەوخۆ قوتابی فیساگۆرس بوون و نازناوی فیساگۆرییەکانیان لێنرا..هتد»[٤٣].

ڕەنگە ئەم دابەشبوونانە لە قۆناغی دواتری پەرەسەندنی کۆمەڵەکەوە وەرگیرا بێت: چونکە بێگومان ناونانی قوتابییەکانی فیساگۆرس بە فیساگۆرییەکان پرسێك بوو لە قۆناغی پاشینی پەرەسەندنی کۆمەڵکەدا دوای مردنی فیساگۆرس، کە قوتابییەکانی کاروبارەکانی قوتابخانەکەیان هەڵدەسوڕاند، هەمان شتیش دەرهەق بە فیساگۆرییە سیاسییەکانیش بڵێ کە گرنگیان بە کاروبارەکانی مرۆڤ دەدا، ئەم ناوە ئەو کاتە دەرکەوت کە فیساگۆرییەکان دەستیان کرد بە بایەخدان بە سیاسەت. ئەمە لە کاتێکدا "شۆدارەکان" یان "ڕێزدارەکان" لە بازنەی ناوخۆدا پێشەوای کۆمەڵەکە بوون. بازنەیەکی ناوخۆیی خزمان و کەسە نزیکەکان هەبوو کە ڕێیان پێدەدرا لە پشتی پەردەبن، بتوانن فیاگۆرس ببینن یان گوێی لێ بگرن. وا دەردەکەوێت فیساگۆرس لەکاتی وتنەوەی وانەدا بە گوێگران لە پشتی پەروەردەیەکەوە خۆی شاردبێتەوە، قوتابیە تازە دەستپێکردووەکان، ئەندامە نوێیەکان بۆیان نەبووە ڕاستەوخۆ بیبینن. بەڵام تەنیا ئەندامەکانی بازنەی ناوخۆیی بۆیان هەبووە بیبینن و گوێ بیستی بن. کاتێك تازە دەستپێکردوو هەموو ئەو تاقیکردنەوانە دەبڕێت کە بەسەریدا دەسەپێنرێت، ئەوا ڕێی پێدەدرێت لە پشتی پەردەکەوە دابنیشێت، یامبلیخۆش ئەم تاقیکردنەوە و پرۆسەی ڕێوڕەسمانە[٤٤] بەم جۆرەی خوارەوە باس دەکات:

«کاتێك فیساگۆرس بەم شێوەیە سەرقاڵ بوو بە فێرکردنی قوتابییەکانییەوە، کەچی ڕێگەی بە گەنجەکان نەدەدا ڕاستەوخۆ بێنە نێو کۆمەڵی فیساگۆرییەکانەوە تەنیا دوای بڕینی ژمارەیەك تاقیکردنەوە نەبێت»[٤٥]. دوای ئەوەش بڕیاری خۆی لەبارەیانەوە دەردەکرد. پرسیاری یەکەم کە ئاراستەی دەکردن ئەوەبوو: بە چ ڕێگایەك پەیوەست ئەبنەوە بە باوان و خزمانتانەوە؟؟! پاشان لەکاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەیدا تێبینی و چاودێریی دەکردن: ئایا لە کاتێکدا پێدەکەنن کە وەختی پێکەنین نەبێ، یان بە درێژایی کات ئارام و هێمنن؟ ئایا قسە زۆر دەکەن؟ ئینجا ئەی چی دەربارەی چەنەبازی و زۆربلێیی؟[٤٦]

پاشان فیساگۆرس لەبارەی هاوڕێکانیانەوە دەیپرسین، چی دەکەن لەگەڵیاندا لە کاتەکانی دەست بەتاڵیدا؟ بە درێژایی ڕۆژ بە چییەوە خەریکن؟ ئەو شتانە چین کە لە دڵیدا شادیبەخش و غەمهێنەرن؟!

ئەو —بە درێژایی ئەم پرس و باسە ــ چاودێریی ڕوخسار و جووڵە و متبوون و شێوەی جەستە و ڕێگای ڕۆیشتن و هەموو نیشانەکانی تری دەکردن.. ئەو لە ئەدگاری ڕوخسارییانە حوکمی لەسەر خولق و خووی گەنجەکە دەدا، خەسڵەتە دەروونییە نادریارەکانی لەو سیفەتە دەرەکیانەوە ڕاڤە دەکرد کە تێبینی دەکردن.

هەر کەسێك ئەم تاقیکردنەوەی ببڕیایە بۆ ماوەی سێ ساڵ لەژێر چاودێریدا دەمایەوە بۆ تاقیکردنەوەی هاوسەنگی و جێگیریی و خۆڕاگریی و خۆشەویستییەکەی بۆ زانست، تا بزانرێت: ئایا ئەم تازە قوتابییە ئامادەگی ئەوەی هەیە خۆی لە کاروبارە هەستییەکانی دنیا، لەوانەش سوودی دنیایی، بکشێنێتەوە و بچێتە نێو زوهدەوە؟! پاشان بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەسەر تازە قوتابییەکاندا بێدەنگی دەسەپاند، بۆ ئەوەی ببینێت دەتوانێت تا چ ڕادەیەك خۆی ڕابگرێت و ڕەفتارەکانی خۆی ڕێك بخات و کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتەکانی بکات. فیساگۆرس پێی وابوو کۆنترۆڵکردنی زمان لە هەموو جۆرەکانی دیکەی خۆ ــ کۆنترۆڵکردن قورسترە. لەم ماوەیەدا

شوێنکەوتووانی فیساگۆرس ئەرکەکانی تازە قوتابییەکەیان دیاری دەکرد. دوای ئەم بێدەنگییە پێنج ساڵەییە، تازە قوتابییەکە دەبرایە نێو بازنە ناوخۆییەکەوە.

سەیر لەوەدایە کە فیساگۆرس لەمیانەی ئەو تاقیکردنەوانەی لەسەر تازە قوتابییەکانی ئەنجام دەدا، خۆی بڕیاری لەبارەوە دەردەکردن، بە چاوپۆشی لە ئەرستۆکراتبوون یان رەوشی خێزانەکە لە کۆمەڵگەدا، کەچی هەندێك لە نووسەر و لێکۆڵەرەکان بە هەڵە وای بۆ چوون کۆمەڵی فیساگۆرییەکان ئۆرستۆکراتی بوون. هەروەك ئەوانەش هەڵەیان کردووە کە پێیان وابووە کۆمەڵی (برا) یان (برایان) بووە بە بێ سەربارخستنی خوشکانیش بۆیان.

بایەخی تاقیکردنەوەکان لەوەدا بوو کە شوێنکەوتووەکە یان تازە قوتابییەکە لەگەڵ ئاکارەکانی فیساگۆرسدا را بێت، ئەوەش ناسراوە کە کۆمەڵی فیساگۆرییەکان رێساگەلێکی توندییان هەبووە، لەوانە: "نهێنیپارێزی" و "بێ دەنگیلێکردن" و "شاردنەوە" و "بێ دەنگی" و "بەرگرتن لە پێکەنین" و "هاتو هاوار نەکردن" و "مومارەسەی خۆ ــ کۆنترۆڵکردن".

هەروەها دەبوو کاتی سێکسکردن، یان لەو کاتەدا کە وەزیفەی سروشتی خۆی ئەنجام دەدات، یان کاتێك بەدەم بانگی سروشتەوە دەچێت، هیچ کەسێك نەیبینێت. ئەوەش روونە کە فیساگۆرس دەیویست "مرۆڤی باڵا" لە قوتابییەکانی دروست بکات، یاخود وایان لێ بکات بانتر بن لە سروشتی باوی مرۆڤ. بێ دەنگی بۆ ماوەی پێنج ساڵ (کە ئێمە نازانین ئایا بێ دەنگییەکی تەواو و گشتگیر بووە، یان بە پێی رێساگەل بووە) گرنگییەکی تایبەتی هەبووە، چونکە راهێنانی شوێنکەوتووەکان بووە لەسەر پارێزگاریکردن لە تیۆرە نهێنییەکانی مامۆستاکە و بێ دەنگیلێکردن، نەدرکاندنیان بۆ هیچ کەسێك جا پایە و پێگەی هەر چییەك بێت.

فەلسەفەی فیساگۆرس رووکارێکی نهێنییانەی ئایینی هەبوو وەك ئەوەی کە "یامبلیخۆس"ی مێژوونووسی فیساگۆری تێبینی کردووە، ئەوەش لە ئاگادارکردنەوەی ئەندامەکانی کۆمەڵەکەدا دەردەکەوێت دوای درکاندنی نهێنییەکانی

ڕێنماییەکانی فیساگۆرس. لەم گۆشەیەوە کۆمەڵەکە، بە پێچەوانەی ڕێکخستنە سیاسییەکان کە پاساوی بوونیان وا لەنێو ریکلام و پروپاگەندە بۆ بیروڕاکانیان و بڵاوکردنەوەی بۆچوونەکانیان کە بانگەشەی بۆ دەکەن. تەنانەت فیساگۆریزم بەم "بێدەنگی"ـیە ناکۆکە لەگەڵ ئایینە ئاشکراکاندا کە بە بیروبۆچوونە ڕاگەیەنراوەکانیان ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن و ڕێنماییان دەکەن. مەگەر ئەوەی بڵێین کە "بێ دەنگی"ـیەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆرێك لە تیۆرە فیساگۆرییەکان شەقڵێکی شۆڕشگێڕییان هەبووە، زۆرینەی خەڵکی نەیانتوانیوە لێیان تێ بگەن. ئینجا ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەیان لای هەمووان دەبێتە هۆی نارەحەتیی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەمەش ئەو شتەیە کە کۆمەڵەکە سووربووە لەسەر ڕوونەدانی و دوورخستنەوەی[٤٧].

هەر ئەندامێکی نوێ کە دەچووە نێو کۆمەڵەکەوە دەبوو پەیڕەوی لە ڕێسا و یاساکانی بکات، ڕەنگە ئەو ڕێسایەی کە بۆ ئەندامە تازەکە دەبووە کێشە ڕێسای "کۆمۆنەیی" بووبێت، بەتایبەت بەنسیبەت ئەندامەکانی بازنەی ناوەکییەوە، بەجۆرێك کە بۆیان نەبوو خاوەنی هیچ شتێك بن، فیساگۆرس بڕوای وابوو کە موڵکایەتی و خاوەندارییە تایبەتییەکان کۆسپ دەخەنە بەردەم هزریی تیۆری و تێڕامانی عەقڵی لە حەقیقەتە خوداییەکان، زەینی فەیلەسووف ناکاتە زەینێکی "ڕوون"ی خاوێن، بەڵکو دووبەرەکی لەنێوان ئەندامەکاندا دروست دەکات[٤٨].

پاش کەمێکی تر ڕۆژێك لە ژیانی ئەندامێکی کۆمەڵی فیساگۆری باس دەکەین. ئەگەرچی، بە شێوەیەکی گشتی، زۆرینەی کاتەکانیان تەرخان بوو بۆ خوێندنی تیۆری، چونکە بنچینەی فەلسەفەی فیساگۆرس "بیرکاری" بوو، زۆرینەیشی بیرکاریی پراکتیکی نەبوو، بەڵکو تیۆری بیرکاری بوو، هەر لێرەشەوە گرنگیان بە توێژینەوە لە خەسڵەتەکانی ژمارە داوە. ژمارە یەك Monas بووە هێمای جێگیریی و بەردەوامی لە گەردووندا. هەموو شتێکی باش لەم جیهانەدا لە یەکەوە دێت، چونکە یەك بریتییە لە بنچینەی ژمارە تاکەکان. بەڵام ژمارە دوو Dyad هێمای کەم و کورتییە

له گەردووندا: دەبێت جیهان دژەکان لەگەڵ یەکدا بخاتە گونجاوییەوە، بۆیە ناکرێت تەنیا بە بوونی خێر، واتە "یەك" راڤەی بکەین، بەڵکو پێویستە رەگەزی خراپەش کە بەربەرکانێی چالاکییەکانی چاکە دەکات، بوونی هەبێت. دەڵێن فیساگۆرس ئەم دوالیزمە گەردوونییەی لە دوالیزمی مەجوسەوە وەرگرتووە. ئەرستۆ دەڵێت فیساگۆرییەکان —لەبەر ئەم هۆیە ــ لیستێکی پێکدژەکانیان داناوە کە ژمارەیان دە پێکدژ بووە، بەم جۆرەی خوارەوە:

١- سنووردار ــ بێ سنوور.
٢- تاك ــ جووت.
٣- یەك ــ فرە.
٤- راست ــ چەپ.
٥- نێر ــ مێ.
٦- مەنگ ــ جووڵە.
٧- ڕاست ــ چەماوە.
٨- ڕووناکی ــ تاریکی.
٩- چاکە ــ خراپە.
١٠- چوارگۆشە ــ لاکێشە.

تێبینی دەکرێت کە ئەوانە دە پێکدژن، چونکە ژمارە دە کاملترینی ژمارەکانە[٤٩]. لە بەرەنجامی توێژینەوەی فیساگۆرییەکانەوە بوو لە خەسڵەتی ژمارەکان کە ژمارە ٤ بووە هێمای عەدالەت، ژمارە ٦ هێمای هاوسەرگیری، ...هتد[٥٠].

لە کۆتاییدا دەبێت سەرنجی ئەوە بدەین کە بازنەی ناوەکی لای فیساگۆرییەکان هاوشێوەی چینی پاسەوانەکانە لای ئەفلاتوون، لەگەڵ یەك جیاوازیدا ئەویش ئەوەی کە فیساگۆرییەکان رۆڵیان لە سیاسەتدا نەبوو، پاسەوانەکانی ئەفلاتوون لە بورجی عاجییانەوە دادەبەزنە خوارەوە، بۆئەوەی تیۆرەکانیان شۆڕ بێتەوە بۆ ژیانی سیاسی و

کۆمەڵایەتی، ئەمەش ئەو شتەیە کە فساگۆریزمی بەرایی ـــ واتە فساگۆریزمی زووکات نەیکردووە.

لەگەڵ ئەوەیشدا فیساگۆرییەکان وەك رەهبانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست نەبوون، بەڵکو هاوسەرگیرییان کردووە، زۆر رەگەزی ژنانە لە کۆمەڵەکەدا هەبووە، ژیانیشیان بۆ نوێژ تەرخان نەکردبوو، بەڵکو بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی. باشترین نموونە بۆ فیساگۆریزم ئەوەیە کە ئەفلۆتین لە سەدەی سێیەمی زایینیدا ئەنجام داوە، کاتێك لە رۆما بازنەیەکی لە شوێنگەواتووانی بە شێوەی "کۆمەڵەی کۆمۆنەی فیساگۆریزم" لە خۆی کۆکردەوە. ئەفلۆتین لە رەوشگەلێکی سەیر و نامۆدا لە ناوجەرگەی شاری پایتەختدا هەر بەم جۆرە دەژیا، لە ماڵی خەڵکانی تردا دەخەوت، خواردنیانی دەخوارد. باشییەکەی لەوەدا بوو کە خواردنی رووەکی دەخوارد، بۆیە تەنیا کەمێکی دەخوارد، بەڵام منداڵەکانیانی دەبینین!.

## پێنجەم: رۆژێك لە ژیانی فیساگۆرییەکان

فیساگۆرس پێشەوای کۆمەڵەکە بوو، هەر ئەویش بوو رەفتارەکانی ئاراستە دەکرد و پلانەکانی بۆ دادەنا، دەبوو هەموو ئەندامەکانیش فەرمان و رێنماییەکانی ئەویان بنواندبایەوە. کەواتە فیساگۆرس ژیانی رۆژانەیانی چۆن رێکخستبوو؟

«کۆمەڵەکە لە بەرەبەیاندا هەڵدەستان، هەر ئەندامێکیش بە تەنیا، پیاسەیەکی بەو شوێنانەدا دەکرد کە بە سروشتی خۆیان هێمن و ئارام بوون، واتە بەتەواوی کش و مات بوو، بۆ نموونە گەڕان بە دەوری پەرستگەکاندا، یان پیاسەکردن لە دەغل و دەوەنە پیرۆزەکاندا، هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو کە دەبووایە بەو بەیانییە زووە کەس نەبینێت، چاوی بە کەس نەکەوێت، مەگەر ئەو کاتەی زەینی خۆی بۆ ئەم کارە ئامادە کردبێت، بۆیە بەرەبەیان و ئارامی شوێنەکان تێکەڵ بە دۆخێکی باشی زەینی دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا چوونە نێو دنیای خەڵکییەوە، خۆ کردن بە نێوەندی حەشیمەتدا راستەوخۆ دوای بەخەبەرهاتن، دەروون وەڕز دەکات. بۆیە بە بەردەوامی

بۆ فیساگۆری وا باشترە کە بەو کاتە زووەی بەیانیان ئەو شوێنە پیرۆزانە هەڵبژێرێت کە دوورەپەرێزن لە ژاوەژاو و هاتوهاوار، پەرۆشی هێمنی و بێ دەنگی بن و ئەم هەلە بقۆزنەوە بۆ چەسپاندنی فەزیلەتە ئاکارییەکان.

ئەندامی فیساگۆری کاتێك لەم پیاسەی بەیانیانە دەگەڕایەوە، کە تێیدا گرنگی بە دەروونداا بوو تا لەویشەوە بایەخ بە جەستەی بدات، هەندێکیان جەستەی خۆیان بە زەیت چەور دەکرد و کەمێك لێی رادەکشان، هەندێکی دیکەیان لە باخچەی قوتابخانەکەدا یاریی زۆرانبازییان دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا هەندەکەی تریشیان خەریکی یاریی بازهەڵدان دەبوون..هتد. بە شێوەیەکی گشتی ئەوان مومارەسەی کۆمەڵە مەشقێکی وەرزشییان دەکرد کە بەدەن بەهێز دەکەن.

پاش ئەوە ئەندامەکە نانی بەیانی دەخوارد کە پێکهاتبوو لە نان و هەنگوین، لە رۆژیشدا خواردنەوەی مەیی لێ قەدەغە کرابوو. دوای نانخواردن کاتی خۆی تەرخان دەکرد بۆ توێژینەوە لە پرسە ئابووری و سیاسییەکان.

پاشان ئەندامەکان دەستیان دەکرد بە پیاسە، بەڵام ئەمجارەیان بە گروپ، نەك وەك گەڕانی بەرەبەیان بە تاك! گروپی چکۆلە پێك دەهات لە دوو یان سێ ئەندام، ئەمانە بەدەم رۆیشتنەوە وانەکانیان بەبیردەهێنانەوە و باسیان دەکردنەوە.

دوای گەڕانەوەیان لە پیاسەی بە گروپ خۆیان دەشوشت، ئینجا بە ئامانجی خوێندن لە ژوورگەلی تەنگەبەردا کۆدەبوونەوە —یەك ژوور لە دە کەس زیاتری نەدەگرت ــ تا ئەوەی بۆ ژەمی گشتی بانگ دەکران، ژەمی نانخواردن، یەکەمجاریش بوخووریان دەسووتاند و ئاژەڵییان دەکرد بە قوربانی بۆ خواوەندەکانیان، پاشانیش دەچوون بۆ نانخواردن —دەبوو بەر لە ئاوابوونی رۆژ لە خواردن دەستیان کێشابێتەوە ــ ئینجا دەستیان دەکردە مەی خواردنەوە و سووکە ژەمێك لە جۆ و رووەکی تازە و لێنرا، زۆر بە کەمییش ماسییان دەخوارد، ئینجا بۆ رێزلێنانی خواوەندەکان مەییان دەپرژاند. دوای ئەوە کاتی خوێندنەوە دەهات، نەریت بوو کە بچووکترین ئەندام دەستی دەکرد بە خوێندنەوە، بەڵام گەورەترین ئەندام هەم ئەو بابەتەی دەستنیشان

دەکرد کە دەبوو بخوێنرێتەوە و هەم ئەو ڕێگایەشی کە بۆ ئەم خوێندنەوەیە گونجاو بوو.

کاتێکیش وادەی ڕۆیشتنەوەی ئەندامەکان بۆ ماڵەکانیان دەهات، گەورەترینی ئەندامەکان ئەم گوزارانەی خوارەوەی دەگووتەوە، کە لە ڕێنمایی و ئاگادارکردنەوە دەچن:

«دەبێت ئازاری کەس نەدەیت، ڕووەکە چێنراوەکان هەڵنەکێشیت، هیچ درەختێك لە درەختی میوەکان نەشکێنیتەوە، ئازاری هیچ ئاژەڵێکیش نەدەی کە ئازاری مرۆڤ نادات.

وێڕای ئەوەش دەبێت ڕێز لە خواوەندەکان بگریت، هەڵوێستێکی خانەدانانەیان لەبەرامبەردا بنوێنێت، هەروەها دەبێت هەڵوێستت بەرامبەر بە پاڵەوانەکانیش هەبێت، بەرامبەر بە دایك و باوکانی چاکەکاریش، هەروەها دەبێت هاوکاری یاسا بکەیت، دژایەتی لە یاسادەرچووانیش بکەیت»[٥١].

دوای ئەوەی ئەم گوزارشتە دەگوترایەوە، هەر ئەندامێك کە جلێکی سپی خاوێنی پاکی دەپۆشی (وا پێدەچێ ئەم جل و بەرگە هەر ئەوە بووبێت کە کەهەنە میسرییەکان پۆشیوویانە) بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە. بەڵام لە ماڵەکانیاندا دەبوو خێزانێکی سپیی خاوێنیان هەبێت، پێخەفەکەشیان لە پەموو بێت: ڕێگەی بەکارهێنانی خوورییان پێ نەدەدرا[٥٢].

ئەمە پەسنی یامبلیخۆسی مێژوونووسی فیساگۆرییە، بەڵام وا دەردەکەوێ ئەم پەسنە بەسەر گروپی گوێگرەکاندا دەچەسپێ نەك چینی فەیلەسووکان لە کۆمەڵی فیساگۆری، چونکە چینی فەیلەسووفەکان نە گۆشت دەخۆن و نە مەی دەخۆنەوە، لەسەریشیان نەبوو باس لە وانەکانیان بکەنەوە، هەروەها ئەوان لەنێو قوتابخانەکەدا دەژیان نەك وەك گوێگرەکان کە بە ڕۆژ کۆدەبوونەوە و بەشەویش بەرەو ماڵەکانیان بڵاوەیان لێ دەکرد[٥٣].

بۆیە وا دروستترە بڵێین ئەو پەسنەی پێشووی ڕۆژێك لە ژیانی ئەندامی فیساگۆری تەنیا تایبەتە بە گوێگرەکان، ئیدی فەیلەسووفەکانی نەدەگرتەوە کە لە ژیانێکی هزریی و روحی باشتردا دەژیان. ئەمانە بە تاکەکەسی دەگەڕان بۆئەوەی لەوە رابمێنن کە لە کارەکانی ڕۆژی پێشترەوە بەدەستیان هێنابوو، هەروەها بۆ ئەوەی تیۆرەکانی مامۆستاکەیان رایی بکەن، لەوانەشە دوای ئەوەی بۆ مشتومڕکردن لەسەر رێنماییەکانی فیساگۆرس، خواردنی ناشتای هەنگوین و نان (چونکە فیساگۆرس زۆرحەزی لە هەنگوین بوو)، یەکتریان بینیبێت، وەك چۆن مەشقە وەرزشییەکان لایەنێکی گرنگ بوون لە بەرنامەی ڕۆژانەیان، لە قاوشە فراوانەکاندا نانیان دەخوارد، ئەوەش بیرۆکەیەك بوو کە فیساگۆرس لە سپارتەییەکان و کریتییەکانەوە وەری گرتبوو، وەلێ لەجیاتی قوربانیکردنی ئاژەڵان وا پێدەچێ فەیلەسووفەکان تەنیا بوخووریان داگیرساندبێ کە دیسان ئەمیش فیساگۆرس حەزی لێی بووە و —وەك فرفوریۆسیش دەڵێ — وەك ئامرازێك بەکاری هێناوە بۆ سروش و پێشبینیکردن. ژەمی سەرەکی ئەم فەیلەسووفانە خوادنی رووەکی بووە، تەنانەت رێگەی خواردنی گۆشتی خێرکردن و قوربانیشیان پێ نەدراوە. دوای کۆتاییهاتنی رۆژ ئەم ئەندامانە لە قوتابخانەکەدا دەمانەوە، بە جۆرێك کە هەموو شتێك لەنێوانیاندا هاوبەش بوو، خۆ ئەو پەسنەی پێشتر کە پەسنی چینی گوێگران بوو، دەشێت بە راستکردنەوەی هەندێك وردەکارییەوە بەسەر رێکخەرەکانیشدا بچەسپێت[٥٤].

## کۆتایی

دوای ئەم گەشتە گشتییەمان بە قوتابخانەی فیساگۆریدا، دەبێت زۆر باش ئاگاداری ئەم خاڵانە بین:

١- هەموو ئەوەی پێشتر لەبارەی "ئەندام"ـە فیساگۆرییەکانەوە باسمان کرد، وەك یەك بەسەر پیاو ژندا دەچەسپێت.

٢- سەرچاوە کۆنەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژنان لە قوتابخانەی فیساگۆریدا تا ئەوپەڕی چالاك بوون، رۆڵێکی سەرەکییان گێڕاوە لە پەرەسەندنی فیساگۆریزمی یەکەمدا.

٣- دیۆجین لایرتی لە کتێبەکەیدا "لەبارەی ژیانی فەیلەسووفە ناودارەکانەوە" ئاماژە بە کاریگەربوونی فیساگۆرس دەکات بە هەندێك کەسایەتی ژن، ئەمە وێڕای کاریگەربوونی بە قوتابخانەی ئەیۆنی، ئینجا بە میسرییەکان و فارسەکان وەك پێشتر بە درێژیی باسمان کرد، دیۆجین لەم بارەوە دەڵێت:

«ئەرستۆنکسوس Aristonexus جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فیساگۆرس بەشی زۆری تیۆرەکانی لە زەمستۆکلیا Themistoclea[٥٥] وەرگرتووە کە وەك کاهینەی ئەپۆلۆی خواوەند لە دلفی کاری کردووە»..[٥٦]

لە بەشی داهاتوودا رۆڵی ژنە فیساگۆرییەکان لە یەکەم قۆناغ یان قۆناغی زوو کاتی فیساگۆری باس دەکەین، پاشانیش لە بەشی سێیەمدا باس لە ژنە فیساگۆرییە دواییەکان دەکەین.

# بەشی دووەم

## ژنە فەیلەسووفەکان لە فیساگۆریزمی یەکەمدا

- سیانۆ Theano
- ئەریگنۆت Arignote
- مییا Myia

(ئەگەر بە سەر پشتی سەپێکی شێوە بیت، باشترە لەوەی کە ژنێك بیت و بیر نەکەیتەوە..!)

سیانۆ

# دەستپێك

لەم بەشەدا سێ فەیلەسووفی ژن لە قوتابخانەی فیساگۆریزمی بەرایی یان یەکەم یان بنەڕەتی دەخەینەڕوو لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا، ئەوانیش:

- سیانۆ Theano
- ئەریگنۆت Arignote
- مییا Myia

یەکەمیان هەوڵیدا راڤەی ئەو گوزارەیەی فیساگۆرس بکات کە دەڵێ «جیهان ژمارە و تەباییە» کە جیهانی یۆنانی خراپ لەم گوزارەیە تێگەیشتبوون، تا ئەوەی دەیانگوت ئەمە واتای ئەفراندنی شتە مادییەکانە لە ژمارەکان! بە بۆچوونی ئەو ئەم گوتەیە بە ئاشکرا پووچە، چونکە فیساگۆرس مەبەستی لەوە بووە کە شتەکان بەشێوەی ژمارەکان ئافرێنراون، ئینجا گرنگیداوە بە وێناکردنی "لاسایی" کە دواتر ئەفلاتوونیش بایەخی پێ دەدات.

هەرچی دووەمیانە "ئەریگنۆت" هەوڵیداوە بۆ توێژینەوە لە سروشتی ژمارەکان، یان ماهییەتی ئەزەلی ژمارەکان کە هۆکاری یەکەمی هەموو ئەو شتانەیە لە زەمین و ئاسمان و نێوانیشیاندا هەن. بەڵام لێرەدا ژمارە هیچ مانایەکی تری نییە جگە لە هارمۆنیا و گونجاوی نێوان شتەکان، یان تۆ بڵێ پەیوەندی یان ڕێژەی نێوان شتەکان، هەر ژمارەشە توانای جیاکردنەوە و لێك کردنەوەی شتەکانمان پێدەدات، پاشانیش "ژماردن" و "ژمێریاری".

هەرچی سێیەمیانە "مییا" هەوڵیدا بۆ جێ بەجێکردنی هارمۆنیا خۆی لە جیهانی خێزاندا و بەتایبەتیش پەروەردەی منداڵ، ئەوەش ئەو بیرۆکەیەیە لە وێناکردنی "میانڕەوی" و "نێوانگیری"ـدا پوختەی کردۆتەوە، ئەو وایدەبینی ئێمە لە پەروەردەکردنی منداڵماندا دەبێت لە هەموو شتێکدا پەیڕەوی لە پرەنسیپی نێوانگیریی

بکەینەوە لە خواردنی، پۆشینی، پلەکانی گەرما و..هتد، ئەمەش لە نامەیەکیدا بۆ "فینتس" بە روونی دیارە کە تۆنێکی بەهێزیی میانەگیریی پراکتیکی بەسەردا زاڵە، وەك ئەوەی پێش بیرۆکە بەناوبانگەکەی ئەرستۆ کەوتبێت لە کایەی ئاکاردا کە ناوی دەنێت نێوانی زێڕین، یان رێسای زێڕین کە دەڵێت باشترین کار نێوانەکەیەتی نە زیادەڕۆی و نە کورتبڕی، یاخود «فەزیلەت بریتییە لە Nothing to much نێوانێك لەنێوان دوو رەزیلەتدا». بۆیە "میبیا" بیرۆکەی خۆی بە سانایی شرۆڤە دەکات، بەسەر نموونەیەکی زیندووی کردەییدا پراکتیزەی دەکات، ئەویش چۆنیەتی گرنگیدانە بە وەچەی نوێ.

## یەکەم: سیانۆ Theano
## (دەوروبەری ٥٠٠ پ.ز)

یەکەم ژنە فەیلەسووفی فیساگۆری کە دەرگیری دەبین "سیانۆ"یە، ئەو وەك قوتابی پەیوەندی کرد بە قوتابخانەکەوە و لەگەڵ هاوڕێ کچ و کوڕەکانیدا فەلسەفەی خوێند، پاشان بووە ژنی مامۆستاکە، خۆیشی بووە مامۆستا و دوای مردنی ناوادەی هاوسەرەکەیشی بەهۆی ئاگرکەوتنەوەوە لە ماڵی میبیای کچیدا، بووە بەڕێوەبەر.

سیانۆ کچی "برۆنتینۆس Brontinus" بوو، ئەویش کابرایەکی ئەرستۆکراتی ئۆرفی بوو لە شاری "کریتۆن"، خۆی تەرخان کرد بۆ توێژینەوە لە فەلسەفەی فیساگۆری و شرۆڤەکردنی و روون کردنەوەی. وا پێدەچێ شتێکیشی لەبارەی "لەخواترسی"ـیەو نووسیبێت، کە هیچی لێ نەماوەتەوە جگە لە چەند فراگمێنتێکی کەم. لەو کتێبەدا تاوتوێی پەرەسەندنە میتافیزیکییەکانی "لاساییکردنەوە" و "بەشداریکردن"ی کردووە، ئەمەش ئەو بیرۆکانەیە کە دواتر لای ئەفلاتوون بایەخێکی ئێجگار زۆر پەیدا دەکەن ـفیکی هارپەر Vicki harper ئەو پاشماوەی دەقەکەی بەم جۆرە وەرگێڕاوە:

«پێیان ڕاگەیاندووم زۆرێك لە یۆنانییەكان پێیان وایە فیساگۆرس وای بۆچووە كە هەموو شتێك (لە جیهاندا) لە ژمارەوە پەیدا بووە. بەڵام ئەم گوتەیە كێشەیەكی لەم جۆرە دەوروژێنێت: ژمارەكان (كە بە شێوەیەكی هەستەكی) بوونیان نییە، چۆن دەتوانن شتانێكیان لێوە پەیدا ببێ..؟ وەلێ فیساگۆرس هەرگیز نەیگوتووە شتە (هەستییەكان) لە ژمارەكانەوە پەیدا بوون، یان لە ژمارە دروست كراون، بەڵكو پێی وابووە شتەكان بەگوێرەی ژمارە پەیدابوون، بەو پێیەی سیستەم بە واتای یەكەمی خۆی تەنیا لە ژمارەدا هەیە، لەڕێگەی بەشداریكردن لە ژمارەكانیشدا شتەكان كە یەكەمجار دەردەكەون و پاشانیش بۆ جاری دووەم و چەندەهەم دەردەكەونەوە —بەجۆرێك دیاری دەكرێن كە دەتوانرێت بژمێردرێن»..[٥٧]

ئەوە ڕوونە "سیانۆ" لەم دەقەدا هەوڵیداوە ئەو بیرۆكەیەی فیساگۆرس شرۆڤە بكات كە دەڵێت: «جیهان ژمارەیە» خۆ ئەمە واتای ئەوە نییە جیهان لە ژمارەوە كەوتۆتەوە، وەك ئەوەی لای تالیس جیهان لە ئاوەوە دەرهاتووە، چونكە ئەوە دژوارییەك و بگرە كێشەیەكی سەخت دەوروژێنێت ئەویش پەیوندی ژمارەكانە بە شتە بەرهەستەكانەوە، ئایا ئەم پەیوەندییە بەندە لەسەر بنەمای لاساییكردنەوە Itationim، یاخود شتەكان لەگەڵ ژمارەكاند یەكیان گرتووە، یان لەنێویاندا لەخۆ گیراون؟!

خۆ ئەگەر زۆرینەی ڕاڤەكاران ئەوەیان پێ پەسەند بووبێت كە پەیوەندی نێوان شتە بەرهەستەكان و ژمارەكان بریتییە لە پەیوەندی لاسایی، ئەمەش لە پیوەندی یەككگرتن و لەخۆگرتن لەپێشترە «ئەوا ئەوان لەمەدا پشتیان بە وتەكانی سیانۆ Theano ی ژنی فیساگۆرس بەستووە، كە نامەیەكی دەبرێتەوە سەر تێیدا باسی لەوە كردووە گریك وایان لە فیساگۆرس بینیوە كە گوتوویەتی شتەكان لە ژمارەكان دروست كراون، ئەمە لەكاتێكدا ئەوەی ئەو گوتوویەتی ئەوەبووە شتەكان بەگوێرەی ژمارەكان دروست كراون[٥٨] یان تەنیا بەشێوەی ژمارەكان».

"سیانۆ" لە شرۆڤەکردنی ئەو بیرکەیە بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «کاتێك پرسیار لە سروشتی شتێك دەکەیت، دەتوانین یان بە هێڵکاریی وێنەیەکی لێکچووی شتەکە یان بە پێناساندنی ئەو شتە وەڵام بدەینەوە». فیساگۆرس ــ بە بۆچوونی سیانۆ ــ ویستوویەتی بەم گوزارەیەی پێشتری گوزارشت لە لێکچوونی شتەکان و ژمارەکان بکات. ئەمەش بریتییە لە وێناکردنی میتافیزیکی بۆ لاساییکردنەوە یان "لێکچوون"، شتەکان "لە ژمارەکان دەچن" یاخود "لاساییان دەکەنەوە". شتەکە کە بەشداری لەو سیستەم و هارمۆنیایە دەکات کە لە جیهاندا هەیە، جا ئەوە چ مادی بێت یان نامادی، ئەوا دەکرێت لە ریزبەندی و سیستەمێکدا لەگەڵ شتەکانی تردا بەدوای یەکدا بێن، دەکرێت بژمێردرێن. خۆ ئەگەر ژماردن و ژمێریاری بەگوێرەی ژمارەکان شیاو بێت «ئەوا یەکەم مانای ئەمە بریتییە لەوەی کە سیستەماتیکە، بەشدارە لەو سیستەمە گشتییەی لە گەردووندا هەیە».

وا پێدەچێ ئەرستۆ هیچ شتێکی لەبارەی ئەو دەقانە نەزانیبێت کە دەرکەوت هی "سیانۆ"ی ژنی فیساگۆرسن: چونکە لەبارەی فیساگۆرییەکانەوە دەڵێت ئەوانە: "تەنە سروشتییەکانیان لە ژمارەکان پێك هێناوە، شتە قورس و سووکەکان لە شتانێکەوە هاتوونەتە دەرێ کە نە سووکن و نە قورس»[٥٩].

ئەگەر ئێمە بەوردی شرۆڤەکانی "سیانۆ" و راڤەکانی بۆ هزرە سەرەکییەکانی فەلسەفەی فیساگۆری بخوێنینەوە، ئەوا بە رونی ئەوە دەردەکەوێت کە مەبەستی ئەم قوتابخانەیە ئەوەنییە کە بڵێت شتە مادییەکان یان فیزیکییەکان لە خودی ژمارەکانەوە پەیدابوون یان هاتوونەتە بوون، چونکە ژمارەکان ــدواجار ــ مادیی نین، بەڵکو بەزۆریی ژمارە ئەوەیە کە بەهۆیەوە دەتوانین شتێك لە شتێکی دیکە جیابکەینەوە، لەرێگەی سەرژمێریکردنی شتەکانەوە یەکەمجار، دووەمجار، سێیەمجار..هتد، دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە ئێمە توانای دیاریکردنی لایەنە جێگیرەکانی شتەکەمان هەیە، لێرەوە دەست پێدەکات و لەوێدا کۆتایی دێت، لەنێوان سەرەتا و کۆتاییشدا یەك بابەت بوونی هەیە، بەم جۆرەش دەبینین کاتێك شتەکان دەژمێرین ئەوا پەسنیشیان

دەدەین و ئەدگارەکانیشیان دیاری دەکەین. دەتوانین لەبارەی شتێکەوە بڵێین بابەتە، چونکە دەتوانین بیژمێرین[٦٠].

بەڵام "سیانۆ" تەنیا بە شرۆڤەکردن و راڤەکردنی فەلسەفەی فیساگۆریی و هەڵوێستی لەبارەی بیرکاری و جیهانەوە نەوەستاتەوە، بەڵکو گوازارشتگەلێکی دیکەش هەن کە دەدرێنەوە پاڵی و پەیوەستن بە دوو تیۆری بەناوبانگەوە لەبارەی فیساگۆریزمەوە:

یەکەم: نەمریی روح.

دووەم: دۆناودۆنی روحەکان.

"سیانۆ" وای بۆ دەچێ کە فیساگۆرییەکان باوەڕیان بە بوونی "دادگەریی خودایی" لە ژیانێکی تردا هەیە، وەك چۆن بڕوایشیان بە "دۆناودۆنی روحەکان" دوای مردن بۆ جەستەیەکی نوێ هەیە کە مەرج نییە جەستەیەکی مرۆیی بێت.

ئەم گووتانە وێنەیەکی سادەمان لەبارەی دۆناودۆنەوە پێدەدەن کە گەردوون بەهۆیەوە "هارمۆنیا" یاخود تەبایی خۆی، کە ونی کردووە، دەگێڕێتەوە. کاتێك تاك بەهۆی سەرپێچی لە یاسای ئاکارەکی بە درێژایی ژیانی، ئەم هارمۆنیایە تێکدەدات.

بەم جۆرە "سیانۆ" ئاکار، بەو جۆرەی کە لە جیهانی مرۆڤدا دەردەکەوێت، کۆسمۆلۆژیا بە خۆی و سیستەمەکەیەوە، لێك گرێ دەداتەوە، بنچینەی ئەم لێك گرێدانەش بریتییە لە جەختکردنەوە لەسەر جاویدبوونی روح. سیانۆ دەڵێت:

«گەر روح جاوید نەبێت ئەوا ژیان تەنیا دەبێتە بەزمەساتی خراپەکاران، ئەوانەی کە دەمرن دوای ئەوەی ژیانێکی ستەمکارانە و ناشەریفانە ژیاون»..[٦١]

سیانۆ وای دەبینێت کە هەموو شتێك لە گەردووندا رێکخراو و رێك و پێکە، هەموو شتێك شوێنگەیەکی دیاریکراوی تایبەتی هەیە، رۆڵەکەی نەخشەکێشراوە، ئەرکەکەیشی بۆ دەستنیشان کراوە ئەوەش بەپێی یاسایەك ئەنجامی دەدات، لە گەردوونێکی "گونجاو"دا کە "هارمۆنیا" تێیدا زاڵە و یاساکانی سروشت، لۆژیك و

یاساکانی ئاکار و ئایین بەڕێوەی دەبەن، بەڵام خراپە و کردەوە نائاکارییەکان دژ بەم یاسایانە دەوەستنەوە، بەوەش دەبنە هۆی پشێوی و پارچەبوون لە جیهاندا.

لای سیانۆ «ئەگەر ئێمە گوتمان روح جاوید نییە، بە لەنێوچوونی جەستە ئەویش لەنێو بچووایە، مانای وایە ئەو کەسانەی کە دەبنە هۆی پشێوی، لە ماوەی ژیانیاندا بە رەفتارە خراپەکانیان سیستەمەکە تێکدەدەن، لەسەر کردارەکانیان سزا وەرناگرن، بەڵکو بەرهەمی گەشتێکی لەخۆڕای ژیانیان دەچنەوە، وەلێ سیستەمی گەردوون دەشێوێنن. ئەگەر ئێمە دەمانەوێت "هارمۆنیا" یان تەبایی بۆ شتەکان بگێڕینەوە، هاوسەنگیش لەنێوان دیاردەکانی گەردووندا رابگرین، ئەوا دەبێت نەمریی روح بسەلمێنین، ئەم پرسە تەنیا پرسێکی ئەخلاقی نییە، بەڵکو کۆسمۆلۆژیشە، کە ئێمە دەتوانین سیستەم و "هارمۆنیا" بگێڕینەوە ئەگەر لەو کاتەدا مەزەندەی سزامان کرد بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی لە یاسای ئاکاریی دەکەن، یان خراپەکارن بەرامبەر مافی ئەوانی تر، یاخود بە گشتی بڵێین سزای کەسی نائاکاری. لێرەدا سزا واتە سەرلەنوێ لەدایکبوونەوە بۆئەوەی ئەمجارەیان روحی ئەو کەسە نەچێتەوە روحی کەسێك یان لە جەستەیەکی مرۆییدا خۆی بەرجەستە نەکاتەوە، بەڵکو دۆناودۆن ئەبێت بۆ هەبوویەکی نزمتر لە بوونەوەری مرۆیی، بۆ نموونە ئاژەڵ، بەم جۆرە دەبێت لە ژیانەکەی تردا بەشێوەیەکی دنیاییانە بژی وەك ئەوەی یاسای ئاکار لێی دەخوازێت»[٦٢].

وێڕای ئەوەش چەند دەربڕینێکی تر لە گوتەکانی سیانۆ ماونەتەوە کە هەڵوێستی فیساگۆرییەکان بەرامبەر بە ژن دەردەخەن، کە دەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە[٦٣]:

١- چالاکی سێکسیی ژن دەبێت لە چێژپێدانی مێرددا کورت ببێتەوە، ئینجا نابێت ژنەکە دۆستی تری هەبێت.

٢- نابێت —لە کاتی هاوسەرگیریدا ــ داوێنپاکی و فەزیلەت لەگەڵ تەقەشوف و خۆگرتنەوە لە سێسکردندا دیاری بکرێت، ئەمە لێکدانەوەیەکی هەڵەیە بۆ داوێنپاکی.

٣- ڕۆژێك لە ڕۆژان پرسییان لە ژنە مامۆستایەکی فیساگۆر ی بەناوی"سیانۆ": دەبێت چەند ڕۆژ بەسەر سەرجێیکردنی ژندا تێپەڕ بێت تا جارێکی تر "پاك بێتەوە"؟! سیانۆ وەڵامی دایەوە: ئەگەر سەرجێیی لەگەڵ مێردەکەی خۆیدا بکات ئەوا بە بەردەوامی هەر بە "پاکی" دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر سێکس لەگەڵ کەسێکی تردا بکات ئەوا هەرگیز پاك نابێتەوە.

٤- هەر هەمان ڕۆژ ژنێکی دیکە لێی پرسی: ئەرکە سەپێنراوەکان بەسەر ژنی شووکردوودا چین؟

سیانۆ وەڵامی دایەوە: «چێژپێدان و دڵخۆشکردنی مێردەکەی».

٥- سیانۆ وای بۆ دەچێ خۆشەویستی ڕۆمانسی هیچ نییە جگە لە «مەیلێکی سروشتی بۆ دەروونێکی وشکی خاڵی».

لە ڕاستیدا گوزارشتە ئەخلاقییەکانی "سیانۆ"، گوتەکانی لەبارەی فەزیلەتەکانی ژن و پەیوەندیی بە مێردەکەیەوە ــ ڕەنگە لەبەر ڕۆشناسی گوتەکانی "ژنە فەیلەسووفەکان"ی فیساگۆریزمی پاشین باشتر لێیان تێبگەین وەکو: فینتس Phintys، سیانۆی دووەم، پێریکیتۆنی Perictione، ئیزارا لۆکانی و ..هتد، ئەمانە لە کتێبەکانیاندا ئەوەیان دەرخستووە کە تیۆرە فیساگۆرییەکان بەسەر ژیانی خێزانی و کەسەکیدا پراکتیزە کراون. خۆ ئەگەر فەزیلەتی گونجاو بۆ ژن بریتی بێت لە داوێنپاکی، ئەوا بەرپرسیارێتی پشت ئەستوورکردنی یاسا، دووپاتکردنەوەی دادگەری، وەدیهێنانی هارمۆنیای (یان تەبایی) لەنێو ماڵ و ئەندامەکانی خێزاندا دەکەوێتە ئەستۆ، بە گوێرەی ئەوەی ئیزارا لۆکانیش دەیڵێت، ماڵ بە نیسبەت دەوڵەتەوە جیهانی چکۆلەیە Microcosm، لەمەشەوە ژن بەرسیارێتییەکی سەختی دەکەوێتە سەر شان لە ڕەخساندنی کەشی لەباردا کە وەدیهێنەری هارمۆنیا و سیستەم و تەبابوون و یاسا، ئینجا عەدالەت لە دەوڵەتدا بێت. بێگومان ئەو ژنەی کە بە باشی ئاگای لەم حەقیقەتە نییە بەشداری لە فەوزا و پشێوی و پارچەبوون و ڕوودانی بێ سەروبەری Chaos لە گەردووندا دەکات.

ئەوەندە بەسە ئەم بەشە بە گوزارشتێك كۆتايی پێ بهێنین كە "سیانۆ" ئاراستەی ژنی دەكات، بانگێكە بۆ هەموو مێینەیەك لە هەر كوێ بن:

«گەر بەسەر پشتی ئەسپێكی سەركێشەوە بیت، باشترە بۆت لەوەی ژنێك بیت و بیرنەكەیتەوە».

## دووەم: ئەریگنۆت Arignote

ژنە فەیلەسووفێكی فیساگۆری بوو (دەوروبەری ٥٠٠ پ.ز) "میناج Menages" لە كتێبەكەیدا لەبارەی فەیلەسووفە ژنەكانەوە وا دەگێڕێتەوە كە كچی فیساگۆرس بووە لە سیانۆ. لە قوتابخانەكەی كرۆتۆن Crotonی باشووی ئیتالیادا لەدایك بووە. هەروەها دەگێڕێتەوە كە ژمارەیەك كتێبی نووسیوە، لەنێوانیشیاندا وتە بەناوبانگەكان لەبارەی سیرس Ceresـی خواوەندەوە[٦٤]، "نهێنییەكانی باخوسی خواوەند"[٦٥]، هەروەها لەبارەی "دیۆنیزۆس"ــەوە. بەپێی بیروباوەڕی فیساگۆری كە وایدەبینێت سروشتی گەردوون لە جەوهەریدا بیركارییانەیە، رێكخراو و رێك و پێك و تەبایە ــ ئەوا "ئەریگنۆت" لەم جەوهەرەی جیهان دەكۆڵێتەوە، دەڵێت:

«چییەتی سەرمەدیی ژمارە بریتییە لە هۆكاری سەرەكی بوونی ئاسمان و زەمین، هەموو ئەو شتانەیشی كە لەنێوانیادایە، هەر وەك چۆن بریتییە لە ریشە یەكەمییەكانی بوونی بەردەوامی خوداكان و روحەكان، هەموو پیاوە پیرۆزەكانیش»..[٦٦].

شرۆڤەی "ئەریگنۆت" بۆ چییەتی ژمارە یەكدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو شرۆڤانەی كە پێشتر "سیانۆ"ی دایكی باسی كردبوون، لەو رووەی كە هەر بوونێك و هەر واقیعێك دەتوانین لەگەڵ شتەكانی تردا لە رێگەی ژمارەوە لێكیان جودا بكەینەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ماهییەتی سەرمەدیی ژمارە ـبەشێوەیەكی راستەوخۆ ــ پەیوەستە بە بوونی شتە جیاوازەكان، بەڵام تەباكانەوە. دەتوانین بە پەیوەندییە بیركارییەكان گوزارشت لەم تەباییە بكەین. بەم دوو رێگەیە بۆمان روون دەبێتەوە كە ژمارەكان هۆكاری هەموو شتێكن، بێ ژمارە ناتوانین "بژمێرین" و "سەرژمێریی" بكەین. هەروەها نەماندەتوانی

بژمێرین و وەسف بکەین و پلان دابڕێژین، یان نەماندەتوانی ئەدگاری شتێك دیاری بکەین، یاخود شتەکان لێك جیا بکەینەوە، بۆیە ژمارە بریتییە لە گوزارشتکردن بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە پەیوەندی نێوان شتەکان[٦٧].

## سێیەم: میبا..Myia

فەیلەسووفێکی فیساگۆری بوو (دەوروبەری ٥٠٠ پ. ز)، "میناج" لەکتێبی مێژووی ژنە فەیلەسووفەکاندا باس لەوە دەکات کە یەکێك لە کچەکانی فیساگۆرس و سیانۆ بووە.. شووی بە یەکێك لە پاڵەوانە وەرزشییەکان کردووە بە ناوی "میلۆ Milo"، کە پاڵەوانێکی وەرزشی کرۆتۆن بووە.

"میبا"ش وەك ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکانی تر لەبارەی "هارمۆنیا Harmonia" یان گونجان و تەباییەوە لەژیانی ژندا نووسیویەتی. میبا نامەیەکی درێژی بۆ فیلیس Phylis نووسیوە کە تێیدا بایەخی تەبایی و گونجان تاوتوێ دەکات، چۆنێتی پراکتیزەکردنی ئەو بنەمایە بەسەر چاودێریکردن و پەروەردەی منداڵدا، بایەخی پڕکردنەوەی پێویستییەکانی وەچەی نوێ بەگوێرەی ئەم بنەمایە، تاوتوێ دەکات. وا دەردەکەوێت ئەو خاڵە گرنگەی ئاماژەی پێ دەدات ئەوەیە کە وەچە نوێیەکە —بە سروشتی خۆی — ئەوە دەخوازێت کە گونجاوە لەگەڵ پێویستییەکانی خۆیدا، پێویستیشی بە میانەڕەوی و نێوانگیرییە، نە خواردنی زۆر و نە خواردنی کەم، نە پۆشاکی ئەستوور و نە پۆشاکی تەنك، نە هەوای گەرم و نە هەوای سارد..هتد.

ڕاستییەکەی ئەوەی لە نامەکەی ئەودا بە چێژە وێناکردنییەتی بۆ وەچەیەکی میانەڕەو کە لە هیچ شتێکدا زیادەڕوی و کورتهێنانی ناوێت، وەکو ئەوەی کە وەچە نوێیەکە لە هەموو شتێکدا خوازیاری میانەڕەوییە و لە هەموو شتێکدا حەز بە نێوانگیری دەکات هەر لەبەر ئەم هۆکارەش دایك —دایکێکی تازەکار کە شارەزاییەکی ئەوتۆی لە دایکایەتی نەبێت — دەبێت کۆرپەکەی بسپێرێ بە دایەنێك یان پەرستارێکی میانەڕەو لە ڕەفتاریدا، بۆیە پێویستە ئەم پەرستارە لە نوستن، لە خواردن، لە شەراب و

..هتد دەستبلاو (مەسرەفگەر) نەبێت، وەك چۆن پێویستە مومارەسەی سێکسی لەگەڵ مێردەکەیدا کەم بکاتەوە (ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە سکپڕی ڕێ دەگرێ لە شیرپێدان یان کەمی دەکاتەوە)، بە کورتی: دەبێت هەموو شتێك بە شێوەیەکی باش ئەنجام بدات، لە کاتێکی گونجاودا، ئەو کارە بکات کە بۆ منداڵەکە باشە، دەبێت لە پێویستییەکانی خۆی بکاتەوە تا بتوانێت بەشداری بکات لە خواردن پێدان و تێرکردنی وەچە نوێیەکە و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی بەشێوەیەکی باش.

چەند دەقێك لە نامەکەی مییا Myia بۆ فیلیس Phylis:

«لە مییاوە بۆ فیلیس...

سلاو

ڕێم بدە، بە بۆنەی ئەوەی کە بوویت بە دایك، ئەم ئامۆژگارییانەت پێشکەش بکەم:

"دەبێت بۆ وەچە نوێیەکە دایەنێك یان پەرستارێك هەڵبژێریت کە پاك و خاوێن بێت، نیازی باش بێت، تەنیا چاکەی کۆرپەکەی بوێت. ژنێك هەڵبژێرە خاکەڕا بێت، تەنانەت خاکەڕاترین بێت، ئیسراف لە نووستن یان خواردنەوەدا نەکات. ژنێکی لەم جۆرە باشترە لەوەی کە هیوای بۆ دەخوازیت بۆ پێگەیاندنی منداڵەکانت بەڕێگەیەکی گونجاو لە قۆناغەکانی تەمەنیدا، هەڵبەت بە مەرجێك کە شیری پێویستی هەبێت بۆ تێرکردنی منداڵە شیرەخۆرەکە، هەر وەك پێویستە ژنێکی زاڵ نەبێت بەسەر مێردەکەیدا تا هەر کات ویستی سەرجێی لەگەڵ مێردەکەیدا بکات، چونکە بێ گومان پەرستار ڕۆڵێکی دیار دەگێڕێت لەم قۆناغە یەکەمەی ژیانی منداڵدا و کاریگەری لە هەموو تەمەنی منداڵەکە دەکات، پێویستیشە خواردنی پێ بدات و تێری بکات، لە زەینیشیدا باشترین وێنە دروست بکات، بەپێی بارودۆخیش خواردنی پێ نەدات، بەڵکو بەپێی روانگە و سەلیقە و بەکارهێنانی هزر بێت، بەوەش منداڵەکە خاوەنی تەندروستییەکی باش و لەشێکی ساغ دەبێت، دەبێت پەرستار هەر کات چاوی نیشت بۆ خەو نەنوێت، بەڵکو ئەو کاتە بخەوێت کە منداڵەکە حەز بە پشوو دەکات، نابێت سروشتی توندوتیژ

بێت، زوو تووڕە بێت، زۆر بڵێ بێت. هەروەها نابێت لە خوارندا نەوسن بێت و هەر شتێکی کەوتە بەردەست بیخوات یان هەموو شتێك بخوات بەڵکو دەبێت کاتەکانی خواردنی ڕێکخراو بێت و لە بڕی خواردنیشدا مامناوەند بێت، ئەگەر دەستبدا باشترە ژنێکی یۆنانی بێت نەك بێگانە. وا باشتریشە دوای شیرپێدان و تێرکردنی منداڵەکە لە شیر وای لێ بکات زۆر بخەوێت، چونکە پشوو لەو کاتەدا بۆ ئەو چێژی هەیە. دەبێت هەرسکردنی خوارنەکان ئاسان بێت، خۆ ئەگەر چەندین جۆری خواردن هەبوون، دەبێت ئەو بە پێی پێویست خواردنی سادەی پێ بدات، یاخود تێکەڵ بە شیری ئێوارانی بکات، دەبێت بە بەردەوامی وا لە منداڵەکە نەکات خۆی بشوات، بەڵکو میانەگیری لە خۆشتندا باشترە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەبێت هەوا مامناوەند بێت، نە گەرم بێت و نە سارد بێت، وەك چۆن پێویستە ماڵ لە هەر چوار لایەوە کراوە نەبێت و بە تەواویش داخراو نەبێت، هەروەها دەبێت ئاویش نە گەرم بێت و نە سارد، جلەکانی نوستنیش نابێت زبر بن، بەڵکو دەبێت لەگەڵ پێویستی منداڵەکە بگونجێ و بێزاری نەکات. لە هەموو ئەمانەشدا سروشت مەیلی بۆ ئەو شتانە هەیە کە گونجاو و شیاو و مامناوەندە، نەك بۆ شتێك کە ئیسراف و زێدەڕەوی تێدایە.

ئەمانە ئەو شتانە بوون کە بەلای منەوە بەسوودن، پێویست بوو ئەمڕۆ لەبارەیانەوە بۆت بنوسم، تۆش بە پێی ئەم سیفەتانە بەدوای پەرستار یان دایەنێکدا بگەڕێیت. بە پشتیوانی خودا شتانێکی گونجاو و ڕێنمایی ئاسانت بۆ باس دەکەین، کە پەیوەستن بە پێگەیاندنی منداڵەوە لە قۆناغەکانی دواتری تەمەنیدا..."»[٦٨].

ڕەنگە خوێنەر سەری سوڕبمێنێ لە توانای "میبیا" بۆ پراکتیزەکردنی بیرۆکەی میانەڕەوی بەم شێوەیە لە بواری پەروەردەدا، ئەو نامەکەی بەم گوتەیە کۆتایی پێ دێنێت:

«ئەمانە ئەو بابەتانە بوون کە پێدەچێ بە سوود بن لەم کاتەدا لەبارەیانەوە بۆت بنووسم، ئەوەندەی گوتم بەسە، تەنانەت لە ئامۆژگاریکردنیشدا میانەڕەوی هەیە».. بەڵام میبیا بەڵێی بە فیلیس داوە کە جارێکی تر نامەی تری بۆ بنوسێت، کە وای بینیوە

باشتره وردەکاری زیاتری لەبارەی هارمۆنیا و سازانەوە لە پەروەردەکردنی منداڵدا بۆ باس بکات.

ئەم گوتەیەی کۆتایی ئەو ئەنجامە دەدا بە دەستەوە کە ژنە فیساگۆرییەکان چەندە بە پوختی و ڕێکی، لە میانەی نامە و دەقەکانیاندا، ئیشیان کردووە. بیرۆکەیەکی دیاریکراو هەیە کە نامەکانی "میىا" بە ئاراستەیەکی باشدا دەبات، هەروەك ئەمەش لە نامەکانی سیانۆی دووەم و فراگمێنتەکانی پێرکتیونی یەکەم و فینتیس Phintys یشـدا دەردەکەون، ئەویش بریتییە لەوەی کە ئەرکی ئەوانە وەك ژنانێکی فەیلەسووف زانیاری بە ژنانی تر بدەن کە پێویستییان بە چییە، لە کاروبارەکانی پەروەردەدا ڕێنماییان بکەن، فێریان بکەن کە دەکرێت چۆن «لە ژیانێکی پڕ لە هارمۆنیا و تەباییدا بژین». یان وەك دواتر "ئیزارا" دەڵێت «چۆن عەدالەت و سازان و تەبایی لە روحیاندا و لە ماڵیاندا دروست دەکەن».

هەرەوەها ئەرکی فەیلەسووفە پیاوەکانە پیاوانی تر فێری ئەو شتانە بکەن کە پێویستە فێری ببن، بۆ ئەوەی لە ژیانێکی تەبادا بژین و عەدالەت، سازان و تەبایی لە روحیاندا و لە دەوڵەتیاندا وەدی بێنن. ئەمەش ئەو ئەرکەیە کە لە لایەنێکییەوە راڤەی پاساوەکانی تێڕوانینی "واقیعی" فەلسەفەی ئاکاریی لای ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکان، تێڕوانینی "ئایدیالی"لای پیاوەکان دەکات —هەورەك لە لایەنێکی تریشەوە پەسنیان دەدات ـــ . هەر گروپێك روانگەی تایبەت بەخۆی هەبووە. چونکە سروشتی ژنان جیاوازە لە سروشتی پیاوان. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە فیساگۆریزم دانی پێدا ناوە بەڵام بە بێ هیچ کەمکردنەوەیەك لە بایەخی ژن، یان رەتکردنەوەی رۆڵی، یان هێنانە خوارەوەی بەهای ژن.

# کۆتایی

دەبێت لە کۆتایی ئەم بەشەدا خوێنەر زۆر باش ئاگاداری هەندێك خاڵی گرنگ بێت، کە رەنگە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە لەناخیدا دروست بوون:

١- ئێستە ئێمە لە سەدەی شەشەمی پێش لەدایکبوونی مەسیحداین کە کتێب و دانراوی فەیلەسووفەکان لە گۆڕێدا نەبوون، بەڵکو تەنیا کۆمەڵە فراگمێنتێك دەبینینەوە کە لە تەواوی فەلسەفەکانیان بەجێ ماون.

٢- ئەگەر خوێنەر بپرسێ: بەڵام ئەکرێت ئەم گوزارشتە سادانە فەلسەفە بن؟ وەڵامان دوو بەشە:

أ- خودی فیساگۆرس بە گوزارشتگەلی سادەی وەك: "جیهان ژمارە و سازانە" و..هتد، گوزاشتی لە فەلسەفەکەی کردووە.

ب- قوتابخانەی ئەیۆنی (تالیس و قوتابخانەکەی) هیچیان لێ نەماوەتەوە جگە لە گوزارشتگەلێکی زۆر سادەی وەکو: "ئاو سەرچاوەی شتەکانە" یاخود "هەوا بنەمای یەکەمی هەموو شتێکە"..هتد.

٣- کاتێك "سیانۆ" گوتەی مێردەکەی "شتەکان لە ژمارەوە پەیدابوون" روون دەکاتەوە یاخود شرۆڤە و راڤە دەکات، ئاڵۆزی و لێڵییەکانی ئەم گوزارەیە لادەبات، بۆ ئەوەی نەفی ئەوە بکاتەوە کە ئەمە بە مانای "ئافراندن"ی شتە مادییەکانە لە ژمارەوە، کە ژمارە هەبوویەکی عەقڵی نا هەستەکییە، پێی وایە مەبەستی "فیساگۆرس" ئەوەبوو کە شتەکان بەشێوەی یان بەگوێرەی ژمارەکان پەیدابوون، یان شتەکان لاسایی ژمارەکانیان کردۆتەوە.. هتد. ئەمانە تەنیا گوزاشتگەلێکی گشتی و سەرپێی نین، بەڵکو بە واتای وشە فەلسەفەن.

٤- کاتێك "سیانۆ" بیرۆکەی "هارمۆنیا" و تەبایی لە گەردووندا بۆ ژیانی مرۆڤ درێژ دەکاتەوە، پێی وایە مرۆڤی خراپەکار سیستەمی جیهان تێك دەدات و

فەوزای تێدا دروست دەکات، ئەوا بەوە گوزارشت لە میتافیزیکایەکی گشتگیر دەکات کە سروشت و مرۆڤ پێکەوە لە یەك بیرۆکەی سەرەکیدا کۆدەکاتەوە.

٥- "سیانۆ" هەوڵیشیدا بۆ هەڵسەنگاندنی "نەمریی روح" لەسەر بنەمای هەمان بیرۆکە، بۆیە پێویست دەروون نەمر بێت یان روح نەمر بێت و بە لەنێوچوونی جەستە لەنێو نەچێت، تا سزای خۆی بچێژێت و بەوەش سیستەم یان "هارمۆنیا" بۆ جیهان بگێڕینەوە، کاتێك ئەو کەسە بە سەرپێچیکردنی یاسای ئاکاریی شێواندبووی.

٦- ئەگەر دەروون نەمر بێت، ئامانجیش لەمە سزادانی خراپکار وسەرپێچیکەران بێت، ئەوا پێویستە بڕواش بە دۆناودۆنی روحەکان بهێنین، واتە گواستنەوەیان لە دوای مردن لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر، لێرەوە تاوانبار دەشێت روحی ئازار بچێژێت بەوەی کە دوای مردنی، بۆ نموونە، روحەکەی بچێتە بیچمی سەگێکەوە!

ئەگەر ئەمە فەلسەفەیەکی تەواو نەبێت کە سروشت و مرۆڤ و ئایین کۆدەکاتەوە، ئەگەر خاوەنەکەیشی "فەیلەسووف" نەبێت، ئەی چی ناو بنێین؟!

# بەشی سێیەم

## ژنە فەیلەسووفەکانی فیساگۆریزمی پاشین

- ئیزارا لۆکانی Aesara of Lucania
- فینتسی سپارتی Phintys of Sparta
- پێرکتیۆنی یەکەم Perictione

(ئەگەر دەروونمان شی کردەوە، ئەوا لەسەر ئاستی تاکی و خێزانی و کۆمەڵایەتی،
لە یاسا و عەدالەت تێدەگەین)
ئیزارا.. Aesara

## دەستپێك

لەم بەشەدا سێ ژنە فەیلەسووف لە فیساگۆریزمی پاشین دەخەینەڕوو کە بە نزیکەیی لە دوو سەدە پاش فیساگۆریزمی یەکەم سەریهەڵدا، ئەوانیش:

١- "ئیزارا لۆکانی" کە بیرۆکەی یاسای سروشتی درێژ کردەوە بۆ ئەوەی سێ کایەی دیکەش بگرێتەوە: بواری تاکەکەس، بواری خێزان، پاشان بواری دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها چەند دەقێکیش لە کتێبەکەی "لەبارەی سروشتی مرۆییەوە" دەخەینەڕوو، تا هەوڵەکەی ببینین بۆ پراکتیزەکردنی یاسای ئەخلاقی لەو سێ بوارەی پێشوودا، پشت ئەستوور بە دابەشکردنی سیانەکییانەی دەروونی مرۆیی.

٢- هەروەها باس لە ژنە فیساگۆرییەکی تر دەکەین ئەویش "فینتسی سپارتەیی" کە کتێبێکی داناوە لەبارەی "میانڕەوی لای ژنان" و هیچیمان بۆ نەماوەتەوە جگە لە دوو فراگمێنت ــ لە زۆر حاڵەتدا ئەمە لە فەیلەسووفە پیاوەکانیش روویداوە کە کتێبەکانیان ون بوون و هچیان لێ نەماوەتەوە جگە لە چەند فراگمێنتێکی کەم ــ، ئەو لەو فراگمێنتانەدا کە لە کتێبەکەی ماوەتەوە بایەخ بە ئاراستەکردنی ژن دەدا بۆ میانەگیری لە هەموو شتێکدا، چ لە خواردن، یان خواردنەوە، یان توانای جەستەیی، تەنانەت لە سروت و ریتواڵە ئاینییەکانیشدا.

٣- ژنە فیساگۆریی سێیەم "پێرکتیۆنی یەکەم"ـە، کە کتێبێکی نووسیوە بەناوی "هارمۆنیای ژن"، ئەم ژنە "برکتیۆنی دووەم" نییە کە کتێبێکی بەناونیشانی "سوفیاس Sophias" واتە لەبارەی فەرمانڕەواییەوە، نووسیوە، رەنگە بابەتی سەرەکی لەم کتێبەدا ئەرکەکانی ژن بێت لە خێزاندا و بەتایبەتیش بەرامبەر دایك و باوکی و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی و ..هتد.

ڕەنگە خوێنەر سەری بسوڕمێت لەوەی کە ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکان دانیان ناوە بە ڕەوشی نزمی ژندا لە ملکەچکردنیدا بۆ پیاو بەچاوپۆشین لە "چلێسییەکەی"، کە لەو کاتەدا لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا باو بووە، تەنانەت ژنی فیساگۆری بۆتە "نموونەی ژنێکی نموونەیی" و بە گشتی ژنێکی ئایدیالی، بەڵام ڕەنگە مایەی سەرسوڕمانی زیاتر بێت ئەگەر بڵێین کە ئەرستۆش کاتێك تیۆرەکەی لەبارەی "کۆیلایەتی"ـیەوە دانا دۆخی نزمی پیاوی پێ پەسەند بووە، ئەوەش ڕێگر نەبووە لەوەی کە ببێتە گەورەترین فەیلەسووف لە جیهانی کۆندا.

ئامانج لە خستنەڕووی ئەم نموونانە دەرخستنی توانای ژنە بۆ فەلسەفاندن، بە چاوپۆشین لەو بابەتەی کە دەیکاتە بابەتی بیرکردنەوەی خۆی. پێم وایە خوێنەر سەرنج لەوە دەدات کە ژن —تەنانەت لەو ڕەوشە نزمەیشدا — چ توانایەکی عەقڵیی هەبووە. ئەوەندە بەسە بڵێین "بێرکتیۆنی دووەم" لە کتێبەکەیدا لەبارەی "حیکمەت"ـەوە، بانگەشە بۆ تیڕامانی تیۆری لە گەردوون دەکات. وەك چۆن سیانۆی دووەم دیالۆگەکانی ئەفلاتۆن دەخوێنێتەوە و لەگەڵ هاوڕێکانیدا تاوتوێیان دەکات، بەتایبەتی دیالۆگی "پارمەندیس" کە هەرە قورسترینیانە.

## یەکەم: ئیزارا Aesara

### ١-  ژیان و بەرهەمەکانی

ژنە فەیلەسوفێکی فیساگۆری بوو (دەوروبەری ٤٠٠ ــ ٣٠٠ پ.ز) لە لۆکانیا Lucania لەدایك بووە، کە هەرێمێکی کۆن بووە لە بەشی باشووری ئیتالیا، کە بەر لەوەی لۆکانییەکان لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا داگیری بکەن، لەژێر بالأدەستی یۆنانییەکاندا بوو. ئارکیۆلۆژیا نوێیەکان دەڵێن کە ئەم هەرێمە گەیشتۆتە ئاستی شارستانیێتییەکی دێرین.

هیچ شتێك لەبارەی ژیانی ئەم فەیلەسووفەوە نازانین، هەموو ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کە کتێبێکی داناوە بە ناوی "لەبارەی سروشتی مرۆییەوە On Human Nature"، جگە لە چەند فراگمێنێتێکی کەم شتێکی لێ نەماوەتەوە، ئەگەرچی ئەم فراگمێنتانە کۆمەڵێك کلیلی گرنگمان پێدەدا بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی: فینتسی سپارتەیی، بێرکتیۆنی، سیانۆی دووەم.

"ئیزارا" پەیڕەوی لە دیدگای تیۆری حەدسی لەبارەی یاسای سروشتییەوە دەکات، پێی وایە کاتێك ئێمە خۆمان هەڵدەهێنجێنین یاخود ناوەکییانە لە سروشتی مرۆییمان، بە تایبەتیش سروشتی "دەروونی مرۆیی"ـیمان، رادەمێنین ئەوا ئەتوانین بە بونیادی ئاکاریی، یاسای پۆزەتیڤی، پزیشکیش ئاشنا بین.

تیۆری یاسای سروشتی لای "ئیزارا" لە دەوری ئەو یاسایانە دەسووڕێنەوە کە سێ بوار بەڕێوە دەبەن، ئەوانیش: بواری یاسای ئاکاری لای تاکەکەس یان ئەوەی پێی دەکوترێت ئاکاریی تایبەت، بواری یاسای ئاکاریی لە چوارچێوەی خێزاندا، بواری یاسای ئاکاریی کە دام و دەزگاکان بەڕێوە دەبات. لەمەشەوە لە سروشتی یاسا و سروشتی عەدالەت لەسەر ئاستەکانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە تێدەگەین.

وا لە خوارەوە ئەو دەقەی لە کتێبەکەی ماوەتەوە، دەخەینەڕوو:

## ٢- دەقێك لە كتێبی "لەبارەی سروشتی مرۆییەوە"..

بە قەڵەمی ژنە فەیلەسووفی فیساگۆری "ئیزارا لۆكانی"

«پێم وایە سروشتی مرۆیی كۆمەڵێك پێوەرمان دەخاتە بەردەست لەبارەی یاسا و عەدالەتەوە لە بواری ماڵ و دەوڵەتدا لە یەك كاتدا، ئەوەی لە ناخی خۆیدا بگەڕێت ئەوا یاساكان لە ناخی خۆیدا دەدۆزێتەوە، ئەوەش دەزانێت كە عەدالەت لە ناوەوەیدایە، ئەم یاسایە رێكخستنێكی رێك و پێكی دەروونە. كاتێكیش دەروونی مرۆیی سێ لایەنەیە ئەوا بەپێی سێ ئەركیش رێكدەخرێت، ئەوانیش: وەزیفەی عەقڵ یان زەین Mind، كە تایبەتە بە حوكمدان و بیركردنەوە، وەزیفەی روحی باڵا كە تایبەتە بە هێز و توانا، دواجاریش وەزیفەی ئارەزوو كە تایبەتە بە خۆشەویستی و سۆز. ئەم وەزیفانە بەجۆرێك رێكخراون كە وەزیفەكەی خوارەوەیان بەرفەرمان یان حوكمكراوە. بەڵام ئەو وەزیفەیەی كە كەوتە ناوەندەوە لە یەك كاتدا هەم فەرمانڕەوایە و هەم بەرفەرمانیشە.

بەم جۆرە دەبینین كە خودا ئەم وەزیفانەی دروست كردووە و بە گوێرەی بنەمایەك رێكی خستوون كە پایەی مرۆڤ تەواو دەكەن: چونكە ویستوویەتی تەنیا مرۆڤ دەست بە یاسا و عەدالەتەوە بگرن بێ ئەوەی ئەم حاڵەتە لای بوونەوەر و ئاژەڵەكانی تر بوونی هەبێت. یەكەی پەیوەستبوونێكی پێكهاتەیی نە دەتوانێت لە شتێكی تاكدا دەركەوێت، نە لە شتێكی فرەی یەك شێوەشدا. (تا ئەو جێیەی شتەكان جیاوان، ئەوا دەبێت بەشەكانی دەروونیش جیاواز بن، وەك چۆن ئەمە لە جەستەدا هەیە، كاتێك دەبینین ئەندامەكانی بەركەوتن و بینین و بیستن و تامكردن و بۆنكردن جیاوازن: چونكە ئەم ئەندامانە هەر هەموویان یەك پەیوەندییان بە شتەكانی ترەوە نییە).

نەخێر، ناكرێت ئەم یەكێتییە لە شتە لێكنەچووەكاندا —بە هەر چەشنێك ئارەزوویان بوو ـــ دەربكەون، بەڵكو بە زۆریی لە بەشگەلێكدا دەردەكەون كە بەگوێرەی شیاوێتی هەر یەكەیان بۆ سەرجەمی گشت و لە تەكدا گونجان و تەواوكردنی پێكهاتوون، بە تەنیا دەروونیش نیە كە لە بەشگەلێكی فرەی لێكنەچوو پێكدێت،

بەڵكو ئەوە بە گوێرەی وێكهاتنەوەی لەگەڵ گشتدا پێكدێت، وێڕای ئەوەش ئەم بەشانە لەخۆوە، بە ئارەزووی خۆیان، ریز نەبوون، بەڵكو بە گوێرەی ئاگایی عەقڵی ریز بوون.

ئەمەش لەبەرئەوەی ئەگەر ئەم بەشانە هەمان رێژەی یەكسانیان لە شەرەف و هێزدا هەبێت، كە خۆیان نایەكسانن ــ بەشێكیان نزمە و بەشێكیان بەرزە و بەشی سێیەمیش دەكەوێتە نێوانیانەوە ــ من ئەڵێم وێڕای ئەوەی كە بەشەكانی دەروون بەم شێوەیە نایەكسانن، ئەوا پەیوەندی نێوانیان هەرگیز ناكرێت هاوتوانست بێت. بەڵام تەنانەت ئەگەر هەر یەكێكیان خاوەن رێژەیەكی نایەكسان بێت بەجۆرێك كە خراپەكەیان نەك باشەكەیان رێژەیەكی زیاتریشی هەبێت ــ ئەوا ئەمە دەبێتە مایەی شپرزەیی دەروون، تەنانەت ئەگەر بەشە باشەكەیان رادەیەكی زۆرتر و بەشە خراپەكەشیان رادەیەكی كەمتریان بەر بكەوێت، بەڵام ئەگەر بێتوو بە رێژەی گونجاو دابەش نەبن ئەوا كۆدەنگی و هاوڕێیەتی و عەدالەت لە ناو دەروونداا دروست نابن، كەچی تا ئەو كاتەی هەر ئەندامێك رێژەی گونجاوی خۆی بەر بكەوێت ئەو كاتە ئەتوانم دڵنیات بكەمەوە كە ئەم جۆرە رێكخستنە عەدالەت وەدیدێنێت.

لە راستیدا كۆدەنگییەكی دیاریكراو و رێكەوتنێك لە هەستكردنەكاندا هەیە كە یاوەری ئەم رێكخستنەیە. بەم جۆرە رێكخستنە دەڵێن "سیستەمی چاكە" ئەمەش هەقی خۆیەتی، بەهۆی ئەوەی كە بەشە باشەكەی دەروون دەبێتە فەرمانڕەوا و بەشەكەی خوارەوەش بەرفەرمان، هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و سۆزداری لەم بەشانە دەكەونەوە، چونكە پشكنینێكی ورد ئەوە دەردەخات كە عەقڵ قەناعەت دەكات، ئارەزوو خۆشەویستی دەكات، روحی باڵاش لێوانە لە توانایی و هێز، رق و كینەش گڕ لەم هێز وتوانایە بەرنادات تا ببێتە دوژمنی ئارەزوو».. ئەم تێكستە ئەوەمان بۆ دەردەخات كە بونیادی دەروون لای "ئیزارا" سیانەكییە، ئەو سێی بەشە كە لێیان پێكدێت بریتین لە: عەقڵ و زیندووێتی یان چالاكی و ئارەزوو. ئەركی عەقڵ بیركردنەوە و حوكمكردنە، دەبێت لێرەدا بیركردنەوە بە واتای بیركردنەوەی شیكاریی

پوخت تێبگەین، نە سۆزی تیایە و نە هەڵچوون، بەڵام زیندوویێتی یان چالاکی هێز و توانایی و تواناداریی تێدایە، لەکاتێکدا کە ئارەزوو پەیوەستە بە خۆشەویستی و سۆز و هەستناسکییەوە. ئەم سێ بەشەیش «یەکەیەکی پێك پەیوەستی لێکدراو پێك دێنن»، خودا ویستی بۆ ئەم سێ بەشەی دەروون وابووە کە پێکەوە بە گوێرەی بنەمای عەقڵی کار بکەن، ئەویش بنەمای ڕێژەی گونجاوە، ئەم ڕێژەیەش لە بەشێك لە بەشەکانی دەرووندا بۆ گونجانی لەگەڵ بەشێکی تردا، پشت دەبەستێ بەو ئەرکەی کە لەبەردەستماندایە، مەبەستم ئەوەیە پشت دەبەستێ بەو شتەی کە "ئیزارا" پێی دەڵێت کارە جیاوازە هەمەجۆرەکان کە دەبێت ئەنجامیان بدەین. ئەم بنەمایە —وەك ئەوەی هەیە ـــ تەنیا بنەمایەکی بیرکاری و عەقڵی و ئیلاهی نییە، بەڵکو بنەمایەکی وەزیفیشە.

### ٣- سروشتی یاسا و عەدالەت:

دەتوانین لە شیکارییەکەی "ئیزارا" بۆ "سروشت و بونیادی دەروون" چ دەرەنجامێك لەبارەی سروشت و بونیادی یاسا و هەروەها لەبارەی سروشتی عەدالەتیشەوە بە دەست بهێنین...؟!

١. دەتوانین بەو دەرەنجامە بگەین کە یاسا و عەدالەت دوو بەرەنجامی بنەمای عەقڵیی بیرکاریی خودایی و وەزیفین ئەویش "بنەمای ڕێژە و هاوڕێژەیی"ـە.

٢. یاسا و عەدالەت پێکەوە بونیاد سیانەکین. ئەو بونیادەش هاوشێوەی بونیادی دەروونی مرۆییە.

لە سەرەتاوە "ئیزارا" دەڵێت ئەو بنەمایەی کە سیمای بونیادی دەروون و سروشتی یاسا و عەدالەتیش دیاری دەکات بنەمایەکی ئێجگار سادەیە، هیچ بەشێك لە بەشەکانی دەروون (و بەشەکانی یاسا و عەدالەتیش) ناتوانێت بەتەنیا زاڵ بێت بەسەر بەشەکانی تردا.

"ئیزارا" وای دەبینێت کە بنەمای "ڕێژە و هاوڕێژەیی" هەموو بنەمایەکی تری بەشەکی هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆ نموونە دەبینیت یاسای "باجی نشینگە" و هەموو ئەو یاسانەی دیکەش کە پەیوەستن بە باجەکانەوە، لەسەر ئەوە بەندن کە دەبێت هەموو دانیشتوان پێکەوە و بە یەکسانی خەرجییەکانی فەرمانڕەواییکردن بگرنە ئەستۆ. واتای ئەمەش ئەوەیە لەسەر بنەمایەك بەندە کە دەڵێت دەبێت یاساش ڕەچاوی پێویستییە تایبەتییەکانی تاکەکان بکات، حسابی بۆ بکات کاتێك ئەو وتەیەی پێ پەسەندە کە دەڵێت پێویستە تاکەکان خەرجییەکان و تێچوونەکانی فەرمانڕەوایی بگرنە ئەستۆ، بنەمای شاراوەش لەپشت هەموو ئەمانەوە بریتییە لە "ڕێژە و هاوڕێژەیی" کە وا دەخوازێت سیستەمی باج لەسەر بنەمایەك بێت —کە لە دوور مەودادا ــ نەبێتە مایەی دابەشبوون و کێشمەکێش لەنێوان هاونیشتمانیاندا. ئەوە یەکەم پرسە کە "ئیزارا" بانگەشەی بۆ دەکات[٦٩].

بەڵام پرسی دووەم دەڵێت یاسا و عەدالەت بونیاد سیانەکین، ئەم بونیادەش هاوشێوەی دەروونی مرۆییە. یاسا و عەدالەتیش بیرۆکەی یاسای چاکە تێیاندا زاڵ دەبێت، عەدالەتی ڕاستەقینەش ڕەچاوی سەرجەم بیر و پاساو و بنەما گونجاوەکان دەکات، وێڕای ئەوەش یاسای باش یان چاك، بە تایبەتیش عەدالەتی ڕاستەقینە، لە حوکمدانیاندا ڕاستن: هەردووکیان بڕیار لەبارەی کاروبارە واقیعییەکان، بابەتەکانی پەیوەستبوون، پرسەکانی ئەرکەوە دەدەن، لای "ئیزارا" ئەم خەسڵەتە تایبەتییانەی خەریکبوون بە بیرکردنەوەی حوکمی دروستەوە دەرهەق بە یاسا و عەدالەت، هاوشێوەی توانای عەقڵییە.

هێزی یاسا و کاریگەریی سیستەمی دادوەری، وەکو ڕێسا و سیستەمی خێزان، بنەما کەسییەکان، ویژدان ــ لای "ئیزارا" هاوشێوەی بەشی تایبەت بە چالاکی و بەرگرین لە دەروونداا، کاتێك دەکرێت یاسا بزوێنەرێکی بەهێز، یان کۆسپێکی بەهێزیش بێت. ئەکرێت یاسا بزوێنەرێکی بەهێز بێت ئەو کاتەی کە گوزارشت لە هارمۆنیا یان تەبایی و ئارامی دەکات، لێرەشەوە کار دەکات بۆ پشت ئەستوورکردنی

بەهاکان، فەزیلەتەکان لە تاك و خێزان و دەوڵەتدا. پاشانیش یاسا و عەدالەت، وەك بەشی تایبەت بە بەرگری و چالاکی لە دەروونی مرۆڤدا ــ کاریگەر و بزوێنەر دەبن، دەشێت ببنە کۆسپ و دەشێت ببنە رێنمای رەفتارەکان. لەبەر هەموو ئەمانە دەتوانین بڵێین کە یاسا و عەدالەت بەها و فەزیلەتەکانی تاك، هەروەها بەها و فەزیلەتەکانی خێزان و کۆمەڵگە هەم راڤە دەکەن و هەمیش پشت ئەستوور[٧٠].

وێڕای ئەوەش یاسای کۆمەڵایەتی، یاسای خێزانی، یاسای ئاکاریی هەر هەموویان بە نیشانەی خۆشەویستی دەناسرێنەوە، جا چ بەشێوەی بەزەیی بۆ ئەوانیتر بێت یان میهرەبانی، یان هەست و سۆز، یاخود بەشێوەی رێزگرتنی مرۆڤ لە خۆی بێت. ئەم خۆشەویستییە —لە روانگەی ئیزاراوە ــ هاوشێوەیە بەوەی کە بەشی سێیەم لە دەروون بەرهەمی دێنێت ئەویش ئارەزووە. ئەم کارکردە کاریگەرە لە یاسا و عەدالەتدا هەقبەشانەیە (منصف)، رەچاوی هەستی ئەوانیتر دەکات، وەك چۆن پێویستی و گرنیگیەکان لەبەرچاو دەگرێت، بۆیە عەدالەت میهرەبان و لێبوردەیە، بڕوای بەوە هەیە کە تاك لە کۆمەڵ لە پێشترە، بەو مانایەی کە حساب بۆ رەوش و ئاڵۆزیی و پۆزشە جیاوازەکان دەکات کە وا لەتاك دەکەن لە گوێڕایەڵی یاسا دەربچێت و خۆی تێدا نەبینێتەوە. هەمان شت لەبارەی ئەو خێزانەشەوە بڵێ کە بنەمای هارمۆنیا و تەبایی تێدا بالادەستە، بە خەسڵەتی "کۆدەنگی و رێکەوتن لەسەر هەست و هۆشەکان" دەناسرێتەوە، ئەوەش خێزانێکی هەقبەشە (منصف) و رەچاوی هەست و هۆشی ئەندامەکان و پێویستییە تایبەتییەکانی دەکات، هەروەها میهرەبان و لێبوردەیشە. بەڵام لەسەر ئاستی کەسەکی ئەو تاکەی کە بەدەست دابەشبوونی کەسایەتییەوە ئازار دەکێشێت، ئەوا بە سیمای "کۆدەنگی و رێکەوتن لەسەر هەست و هۆش" دەناسرێتەوە، وەها کەسێکیش پێوەرگەلێکی ئاکاریی بۆ خۆی دادەنێت کە لەگەڵ توانا عەقڵییەکانیدا گونجاو بێت. کەسێکی لەم جۆرە لە خۆی دەبوورێت، وەسوەسە و راڕا نییە لەبارەی کەم و کورتییە ئاکارییەکانییەوە. ئیزارا جارێکی تریش دەڵێت: یاسای کۆمەڵایەتی، یاسای خێزان، یاسای ئاکاریی کەسەکی هەر هەموویان

بە سیمای خۆشەویستیدا دەناسرێنەوە، جا چ بەشێوەی میهرەبانی و بەزەیی بێت بۆ ئەوانی دیکە، یان ڕێزگرتنی خود. ئەم خۆشەویستییەش هاوشێوەی ئەوەیە کە بەشی سێیەم لە دەروون واتە ئارەزوو، بەرهەمی دێنێت[٧١].

## ٤- ئیزارا و سایکۆلۆژیای ئاکار

ئەو فراگمێنتەی کە لە کتێبەکەی "لەبارەی سروشتی مرۆییەوە" ماوەتەوە دەخوازێت دەروونی لێوە هەڵێنجرێت، ستایشی خود ــ تێڕامانی سروشتی دەروونی مرۆیی دەکات، بەو پێیەی ئەوە ڕێگایەکە بۆ دەرخستنی ئەو سێ بوارەی کە یاسای مرۆیی تێدا پراکتیزە دەکرێت، ئەوانیش: بواری ئاکاری تاك و یاساکانی ئاکاریی کەسایەتی، بواری ئەو یاسایانەی گوزارشت لە بنچینەکانی ئاکاری خێزان و ئەو یاسایانەی کە گوزارشت لە بنچینەی ئاکاریی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دەکەن. هەروەها دەتوانین بڕوانینەوە ئەوەی کە "ئیزارا" چۆن بونیادی دەروونی شیکردۆتەوە، چۆن وای بینیووە کە ئەمە بەشدار دەبێت لە تێگەیشتن لە یاساکانی "سایکۆلۆژیای ئاکاری مرۆیی"، یاساکانی پزیشکیی فیزیکی. بۆ نموونە لای "ئیزارا" گونجاوترە وا لە عەقڵ یان لایەنی زەینی لە دەروونی مرۆییدا بڕوانین کە —بە هەندێك لێڵییەوە ــ هاوشێوەی بیرۆکەی من Egoــە لە دەروونناسی نوێدا. عەقڵ لای "ئیزارا" بیردەکاتەوە، هەڵدەسەنگێنێت و بنەماکان دەردەخات و پاڵپشتی و پشت ئەستووری یاساوەکان دەکات. هەروەها پرۆسەکانی ئەنجامگیریی (ئیندەکتیڤ) و هەڵهێنجان (دیدەکتیڤ) پێکەوە ئەنجام دەدات. بەشی تایبەتیش بە بەرگری و چالاکی لە دەرووندا لای "ئیزارا" هاوشێوەی ویستە "ئیرادە" لە دەروونناسیدا، ئەوە بەرهەمدەهێنێت کە پێی دەڵێت "جوامێری"، هۆکاری کردە، خودی ئارەزووش، دەکرێت هاومانای غەریزەی چێژ بێت کە لە شێوە جیاوازەکانی خۆشەویستیدا بەرجەستە دەبێت، بەو شێوانەیشەوە کە ئیزارا ناویان دەنێت "سۆز" و "هاوڕێیەتی" و "ناسکی"...هتد. وەلێ دەبێت زیادەڕەویش نەکەین لە ڕواڵەتەکانی لێکچوونی ئەو

و "فرۆید"دا، ڕەنگە زۆر ڕاست نەبێت کە بەراوردی دابەشکارییە سیانییەکەی ئەو بۆ دەروون لەگەڵ دابەشکردنی ئەفلاتوون بۆ سێ هێزەکەی دەروون بکەین، دەروونی ئالۆشاویی کە مەڵبەندەکەی زگە لەژێر پەردەیەکی ئەستوورەوە نوقمی سیفەتە هەستییەکانی خراپە و نەوسنی بووە، مەیلی بۆ ئالۆش و مومارەسەکردنی غەریزەکان هەیە..هتد. پاشان "دەروونی توڕەیی" کە سنگ مەڵبەندەکەیەتی، بەرگری و هەڵچوون تێیدا زاڵە، مەیلی سەرگەرمیی بۆ پاراستنی پیرۆزییەکان و بەهاکان هەیە...هتد، لەبەرئەوە فەزیلەتەکەی "جوامێری"ـیە. بەڵام سێیەمیان —کە لە هەموو بەشەکانی دیکەی دەروون باڵاترە ــ دەروونی عاقڵە و مەڵبەندەکەیشی سەرە، سەرچاوەی هاوسەنگکردنەوە و عەقڵمەندیی و تێگەیشتن و داناییە.

سەیر ئەوەیە ئەفلاتوونیش ئەم دابەشکارییە سیانەکییە بۆ کۆمەڵگەش درێژ دەکاتەوە، بۆ سێ چین دابەشی دەکات: چینی بەرهەمهێنەر یان چینی کارکەر یان "کۆمەڵگەی شەهوەت"، ئینجا چینی سەرباز کە بەرگری لە دەوڵەت دەکەن و بە جوامێریی و ئازایەتیدا دەناسرێنەوە، لە کۆتاییشدا چینی فەرمانڕەواکان کە بە سیفەتی فەیلەسووفەکاندا دەناسرێنەوە و ئایدیاکانی دادپەروەری دەزانن و بەسەر کۆمەڵگەدا پیادەی دەکەن[٧٢]. ئەگەر چی، لەڕاستیدا جیاوازی لەنێوان تیۆرەکەی "ئیزارا" لەبارەی دابەشکردنی سیانەکی دەروون و ڕەنگدانەوەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، تیۆرەکەی ئەفلاتووندا جیاوازییەکی گەورەیە.

بەڵام دەبێت لە کۆتاییدا بڵێین کە تیۆری یاسای سروشتی لای "ئیزارا" ناوەڕۆکێکی ژنانەی هەیە. ئەگەر —وەك هەمیشە فیساگۆرییەکان دەڵێن ــ گریمانەی ئەوە بکەین کە ژنان بەرپرسیارێتی هێنانەکایەی هارمۆنیا و عەدالەتیان لە ماڵدا لە ئەستۆیە، لە کاتێکدا پیاوان بەرپرسیارێتی دروستبوونی هارمۆنیا لە شار یان دەوڵەتدا هەڵدەگرن، ئەوا کاری بونیادنان هاومانای ئەخلاقییانەی کاری پیاوان دەبێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی عەدالەت لە هەردوو بوارەکەدا هەمان بنچینەی سروشتی هەڵدەگرێت کە ریشەکەی وا لەنێو سروشتی دەروونی مرۆییدا، ئەو شارەی

(یان دەوڵەتەی) عەدالەت و هارمۆنیای تێدا باڵادەستە پێویستی بە سەرۆك خێزانێکی دادپەروەریشە کە لایەنەکانی کەسایەتیشیدا هارمۆنیا زاڵ بێت. پاشانیش عەدالەتی کۆمەڵایەتی پشت بەو ژنانە دەبەستێت کە پەروەردەیەکی دادپەروەرانەی تاکەکان دەکەن و هارمۆنیا لە کەسایەتییەکەیدا زاڵ دەکەن، فەلسەفەی فیساگۆریزمیش پێی وایە کە ژن لە عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا لە پەراوێزدا نییە، بەڵکو ئەوە ژنە وا دەکات عەدالەت شیاوی هەبوون بێت[٧٣].

## دووەم: فینتسی سپارتەیی
## Phyintys of sparta

### ١- ژیان و بەرهەمەکانی

ژنە فەیلەسوفێکی یۆنانی بووە (لە دەوروبەری ٤٠٠ پ.ز) هیچ لەبارەی ژیانییەوە نازانین جگە لەوەی کچی سەرکردەی کەشتیگەلێکی یۆنانی بووە کە، وەك ئەوەی تیوکیدیدز و پلوتارك ئەیگێڕنەوە، لە جەنگێکدا لە ساڵی ٤٠٦پ. ز مردووە، ئەم زانیارییانەش وامان لێ دەکەن کە بڵێین فینتس لە سپارتە بووە و مێژوونووسانیش وا دەگێڕنەوە کە کتێبێکی داناوە بە ناونیشانی "میانەڕەوی لای ژنان" و تەنیا دوو فراگمێنتی لێ ماوەتەوە، ئەم دوو فراگمێنتەش جیهانبینی قوتابخانەی فیساگۆریی لەبارەی ژنان و پیاوانەوە بەرجەستە دەکات. وێڕای ئەوەی رەگەزی هاوبەش لەم دوو فراگمێنتەدا هەیە، کەچی هەندێك جیاوازیی جەوهەری لەنێوانیشیاندا هەیە.

### ٢- فراگمێنتی یەکەم لە کتێبی "میانەڕەوی لای ژنان" :

«دەبێت بە بەردەوامی ژن رێك و پێك و چاك بێت، بە بێ جیاوك و فەزیلەتیش هەرگیز وای لێ نایەت. فەزیلەتی گونجاویش بۆ هەر شتێك ئەوەیە کە هەرکەس هەیبێت وای لێدەکات لە پێگەیەکی باڵادا بێت، فەزیلەتی گونجاو بۆ چاوەکان ئەوەیە کە لەسەر رەسەنایەتی رایان دەهێنێت، فەزیلەتی گونجاو بۆ بیستن مەلەکەی بیستن ئێجگار هەستەوەر دەکات، فەزیلەتی گونجاو بۆ ئەسپ وای لێدەکات ئەسپێکی رەسەن بێت، فەزیلەتی گونجاو بۆ پیاو دەیکاتە پیاوێکی ئێجگار خاوەن پیاوەتی، هەمان شتیش لەبارەی فەزیلەتی گونجاو بۆ ژنیش بڵێ کە دەیکاتە ژنێکی نایاب، ئەو فەزیلەتە گونجاوەیش بریتییە لە: میانەڕەوی، چونکە لە رێگەی ئەم فەزیلەتەوە دەتوانێت رێز لە هاوسەرەکەی بگرێت و خۆشی بوێت.

ڕەنگە خەڵکانێکی زۆر وا گومان بەرن بۆ ئافرەت وا گونجاو نەبێت خۆی بە فەلسەفەوە خەریك بکات، هەروەها بۆیشی گونجاو نییە بەسەرپشتی ئەسپەوە تاو بدا، یان لە کۆمەڵی خەڵکیدا قسە بکات، یان بە ئاشکرا بۆ جەماوەر قسە بکات. بەڵام من پێم وایە شتانێکی تایبەت بە پیاوان هەیە، شتانێکی تایبەت بە ژنانیش هەیە و شتانێکی تریش زیاتر بۆ ژن ئەشێن نەك بۆ پیاو. هەرچی زیاتر بۆ پیاو گونجاوە، یان دروستتر بڵێین تایبەتە بە پیاو بەشداریکردنە لە جەنگەکاندا، بەشداریکردنە لە کاری سیاسیدا، وتاری گشتییە بۆ جەماوەر. هەرچیش تایبەتە بە ژنان مانەوەیەتی لە ماڵدا، بەخێرهاتنەوە و بەدەمەوەبوونی مێردەکەیەتی، بەڵام پێم وایە جوامێری و عەدالەت و دانایی بوارانێکی گشتین لەنێوانیاندا، وەك چۆن فەزیلەتەکانی جەستەش بۆ پیاو ئەشێن و بۆ ژنیش، هەمان شتیش لەبارەی فەزیلەتەکانی دەروونیشەوە بڵێ. وەك چۆن وا باشترە جەستەی هەردوکیان لەڕووی تەندروستییەوە ساغ و سەلامەت بێ، بە هەمان شێوە بۆ هەردووەکیان وا بەسوودترە دەروونیانیشیان ساغ وتەندروست بێت. فەزیلەتەکانی جەستە بریتین لە: تەندروستی، هێز، یەکێتی ئیدراك، جوانی. هەندێك لەم فەزیلەتانە وا گونجاوترە پیاو لە ژن زیاتری هەبێت، وەکو: پتەوی جەستە، هێزی رۆح، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوەی لەم فەزیلەتانەدا بۆ ژن گونجاوترە بریتییە لە: میانەڕەوی.

لەبەرئەوەی مرۆڤ دەتوانێت سروشتی ژنێك ببینێت کە خۆیی لەسەر میانەڕەوی ڕاهێناوە، ژمارەی ئەو شتانە و جۆرەکانیان دەزانێت کە ئەم چاکەیەی بۆ ژن زیاد کردووە. من دەڵێم ئەو چاکەیە لە پێنج شتەوە دەکەونەوە و بەم جۆرەی لای خوارەوەن:

یەکەم: ڕێزگرتن لە چرپای هاوسەرێتی.

دووەم: ڕەچاوکردنی توانا لە جەستەی خۆیدا.

سێیەم: ڕۆیشتن بە سواری ئەو سوارییانەی کە هی بنەماڵەی خۆیەتی.

چوارەم: سروتی نهێنی ئەنجام نەدات، جەژنی سیبل Cybele ـی خواوەندە نەگێڕێت[٧٤].

پێنجەم: خواپەست و ملکەچ و تۆبەکار بێت، قوربانی دروستیش بۆ خواوەندەکان بکات.

ئەمانە هۆکار و پارێزەری میانەڕەوین، ئەو ژنەیشی بەدەستیان بهێنێت ناشێت هاوسەرگیرییەکەی خراپ بکات، یان تێکەڵ بە پیاوی بێگانە ببێت. ئەو ژنەی بیەوێت سنوورەکانی خۆی تێپەڕێنیت لە خواوەندەکانی رەگەزی خۆی گومڕا دەبێت، ناسیاوانێکی ساختە بۆ نێو خێزان و ماڵەکەی دەهێنێت، هەروەها لە خواوەندەکانی سروشتیش گومڕا دەبێت کە سوێندیان پیێ دەخوات، وەك چۆن ئازاری باوباپیران و خێڵەکەی دەدات، بەشداریکردنی لە ژیانی گشتی کەم دەبێتەوە، منداڵی شەرعیش ناخاتەوە، ئازاری نیشتمانەکەیشی دەدات.. هەروەها ئەنجامدانی هەڵە لە بیروهۆشیدا دێت و دەچیێ، تەنیا لەپێناو چێژدا لە کردنی کاری ئابڕوبەرانە چاونەترس دەبێت، لەبەرئەمانەش شایەنی هیچ بەزیی و میهرەبانییەك نییە. بەڵام بەزاندنی یاساکان لە دواجاردا دەبێتە هۆی وێرانبوونی خۆی.

**٣- ژن و فەزیلەت**

فینتس وای بۆ دەچێت کە فەزیلەتگەلێك هەن لە نێوان پیاوان و ژناندا هاوبەشن، کەچی فەزیلەتی دیکە هەم تەنیا تایبەتن بەم رەگەز یان ئەوی دیکەیان. جوامێری و عەدالەت و دانایی فەزیلەتە هاوبەشەکانی نێوانیانن، ئەگەرچی پێی وایە جوامێری و دانایی بۆ پیاوان گونجاوترن وەك لە ژنان. بە تەواوی روون نییە مەبەستی فینتس لەوە چییە، رەنگە مەبەستی ئەو لە گوزارەی "زیاتر بۆ پیاو گونجاوتر" ئەوەبێت کە «گونجاوترە بۆ ئەو چالاکییەی کە پیاوان سەروکاریان لەگەڵیدا هەیە». "فینتس" ئەوەی بۆ روون کردووینەتەوە کە بۆچی ژنان پێویستیان بە راستییەکانی رەوشی کۆمەڵایەتی خۆیانە کاتێك، ئەوانیش وەك پیاوان، مومارەسەی فەلسەفەی ئاکاریی خۆیان دەکەن، تیۆرەکان لەبارەی دەوڵەتی ئایدیالی یان دەوڵەتی کامڵەوە دادەنێن.

فینتس بڕوای بەوە هەیە رژێمی کۆمەڵایەتی وەك ئەوەی هەیە لە ئارادایە. ئەم پرسیارەش دەکات: پەیڕەوی لە چ تیۆرگەلێکی ئاکاری دەکرێت؟ ئایا بەرپرسیارێتی ئاکاریی ئەوەمان لە ئەستۆیە بە گویرەی ئەو تیۆرە ئاکاریانە بژین کە زیاتر لەوانی دیکە رەچاوی بارودۆخمان دەکەن؟ "فینتس" دەڵێت: «ئەگەر بەو جۆرە ژیاین کە پیاوان لە بازاڕ و شوێنە حکومییەکاندا لەسەری دەڕۆن، ئەوا جوامێری و دانایی لەم حاڵەتەدا دەبنە دوو فەزیلەتی سەرەکی ئاکارییانە: چونکە ئەگەر ئەم فەزیلەتانە مومارەسە نەکرێن ئەوا کۆمەڵگە بە دەردی توندوتیژی و خۆپەرستی و قۆڵبڕییەوە دەتلێتەوە، جا چ لەلایەن شارەکانی دیکەوە بێت یان لەلایەن ئەندامەکانی خۆیەوە بێت، لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر بەو جۆرە بەرتەسکە ژیاین کە ژنان لە ماڵەکانیاندا دەژین، کە بەرپرسیارێتی کەسیەکییان لە پێگەیاندنی نێرینەیان دەکەوێتە سەرشان و بەمەش هارمۆنیا لە شار (یان دەوڵەت)ـدا، لەگەڵ دراوسێکانیشیاندا، پشت ئەستوور دەکەن، لێرەدا فەزیلەتی سەرەکی بریتییە لە: میانەڕەوی و خۆ کرنترۆڵکردن، کە بە بێ ئەوانە ژنان لەگەڵ منداڵەکانیاندا ئارام ناگرن
، هەوڵ و وزەی خۆییان بۆ چاودێریکردنی ئەوانی دیکە تەرخان ناکەن»[٧٥].

بەڵام بۆچوونێکی دیکەش هەیە کە "ماری ویت" دەیخاتە روو کە دەڵێت "فینتس" کاتێك پێی وابووە جوامێری و دانایی بۆ پیاوان گونجاوترن «ڕەنگە مەبەستی لەوە بێت کە چاندنی فەزیلەتی عەدالەت و دانایی لە دەروونی ژناندا سنووردارە بەهۆی ئەو رۆڵە کۆمەڵایەتییەی کە لە کۆمەڵگەدا رێ بە گێڕانی دراوە. ئەم رۆڵە کۆمەڵایەتییانە تێگەیشتنێکی هەمەکییانەی گشتی (لەو کەلتوورەدا) ئاوەژوو دەکەنەوە کە پێی وابووە دەروونی ژنان ئەم سروشتەی هەیە، بەڵام دەروونی پیاوان ئەو سروشتەی هەیە، کۆمەڵگەش قۆناغەکانی خۆی بەو رێگەیە بونیاد دەنێت کە هەل بۆ پیاوان نارەخسێنێت زۆر بزانن لەبارەی پەرەپێدانی فەزیلەتەکان لای ژن، پێچەوانەکەیشی راستە»[٧٦].

### ٤- ژن و عەدالەت لە ماڵدا :

"فینتس" زۆر پەسنی جۆر و ڕەنگەکانی ئەو ئازارە دەدات ژنی نادڵسۆز دروستی دەکات، کە پێویستە سەروەختی هاوسەرگیرییەکەی سوێند بۆ باوك و خزم و کەس و کارەکەی بخوات. سوێندەکەش ئاراستەی خواوەندەکانی ڕەگەزی خۆی و خواوەندەکانی سروشت دەکات: ئەوەش بە مەبەستی چاودێریکردنی خێزانەکە. پاشان خیانەت دەکات ــ یان بە گشتی نادڵسۆزە ــ کە ئەم چاودێرییە دەخاتە مەترسییەوە، ئینجا خێزانەکە تووشی دەردەسەری یان لەبەینچوون دەکات، وێڕای ئەو ئازارەیش کە ئەم ژنە بۆ خێزانەکەی دەیهێنێت کاتێك چاودێرییە خواییەکەی دەخاتە مەترسییەوە، تاوانێکی مەدەنیشی بەرامبەر دەوڵەت ئەنجام داوە. هاوسەرگیری ڕاسپاردەکانی ژن لە باوانییەوە بۆ مێردەکەی دەگوازێتەوە، کەچی دواتر ژنەکە خیانەت دەکات و ڕاسپاردەکە پێشێل دەکات، بۆیە ئەم تاوانە خراپترینی ئەو تاوانانەیە کە سزاکەی لە سێدارەدانە، ژنی خیانەتکار نابێت ئومێدی بە میهرەبانی و بەزەیی هەبێت، چونکە ئەو ئەنگێزەی بەرەو خیانەتکردن پاڵی پێوەناوە خراپترین ئەنگێزەیە کە: چێژە.

### ٥- فراگمێنتی دووەم لە کتێبی "میانەڕەوی لای ژنان" :

"فینتس" لە کتێبی ناوبراودا دەڵێت:

«پێویستە مرۆڤ ئەم خاڵەش جێ بەجی بکات، ئەویش ئەوەیە کە ژن چارەسەرێکی بێ گەرد نادۆزێتەوە بۆ ئەو هەڵەیە، بە جۆرێك کە لای خواوەندەکانەوە پاکیزە و خۆشەویست بێت، دوای ئەوەی کە پەرستگاکان و سەربڕینگەی قوربانیکردنی پیس کردووە، لە وەختی ئەم خەتایەدا — ڕەنگە لە هەڵەکانی دیکە زیاتر ــ ڕوحی پیرۆز هەرگیز میهرەبان نابێت، بەڵکو لەوپەڕی تووڕەییدا دەبێت. بەرزترین شکۆمەندی ژنی خاوەن مێرد، خانەدانترین شەرەف، ئەوەیە کە فەزیلەتی خۆی و ڕێزی خۆی بۆ مێردەکەی پیشان بدات لەڕێگەی منداڵەکانییەوە بەو

ئەندازەیەی کە نیشانەی لێکچوونیان لەگەڵ باوکیاندا هەبێت، ئەوەش مانای میانەڕەوییە لە هاوسەرگیریدا.

بەڵام بۆ بابەتی میانەگیری دەرهەق بە توانای جەستەیی، بۆچوونی من لەم بارەیەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

دەبێت ژنە میانەڕەوەکە پۆشاکی سپی سادە و خاوێن بپۆشێت، نابێت پۆشاکی تەنك و شەبەکەیی و رازێنراو بە حەریر لەبەر بکات، بەڵکو جلی سادە و ئابڕوومەندانە، خاڵی سەرەکیش هەر ئەوەیە ئابڕوومەندانە بێت، رواڵەتەکانی خواپێداویی و ئارایش وەلانێت، بەم جۆرەش غیرە و کینە و حەسادەتی ژنانی تر نابزوێنێت. هەڵبەت نابێت خۆی بە خشڵ و زێڕ برازێنێتەوە، چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەیەوێت رواڵەتەکانی دەوڵەمەندی و خواپێدوای لەبەرامبەر ژنە ئاساییەکاندا دەربخات.

بەڵام ئەگەر شارێك بە باشی رێکخرابێت، ئەوا لە روانگەی (گشت)یشەوە خۆی رێك دەخات، بە جۆرێك کە رێکخستنەکە بەندە لەسەر هاوسۆزی و کۆدەنگی، بگرە پێویستە رێز لە بوونی پیشەوەرەکان لە شاردا بگرێت، کە بە پیشەی رازاندنەوە و زەخرەفەوە خەریکن، بۆیە ژنی میانەڕەو دەبێت خۆی برازێنێتەوە بەڵام نەك بە ئارایشی هێنراوی بێگانە بەڵکو بە جوانی ئاسایی جەستەی، پاوك و خاوێنی و خۆشتن بە ئاو. دەبێت خۆی برازێنێتەوە بەڵام نەك بەم زەخرەفانە. ئا بەو جۆرەش دەبێتە مایەی شەرەف و رێز و سەربەرزی بۆ خۆی و ئەو پیاوەی کە هاوبەشی ژیانییەتی.

هەروەها پێویستە ژن بەشداری لەو ئاهەنگ و بۆنانەدا بکات کە لە ماڵدا ساز دەکرێن بۆ قوربانیکردن بۆ خواوەندی دامەزرێنەری شارەکەیان، بۆ خێری خۆی و خێری مێردەکەی و خانەوادەکەی، وێڕای ئەوەش کاتێك ئەستێرەی سەر لە ئێوارە دەردەکەوێت —نەك لە تەواو تاریکبووندا ــ دەبێت ژنەکە خۆی ئامادە بکات بۆ چوون بۆ شانۆ، لەوێشەوە دەتوانێت کەرەستە و کەلوپەلەکانی ماڵەکەی بکڕێت،

دەبێت ئەم کارانەش بە رووسووری ئەنجام بدات، وا باشتریشە یەکێك لە نۆکەرەکانی لەگەڵی بێت.

«وەك چۆن دەبێت نوێژ بۆ خواوەندەکان بکات، ئەگەر چی لەسەریەتی کە سروتە نهێنییەکان و ئاهەنگ گێڕان بۆ "سیبل Cybele" ی خواوەند لە ماڵدا ئەنجام نەدات. یاسای باو رێگرە لەوەی ژنان بەم ریتواڵانە ئاهەنگ بگێڕن: چونکە ئەم جۆرە مومارەسە ئایینیانە دەبێتە هۆی مەستی و بێ هۆشی، ئەمە لەکاتێکدا گەورەی ماڵ دەبێت میانەڕەو بێت، لە هەموو شتێکیشدا دەست پێوەگرتوو بێت»..[٧٧].

«بەم جۆرە ژن دەتوانێت بنەمای هارمۆنیا Harmonia بە هۆی مومارەسەی فەزیلەتی ئابووری و میانەگیری لە هەموو شتێکی پۆشاك، رواڵەت و رەفتاری گشتی، مومارەسە ئایینەکانیدا وەدی بهێنێت: خواپێداویی، ئارایش، لوتبەرزی، فیزکردن، خۆ بە دەوڵەمەند دەرخستن هەر هەموویان دەبێت وەلا بنرێن: چونکە مەترسین بۆ هارمۆنیای شار و غیرە و کینە لە ژنەکانی ترەوە، شانازیکردن و خۆهەڵکێشان بە جیاوازی ژینایەتییەوە دروست دەکەن. دەبێت ژنی میانەڕەو بە ئاستی کاریگەری شار وەك گشت بەسەر پۆشاك و رواڵەتی نامیانەگیرییەوە هۆشیار بێت.

تەنانەت ئەو پیشەوەرانەی کە خەریکی پیشەی رازاندنەوە و زەخرەفەی بێ بایەخن لەسەر پۆشاکی ژنان، دەبێت لەنێو شاردا رێی ئەم کارەیان لێ بگیرێت، بگرە دەبێت رێ لە رواڵەتەکانی خۆ هەڵکێشان بە جیاوازییە چینایەتییەکانەوە بگیرێت، بەوەی کە ژنێك خۆی بە کۆمەڵێك لە بەردەستەکانییەوە راوەشێنێت کاتێك کە بە شەقامەکاندا دەڕوات.

## سێیەم: پێرکتیونی Perictione

ژنە فەیلەسووفێکی فیساگۆریی یۆنانی بوو لە دەوروبەری ٣٠٠پ.ز، دەبێت جیاوازی بکەین لەنێوان دوو خانمە فەیلەسووفدا کە هەردووکیان هەمان ناویان هەیە، هەر لەبەر ئەمەش مێژوونووسەکان بە زۆری پێیان دەڵێن پێرکتیونی یەکەم و پێرکتیونی دووەم. یەکەمیان کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی "هارمۆنیای ژنان Harmony of woman" بەڵام دووەمیان کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی "سوفیاس Sophias" واتە "لەبارەی حیکمەتەوە". لە هەردوو کتێبەکە چەند فراگمێنتێك ماونەتەوە، لێرەشدا چەند حەکایەتێك هەن کە گوایە پێرکتیۆنیی یەکەمیان دایکی ئەفلاتوون بووە، ئەگەرچی بەڵگەکان بەڵگەی بنجبڕ نین، لەگەڵ ئەوەی کە دانی پێدا دەنرێت پێرکتیونیی یەکەم لە ئەسینای سەردەمی ئەفلاتووندا ژیاوە.

بەڵام ئەوەی هەمووان لەسەری کۆکن ئەوەیە ئەو فراگمێنتانەی لەو دوو کتێبە ماونەتەوە هی دوو ژنی جیاوازن، چونکە پێرکتیونیی یەکەم هانی ژنانی داوە بۆ فەلسەفەکاری، خۆ ئەگەر ژنان خەریکی حیکمەتی خۆڕامکردن بن، ئەوا لە توانایاندایە ببنە خاوەنی فەزیلەتی دیکەیش بە عەدالەت و جوامێرییشەوە. وا دەردەکەوێت ئەم ژنە فەیلەسووفە لە روانگەیەکی سوودگەرایییەوە لە فەزیلەتی روانیبێت: ژن دەتوانێت مومارەسەی فەزیلەتگەلێکی دیاریکراو بکات بۆ ئەوەی بتوانێت فەزیلەتەکانی تر، فەزیلەتە باڵاکانیش، پەرە پێ بدا، ئەو کات ئەم فەزیلەتانە لای خۆیانەوە دەبنە مایەی بەختەوەری و هارمۆنیا بۆ خودی ژنەکە و خێزانەکەیشی.

### ١- وەرگێڕانی دەقێك لە کتێبی "هارمۆنیای ژنان"٧٨.

«نابێت ژن قسەی رەق و نالەبار ئاراستەی دایك و باوکی بکات، نابێت بۆیشیان ببێتە مایەی ئێش و ئازار، بەڵکو دەبێت لە سەرجەم کاروبارە بچووك و گەورەکاندا گوێڕایەڵیان بێت، دەبێت لە دوودڵییەکانی دەروون و جوڵەکانی جەستە، لە ژیانی ناوەوە و ژیانی دەرەوەدا، لە جەنگ و ئاشتیدا، لە لەشساغی و نەخۆشیدا، لە خۆشی

و تەنگانەدا، لە هەڵوێستە تایبەتییەکان و هەڵوێستە گشتییەکاندا، ژنەکە لەگەڵیاندا بێت و هەرگیز بەجێیان نەهێڵێت. چوون ئەوەیە رێگای دانایی و راستی و شەرەف. بەڵام ئەگەر ژنەکە رقی لە دایك و باوکی خۆی بێت، بۆیان خراپ بێت ئەوا خواوەندەکان نەفرەتی لێ دەکەن و لە زیندوویی و مردووییدا بە ئەنجامدەری تاوان گوناهباری دەکەن، مرۆڤایەتیش بۆ هەتا هەتایە رقیان لێی دەبێت، بە پاڵ شەرانگێزەکانی نێوجەرگەی زەمینەوە دەیگوزەرێنێت، شەیتانەکان هێرشی دەکەنە سەر کە بۆ ئەم کارە راسپێردراون.

دیمەنی دایك و باوك پیرۆز و خۆشەویستە، هەروەها رێزلێگرتن و خزمەتکردنیشیان. تیشکی روناکی ئەوان ناکرێت نە بە هەتاو بەراورد بکرێت و نە بە ئەستێرەکان، نە بە هەر شتێکی تر کە مرۆڤ دەتوانێت وەك شتێکی بەرزتر و گەورەتر و روناکتر لەوانە خەیاڵی بکات، لەبەر ئەمە پێویستە بە زیندوویی و مردوویی رێزیان لێ بگرین. ناشێت گوناهێك هەبێت لە ئیهانەکردن بە دایك و باوك گەورەتر بێت))..[٧٩].

ئەمە یەکێکە لەو دەقانەی کە لە کتێبی "هارمۆنیای ژنان"ی پێرکتیونی بۆمان ماوەتەوە و تێیدا پرەنسیپێکی ئەخلاقی خستۆتە روو ئەویش ئەرکی ژنە بەرامبەر دایك و باوکی، ژنان لەوەش ئاگادار دەکاتەوە کە ئەگەر سەرپێچی ئەم پرەنسیپە بکات یان ئەگەر وەك ئەرکێك لەبەرامبەریاندا رێز و نەوازشتی نەنواند، ئەوا سنووری بەزاندووە یاخود پێشێلی کردووە. بەڵام نواندنی کینە یان بێزاری یاخود بەکارهێنانی وشەی سارد و سووك بەرامبەریان، ئەگەر چی کەس داوای گوێڕایەڵییەکی کوێرانەی نەکردووە، بەڵام ئەمانە شتانێکن کە هەرگیز لێخۆشبوونیان بۆ نییە، خۆ ئەگەر دایك و باوکەکە بە لارێداچوون ئەوا ئەو دەتوانێ دەستیان بگرێت بۆ رێگای دروست و هەق. لە هەموو حاڵەتەکاندا سەرپێچیکردنیان و بێ ئەمەکی بەرامبەریان تەرازووی هارمۆنیا هەڵدەگێڕێتەوە، تەبایی ئەزەلی لەنێوانیان نەوەکاندا تێکدەدات، ئەوەش شتێکە لای خواوەندەکان و لای خەڵکیش شیاوی لێخۆشبوون نییە[٨٠].

راستییەکەی تێك ئاڵانێکی نزیك هەیە لەنێوان کتێبی "میانڕەوی لای ژنان"ـی "فینتس" کە پێشتر لەبارەیەوە قسەمان کرد، کتێبی "هارمۆنیای ژنان"ی پێرکتیونی، هەردووکیان پەرژاونەتە سەر رەوشە کۆمەڵایەتییەکان، بوارە ئەخلاقییەکانی ژنان لە کۆمەڵگەدا. هەردووکیان دان بە رەوشی باوی کۆمەڵگەدا دەنێن، دەیکەنە سەرچاوەی سەرەکی پابەستیی ئەخلاقی بۆ ژنان چوون مرۆڤ لە خێزانێکدا لەدایك دەبێت کە بڕوای بە ئایینێك هەیە، لە شارێکدا دەستوورێکی هەیە، ئەوەش ئەو پەیوەندییانەن کە مرۆڤ دەستی بەسەریاندا ناشکێت، کەچی وەك سەرچاوەی ئەرك بەرامبەر بە دایك و باوك و خواوەندەکان گونجاوە" ئینجا مرۆڤەکان هاوسەرگیری دەکەن و خێزان پێکەوە دەنێن، پەیوەندیگەلێکی وەها دروست دەکەن کە هەندێك دەستی بەسەریدا دەشکێت، هەر لێرەشدایە کە بەرپرسیارێتی نوێی ئەخلاقی دەکەوێتە ئەستۆ. کۆمەڵێك پابەستی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی هەن، کە بریتیین لە کۆمەڵە ئەرکێك، دەبنە مایەی هەموو ئەم پەیوەندییانە، ئەگەر مرۆڤ ئەیەوێت ئەم پەیوەندییانە تەبا و پێکەوە گونجاو بن، یان دەیەوێت پێکەوە گونجان دروست بکات، دەبێت رەوچایان بکات، هارمۆنیا سەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە.

## ٢- فراگمێنتی دووەم لە "هارمۆنیای ژنان":

«دەبێت مرۆڤ وا خەیاڵ بکات ئەو ژنەی تەبایی تێدا زاڵە، هارمۆنیای لەخۆیدا وەدی هێناوە، دەبێت پڕبێت لە دانایی و خۆ ـــ کرنترۆڵکردن، دەبێت ئاگایی دەروون بە چاکە زیاد بکات هەتا ئەوەی دەبێتە ژنێکی دانا و جوامێری بە ویژدان کە بەتێگەیشتوویی خۆی شیرین دەکات، حەزی بە بۆچوونی بێ مانا و پووچ نییە، شتە بە بەهاکان لەم سەرچاوەیەوە دێنە بەردەستی ژنان: لە دەروونیەوە، لە مێردەکەیەوە، لە منداڵەکانییەوە، لە کەس و کارەکەیەوە، رەنگە لە شارەکەیشییەوە ئەگەر بێتوو ئەم ژنە شارەکە یان هۆزەکەی بەڕێوەبەرێت وەك ئەوەی لە شارە پادشاییەکاندا دەیبینین.

کاتێك ژن بەسەر ئالۆش، هەست و سۆزە توندەکانیدا باڵادەست دەبێت، ئەوا دەبێتە ژنێکی سەرڕاست و هارمۆنیا بەسەریدا زاڵ دەبێت، هیچ ئارەزوویەکی نارەوا تەنگی پێ هەڵناچنێت، بەڵکو خۆشەویستیی خۆی بۆ مێردەکەی و منداڵەکانی و سەرجەم کەس و کارەکەی درێژە پێ دەدات، کاتێکیش ئەو ژنە عاشقی کەسێکی بێگانە دەبێت یەکسەر دەبێتە دوژمنی هەموو کەس و کارەکەی، چینەکانی سەرەوە و خوارەوەش. وەها ژنێك دەست دەکات بە درۆ کردن و فێڵ و تەڵەکەبازی لە مێردەکەی لە بارەی هەموو شتێکەوە، ئەمە وەك هەوڵێك بۆ پیشاندانی ئەوەی گوایە سەربەرزە و ئیرادەی چاکەی هەیە، وێڕای ئەوەی تەمەڵیی پێخۆشە وەلێ دەیەوێ وا دەربخات ماڵەکەی هەڵدەسوڕێنێت.

هەروەها دەبێت ئافرەت خۆی رابێنێت لەسەر پێوەرە سروشتییەکانی خواردن، پۆشین، خۆشتن، سڕینەوەی پێستی خۆی بە زەیت، رێکخستنی قژی، بەخۆوەکردنی زێڕ و بەردە گرانبەهاکانی خۆڕازاندنەوە. ئەو ژنەی کە زۆر خۆریی دەکات، زیادەڕەوی دەکات لە خواردنەوە و پۆشین، بە هەموو جوانکارییەك خۆی دەڕازێنێتەوە ئامادەیی ئەوەی تێدا رسکاوە کە گوناه بکات، مومارەسەی هەموو رەزیلەتێك بکات، جا چ دەرهەق بە پێخەفی نووستن بێت یان هەر کردەیەکی خراپی تر، بەڵام پێویستە تەنیا برسێتی و تینوێتی بشکێنرێت نە زیاتر تەنانەت بە هەرزانترین خۆراك، ئەوەندەش بەسە لە کەشی سارد وسەرمادا بەرگێکی زبر بپۆشێت تەنانەت گەر لە پێستی بزنیش بوو بێت.

پۆشینی عەبای ئەرخەوانی و نایاب و رەنگا و رەنگ و بریقەدار بێ مێشکییەکە ئەو پەڕی بۆ نییە، وەلێ لە حاڵەتی جەهلی مرۆییدا دەبینین ژنان زیاتر لە پووچی و زیادەڕەویدا پەلە دەکەن. لەم گۆشەنیگایەوە دەبێت ئەو ژنەی کە هارمۆنیای بەسەریدا زاڵە بە زێڕ و بەردە گرانبەهاکانەوە کە لە هیندستان و وڵاتانی ترەوە هێنراون خۆی دڵبەست نەکات، جەستەی خۆی بەو بۆنانە چەور نەکات کە لە وڵاتانی عەرەبەوە دەهێنرێن، روخساریشی سپی و سوور نەکات، برۆ و برژانگی رەش نەکات، یاخود

قژی بۆیە بکات، چونکە ئەو جوانییەی لە حیکمەتەوە دێت، نەك لەم شتانەی ترەوە، ژنی رەسەن تێر و رازی دەکات.

دەبێت ژن وا نەزانێت زۆر ئۆرستۆکراتیبوون، یان دەوڵەمەندی، یاخود ئەوەی کە لە شارێکی گەورەوە هاتووە ــ شتانێکی پێویستن بۆ خۆی، یان بۆ هاورێکانی، یان بۆ ئەو بۆچوونە باشانەی پیاوانی سەنگین لەبارەیەوە هەیانە، خۆ ئەگەر ئەمەی کرد هیچ ئازارێکی پێ ناگات، ئەگەر نەیشیکرد ئەوا روحی ئەو ژنە هەوڵ بۆ شتی گەورە نادات، راستییەکەی ئەم شتانە زیاتر لە سوودەکانیان زیانی پێدەگەیەنن، رایدەکێشنە نێو بەدبەختی و خیانەت و بەخیلی و نیازخراپییەوە و وەها ژنێکیش هیچ کاتێك ژنێکی دەروونپاك نابێت.

دەبێت ژنان رێز لە خواوەندەکان بگرن، رێسا ویاساکانی پێشینان پەیڕەو بکەن. دوای رێزگرتن لە خواوەندەکان دەبێت رێز و پێزانینی بۆ دایك و باوکی هەبێت، ئەوانە دەرهەق بە نەوەی خۆیان هێندەی خواوەندەکان کاریگەرییان هەیە.

بەڵام دەرهەق بە مێردەکەی دەبێت بە رەوایی و رێزدارانە لەگەڵی بژی، وا لە هیچ شتێك نەڕوانێت کە شتێکی تایبەتە بەخۆی، بەڵکو دەبێت مێردەکەی بپارێزێ، گوڕوتینی پێ بداتەوە، دەبێت ژنەکە حەوسەڵەی بارودۆخی مێردەکەی هەبێت تەنانەت ئەگەر پەستیش بوو، ئەگەر بەهۆی بێ مارفەتییەوە لە خواردنەوەی شەرابدا ئاگای لەخۆی نەمابوو، یان وازی لە پێخەفی نووستن (یان سەرجێیکردن) هێنا، یاخود لەگەڵ ژنانی تردا بخەوێت، ئەم گوناهانە گەر پیاو ئەنجامی بدەن دەکرێت لێیان خۆش بین بەڵام بۆ ژنان هەرگیز شیاوی لێخۆشبوون نین. دەبێت ژنەکە یاسا بپارێزێ و لەمەدا بەخیلی بە پیاوان نەبات. هەروەها دەبێت حەوسڵەی تووڕەیی و بەخیلی و هەڵپەی مێردەکەی بکات، یان ئەو وشە سارد و سوکانە کە جارو بار پێی دەڵێت، یان ئیرەیی و جنێو و خراپی هەڵسوکەوتی، یان هەر سیفەتێکی تر کە بە حوکمی سروشت تێیدایە، تەحەمول بکات و خۆپارێز و بێ دەنگ بێت و سەرجەمی سیفەتەکانی بەجۆرێك چارەسەر بکات کە دڵخۆشی بکات، ئەگەر ژنەکە مێردەکەی خۆی

خۆشبوویت و ئەوە بکات کە ئەو پێی ڕازی دەبێت، کار بکات بۆ دڵخۆشکردنی ئەوا هارمۆنیا زاڵ دەبێت و تەبایی وەدی دێت.. ئەگەر خۆشیشی نەوێت ئارامی نادۆزێتەوە نە بۆ ماڵەکەی و نە بۆ منداڵەکانی، نەبۆ خزمەتکارەکانی و نە بۆ سەروەت و سامانەکەی، بەڵکو وەك دوژمنێکی لێ دێت کە هەوڵی وێرانکردن دەدات، بگرە نوێژ بۆ خواوەندەکان دەکات تا مێردەکەی لەنێوبەرن بەهۆی ئەوە گوایە مێردەکەی خراپە، دۆزینەوەی بیانوو بۆئەوەی سەرجێی لەگەڵ پیاوانی تردا بکات.. بگرە وای لێدێت ڕقی لە هەموو ئەو شتانە دەبێت کە پیاوەکەی بەختەوەر دەکەن و خۆشی ئەخەنە دڵییەوە.

بەڵام من پێم وایە ژن دەتوانێت هارمۆنیا وەدی بێنێت ئەگەر پڕ بوو لە دانایی، پیشان بدا کە خۆگرە، ئەوەش نەك تەنیا سوود بە مێردەکەی دەگەیەنێت، بەڵکو سوود بە منداڵەکانی و کۆیلەکانی و کەس و کارەکەی و سەرجەم خزمانی دەیەگەیەنێت بە هاوڕێ و میوانەکانیشیەوە ـــ هەر بە سادەیی پارێزگاری لە ماڵەکەی دەکات، گوێ بۆ هیچ شتێك ڕاناگرێ و هیچ شتێك ناڵێت ئەگەر دادپەروەری بە ویژدان نەبێت. هەروەها لە ژیانی هاوبەشدا گوێڕایەڵی مێردەکەی دەکات، ستایشی ئەو خزم و هاوڕێیانە دەکات کە مێردەکەی ستایشیان دەکات، بیر لەو شتە تاڵ و شیرینانە دەکاتەوە کە ئەو بیریان لێدەکاتەوە ـــ ئەگەر نا پەیوەندییەکەی لەگەڵ هەمووان‌دا دەبێتە نەشازێك و کەس حەزی بە چارەی نابێت».

ئێمە دەبینین لەم دەقەدا پێرکتیونی ـــ وەکو سیانۆی دووەم و فینتسی سپارتەیی ـــ لە تیۆری ئەخلاقیدا ڕێکەیەکی جیاواز لە هی فەیلەسووفانی پیاو دەگرێتە بەر، ئەو بایەخ بە تیۆرە ئایدیالییەکان نادا، کون پشکنی ئەوەش ناکات کە دەبێت کۆمەڵگە چۆن بێت، بەڵکو دەبینین لای ئەو فەلسەفەی ئەخلاقی چووە بەنێو پراگماتیکدا، بڕوای بەوەیە کە کۆمەڵگە بەو جۆرەیە کە هەیە، ئینجا بەدوای ئەو ڕێگایەشدا وێڵە کە بەهۆیەوە ژن دەتوانێت پرەنسیپی هارمۆنیا وەدی بهێنێت.

### ٣- پراگماتیکی ئاکار و.. هاوسەرێکی دڵسۆز:

پێرکتیونی، پراگماتیکییە ئاکارییەکەی خۆی بە سەر خیانەتی هاوسەرگیریدا لای ژنان، پراکتیزە کردووە، ئەو وەك فەیلەسوفێکی واقیعی پێی وایە کلیلی یاسادانان ئەوەیە کە دادگاکان بە کردەیی ئەنجامی دەدەن، بەڵام ئەو ئاماژە بەوەش دەکات ئەو بڕیارانەی کۆمەڵگە بە کردەیی دەریان دەکات وەك ئەوەی ڕێساگەلێکن کە دەبێت ژنی خاوەن فەزیلەت بەرمەبنایان بژی، ئەنجامیان دەگەن بەوەی کە دژ بە ئازادبوونی ژنان بوەستنەوە. ئێمە دەبینین ئەوە لە پێشەکییەکی فەلسەفی کەوتۆتەوە کە دەڵێت دەبێت پرەنسیپی هارمۆنیای پێودانگی (الهرمونیا المعیاری) بەسەر رەوشەکانی ژیانی مرۆییدا جێ بەجێ بکرێت، وێڕای ئەوەی بۆچوونەکانی پێرکتیونی (و ژنە فیساگۆرییەکانی دیکەش) ڕۆڵی ژن بە جۆرێك دەخەنەڕوو کە زۆرینەی بیرمەندە هاوچەرخەکان ڕەتی دەکەنەوە، بەڵام دەبێ وا لە ڕونگەکەی ئەم تێ بگەین وەڵامدانەوەیەکی پراگماتیکییە بۆ کێشەی بەرپرسیارێتی ئاکارەکی لە ڕووبەڕووبوونەوە و زێدەڕەوییەکانی ڕەوشی باو.

### ٤- جوانی فیزیکی و داڕزانی ئاکارەکی ژن:

بێگومان لە بۆچوونەکانی پێرکتیونیدا لە بارەی ژنەوە تۆنێکی ڕوون و ئاشکرا هەیە تەریب دەڕوات لەگەڵ ڕەوشەکانی ژنان کە لەو کاتەدا لە ئارادابوون، بەو واتایەی کە بە تەواوی شوێنکەوتەی پیاو بێت و دڵسۆزی بێت و پشتیوانی بۆچوونەکانی ئەو بکات لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بە تاڵ و شیرینیانەوە. بۆیە دەبینین پێرکتیونی ژن ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کە زیاد لە ڕادە گرنگیدان بە جوانی فیزیکی خۆی –یان جوانی جەستەی ـــ بەشدار دەبێت لە داڕزانی ئاکاریی ژن، چونکە جوانی ڕاستەقینە لە حیکمەتەوەیە، نەك لە خۆڕازاندنەوە و جل و بەرگ و زێڕو زیو، لە کاتێکدا سادەیی دژ بە غرور و گرنگیدان بە ڕوخسارە، توانای جەستەیی لەبەرامبەر زێدەڕەوی لە خواردن و پۆشیندایە، ڕەنگە خوێنەر لە بۆچوونەکانی پێرکتیونییەوە بەرەنجامگیری ئەوە بکات کە چەندین کەنیزەك و خزمەتکاری هەبووە. لە ڕاستیدا تەواوی دەقەکە هەڵگری زمانێکی تەواو ئاشنایە بە

پێوەرەکانی ئەو ژیانەی کە لەو کاتەدا باو بووە. پاشان ئەگەر ژنێك بکەوێتە تەڵەی ڕواڵەتەوە ئەوا ئەوە یەکەم هەنگاوییەتی بەرەو هەڵە و ئەنجامدانی هەموو ڕەزیلەتەکان، بۆیە میانەگیری و خۆکۆنترۆڵکردن ئەو فەزیلەتانەن کە هەوڵ دەدەن پەرە بە سەرجەم فەزیلەتەکانی تر بدەن، نامیانەگیریش بریتییە لەو ڕەزیلەتەی کە —بە هەر چوار لادا ــ دەرگا لە بەردەم هەموو ڕەزیلەتەکانی تردا دەخاتە سەر پشت.

## ٥- ئایدیالیزم لە بەرامبەر پراگاتیزمدا[81]:

لە ڕاستیدا ئامانجی پێرکتیونی وەك ئەو فراگمێنتانەی لە کتێبەکەی ماونەتەوە دەریدەخەن، ئەوەیە ئەو شتانە دیار و دەستنیشان بکات کە لە کۆمەڵگەی ئارادا لە ژن داوا کراون، تا خەڵکی ستایشی ئەخلاق و هەڵسوکەوتی بکەن، بۆیە ئامانج لەوە هەرگیز دەرخستنی ئەو ڕۆڵە نەبووە کە ژن دەتوانێت لە کۆمەڵگەیەکی نموونەیی یان گریمانەییدا بیگێڕێت، یاخود تەنانەت جیاوازییەکی گەورەی هەبێت لە کۆمەڵگەی باو. ئەگەر چی بە ئاماژەیەکی سەرپێی باسی ئەو ڕەوشانەی کردووە کە دەکرێت جیاواز بێت، کەچی خیانەتی هاوسەرگیری ئەگەر پیاو بیکات شیاوی لێخۆشبوونە، بەڵام ژن هەرگیز شایەنی لێخۆشبوون نییە. لێرەدا دەبینین پێرکتیونی دەڵێت: «پێویستە ژن ئەم یاسایە پەیڕەو بکات بە بێ ئەوەی حەسوودی بە پیاوان بەرێت لەوەی کە ئازادییەکی زیاتریان هەیە».

ئەم بۆچوونە پەسنێکی زیندووی ئەو مامەڵە خراپە دەدات کە دەبێت ژنان تەحەمولی بکەن، بەڵام ئەوەش ڕوونە ئەو کۆمەڵگەیەی کە خانمە نووسەرەکەی تێدا ژیاوە ئەو ڕێگایانە سنووردار کردووە کە ژن دەتوانێت بە پرەنسیپی پێودانگییانەی هارمۆنیا ڕازی بێت. پێرکتیونی، لە ڕووی تیۆرییەوە، لەوە ورد نەبۆتەوە کە دەکرێت ژن لە کۆمەڵگەیەکی گریمانەیی یان ئایدالیدا بە چ شێوەیەك بێت، یان لایەنی کەم جیاوازییەکی بەرچاوی هەبێت لە کۆمەڵگەی باو، بەڵکو زیاتر سەرنجی بارودۆخی کۆمەڵگەی ئێستا — واتە کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە ــ و ئەو ڕێگەیە دەدات کە ژن دەتوانێت بە هۆیەوە تەبایی و هارمۆنیا وەدی بێنێت.

# کۆتایی

لەم بەشەدا باسمان لە سێ ژن کرد ئەوانیش "ئیزارا لۆکانی" و "فینتس سپارتەیی" و "پێرکتیونی یەکەم"[٨٢]. بێگومان شیکردنەوەی دەقەکان یان فراگمێنتەکان دوو خاڵی گرنگ دەردەخەن:

١- توانای عەقڵی بۆ فەلسەفەکاری، هەوڵدان بۆ پراکتیزەکردنی پرەنسیپی تەبایی فیساگۆرییانە بەسەر تاك، خێزان، کۆمەڵگەدا. هەروەها ژنی فیساگۆری یان نموونەی زیندووی "ژنی خاوەن فەزیلەت"ـمان بۆ دەردەخات، کە بە "نموونەی باڵا"ی ژن دادەنرێت لە جیهانی کۆندا، بە جۆرێك کە نموونەی هاوسەری ئایدیالی دەخاتەڕوو. ئەمەش لەو فراگمێنتانەدا روون و ئاشکرایە کە لەبارەی بایەخدانی ژنان بە پەروەردەی منداڵ، پەیوەندی لەگەڵ هاوسەرەکەی، بە شێوەیەکی گشتیش بە کۆمەڵگەوە، دەدوێن.

٢- ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکان واقیعیتر بوون، زیاتر بە تەنگ کێشەکانی ژیانەوە بوون، لای ئەوان هەڵژنانی تیۆری بۆ جیهانی ئایدیاکان نابینیتەوە، بەڵکو پێیان لەسەر زەمینی واقیع و توانای خۆ کۆنترۆڵکردن، پاکداوێنی، پێکەوە بەستنەوەی نەوەی ئێستە و نەوەکانی پێشتر و رابردوو... هتد، داگرتووە و بگرە دەبینین خانمە توێژەرێکی وەکو ماری ئیلین وێت ئەم فەلسەفانە بە کەڵکەڵەیەکی "پراگماتیزم" دادەنێت لە کاتێکدا توێژەرانێکی دی پێیان وایە فەلسەفەیەکی واقیعیە.

ماوەتەوە بڵێین ئەمانە نموونانەگەلێکن لە ژنە فەیلەسووفە فیساگۆرییەکان، نەك سەرجەمی ژنە فەیلەسووفەکان لەو سەردەمەدا، ئەگینا دەتوانین باس لە "سیانۆی دووەم Theano II" بکەین، کە جیاوازە لە "سیانۆی یەکەم"ی ژنی فیساگۆرس، لە سەردەمی دوتاردا ژیاوە، رەنگە ساڵی ٣٠٠ پ.ز (واتە بە سێ سەدە دوای سیانۆی یەکەم) و چەند نامەیەکی لێ جێماوە کە بۆ دایکێکی گەنجی ناردووە سەبارەت بە پەروەردەکردنی منداڵەکانی رێنمایی دەکات بێ گوێدانە رابواردنی خۆی، تا بە فەزیلەتەوە گەورە بن، میانڕەو بن لە سەروەختی پێگەیشتنیاندا. سەیر لەوەدایە لە نامەیەك لەو نامانەدا سیانۆی دووەم ژنێکی

گەنج بە ناوی کالیستۆ Kallisto کە تازە لە سەرەتای هاوسەرگیریدا بووە، ڕێنمایی دەکات بۆ پەیڕەوکردن لەو شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ کۆیلەکانیدا.

بەڵام لە هەموو ئەمانە سەیرتر نامەیەکییەتی کە بۆ ژنێکی ناردووە بەناوی ڕودوبی Rohdope لەبارەی شێوازێکەوە کە بەم جۆرە دەستی پێدەکات «لە سیانۆوە بۆ ڕودوبی ـــ ی خانمە فەیلەسووف».. و تێیدا لەو بارەیەوە پرسیاری لێ دەکات کە ئایا لێی تووڕە نییە لەبەرئەوەی «ئەو کتێبەی ئەفلاتوونی بۆ نەناردووە کە ناوی پارمەندیسە»؟..!! لە وتارەکەوە تێدەگەین هەوڵگەلێك هەبوون بۆ خوێندنەوەی دیالۆگەکانی ئەفلاتوون، بگرە دیالۆگی "پارمەندیس" کە بە قورسترین دیالۆگەکانی دادەنرێت، ئەمە جارێکی دیکەیش بەڵگەیە لەسەر توانای عەقڵی لای ژنان لە جیهانی کۆندا.. خۆ ئەگەر لە جیهانی نوێیشدا هەلی بۆ هەڵبکەوێت، ئەوا فەلسەفەیەکی تەواو دادەڕێژێت وەك ئەوەی لە کتێبی داهاتوودا باسی لێ دەکەین.

دواجار "پێرکتیونی دووەم Perictione" کتێبێکی نووسیوە بە ناوی "لەبارەی داناییەوە Sophias"، ئەو فراگمێنتەی لەم کتێبە ماوەتەوە ئاوا دەستپێدەکات: «ڕەگەزی مرۆیی لە بووندا دەرکەوتووە بۆ ئەوەی لە سروشتی گشت رابمێنێت. وەزیفەی دانایی هەبوونی ئەم پرەنسیپە، تێڕامانی مرۆڤە لە مەبەستی بوونی شتەکان. ڕاستە ئەندازە و ژمێریاری و زانستەکانی تریش لێکۆڵینەوە لەو شتانە دەکەن کە هەن، بەڵام دانایی لە سەرجەم ڕەگەزی شتەکان دەکۆڵێتەوە. دانایی پەیوەستە بە هەموو ئەو شتانەوە کە هەن، کتومت وەك ئەوەی بینایی پەیوەستە بە بینراوەوە، بیستنیش بە هەموو شتێکی بیستراوەوە.. دانایی تایبەتە بەوەی بڕوانێت و وردبێتەوە لەو خەسڵەتانەی کە بە شێوەیەکی هەمەکی دەدرێنە پاڵ شتەکان، بەڵام دەرهەق بە هەندێکیان زانستە سروشتییەکان تایبەتن بە لێکۆڵینەوەیان.. دانایی بە دوای بنەما سەرەکییەکانی هەموو شتەکاندا دەگەڕێت لە کاتێکدا زانستە سروشتییەکان بە دوای پرەنسیپی شتە سروشتییەکاندا دەگەڕێن. ئەندازە و ژمێریاری و میوزیك تایبەتن بە ڕێژە و هارمۆنیا».. [٨٣]، ئەم پەرەگرافە پڕیەتی لە هزری فەلسەفی و بگرە جیاکاری دەخاتە نێوان فەلسەفە و زانستە بەشەکییەکانی تر، بە گوێرەی بواری لێکۆڵینەوەیان.

## بەشی چوارەم

## ئیسپازیا.. مامۆستای وتاربێژی

(ژن دایکایـــەتی خـۆی دەســـەلمێنێت بـــەوەی شـــیر بـــە منداڵەکەی بدات..

هــەر بــەو جــۆرەش وڵاتەکــەمان دایکایــەتی خـۆی بــۆ نەوەکانی دەسەلمێنێت

بەوەی کە گەنم و جۆیان بۆ بەرهەم بهێنێت..!)

### یەکەم : ژیانی ئیسپازیا

هیچ شتێك لەبارەی لەدایکبوونییەوە نازانین، بەڵام وا پێدەچێ ساڵی ٤٠١ پ.ز لە دنیا دەرچووبێت، هاوڵاتییەکی ماڵتی بوو لە ئەیۆنیا، دەروبەری ساڵی ٤٥٠ پ.ز گەیشتۆتە ئەسینا و قوتابخانەیەکی تێدا کردەوە بۆ فێربوونی رەوانبێژی و فەلسەفە، بە جەسوورییەکی زۆرەوە –وەك ویل دیۆرانت باسی دەکات ـــ هانی ژنانی داوە بۆ دەرچوون لە کونجی گۆشەگیری و تێکەڵبوونیان بە پیاوان، پەروەردەکردنیان بەشێوەیەکی باڵا، بۆیە ژمارەیەکی زۆری کچان لە چینە جیاوازەکان هاتنەرِیزی قوتابخانەکەیەوە و زۆرێکیش لە پیاوان ژنەکانی خۆیان نارده لای بۆ خوێندن[٨٤].

وا دیارە ژمارەیەك دەرسگوتاری پێشکەش کردووە کە پیاوانیش گوێیان لێ گرتووە، نموونەی ئەوانەش پێرکلیز و سوکرات و بۆچوون وایە کە خودی ئەنساگۆراس و یۆربیدس و قیبیادس و فیدیاس گوێیان لێ گرتبێت، یاخود لە هۆڵە (صالون) ئەدەبییەکەیدا ئامادەییان هەبوبێت –وەك ئەو وێنەیەی پاش کەمێکی تر لەبارەیەوە دەدوێین، دەیسەلمێنێت ـــ . کاتێك پێرکلیز چاوی بە ئیسپازیا کەوت ماوەیەکی درێژ بەسەر هاوسەرگیرییەکەیدا تێپەرِیبوو، هەروەها ئەو لەو تەرزە ژنانە بوو کە لە وڵاتی یۆناندا هەوڵی دروستکردنیان دەدرا، تەرزێکی ژنان کە –پاش ماوەیەکی کەم ـــ پێگەیەکی گەورەیان لە ژیانی ئەسینادا هەبوو[٨٥].

"دیۆرانت" ئەوە دەگێرِێتەوە پێرکلیز هەلێکی لەباری بۆ هەڵکەوت تا پەیوەندی لەگەڵ ئیسپازیا ببەستێ «کاتێك ژنەکەی پیاوێکی تری خۆشبوێت، هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی پێشنیاری بۆ بکات بە هەمان شێوەی ئازادی ئەو، ئەمیش ئازاد بێت و ژنەکەیشی بەمە رازی بوو، بۆیە پێرکلیز ئیسپازیای هێنا بۆ ماڵەکەی خۆی، کەچی هەر ئەو یاسایەی پێکلیز ساڵی ٤٥١ دایرِشتبوو خەڵکی ئەسینای مەحروم دەکرد لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بێگانەدا بکات تەنانەت ئەگەر یۆنانییش بێت»[٨٦].

مێژوونوسەکان وای دەگێڕنەوە ماڵی ئیسپازیا یانەیەك بووە بۆ کەسایەتییە گەورەکان لە ئەسینادا، تەنانەت شاعیرە کۆمیدیاییەکان ناویان نابوو "هیرا" یاخود خواوەندی شاژن، خواژنی باوباپیران، بەو پێیەی پێرکلیزیش زیۆسە[87]. سوکرات سەرسام بوو بە زمانپاراوییەکەی و سەری لێی دەسوڕما و دەلێت ئەو فێری هونەری دەربڕینی کردووە، فەزلی ئەوەیشی بۆ دەگەڕێنێتەوە هەر ئیسپازیا بووە ئەو وتارە جەنازەییەی داڕشتووە کە پێرکلیز دوای دۆڕانی یەکەم لە جەنگی پیلۆپۆنیزیدا خوێندییەوە. زۆری نەبرد ئیسپازیا بووە شاژنی بێ تاجی ئەسینا، دوا شێوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدا بڵاو دەکردەوە، ژنانی شارەکەیش هەر لەوەوە «ئایدیاکانی ئازادیی عەقڵی و ئازادیی ئەخلاقی فێربوون کە پەرۆشییانی هێنابووە جۆش»[88].
هەموو ئەمانە لێدانێکی گورچکبڕبوو لە هەستوسۆزی پارێزکارە ئەسیناییەکان، بۆیە یەکەمجار دەستیان کرد بە ناوزڕاندنی پێرکلیز، ئینجا دواتر ئەندامەکانی هۆڵەکە (صالون)، فیدیاسیان تۆمەتبارکرد بە شتنەوە (إختلاس)ـی هەندێك لەو زێڕەی بۆی نێردرابوو بۆ دروستکردنی خواوەندێکی ئەسینی لە زێڕ و عاج، تۆمەتێکیشان دایە پاڵ ئەنکساگۆراس پەیوەست بوو بە ئایینەوە، بۆیە فەیلەسووفەکە بەهۆی راوێژێکی پێرکلیزەوە بۆ دەرەوەی وڵات هەڵات، تۆتەمەتێکی دیکەی ئایینیشیان بۆ خودی ئیسپازیا هەڵبەست ناوەڕۆکەکەی ئەوەبوو ملکەچی فەرمانەکانی ئایین نابێت، وایان پیشاندا کە خواوندەکانی یۆنان نانرخێنێ، ئیدی رووبەڕووی دادگایی کرایەوە و کێشەکەی لەبەردەم هەزار و پێنج سەد دادوەردا سەیر کرا، لەو دادگاییەشدا پێرکلیز بەرگرییەکی مەردانەی لێکرد کە تێیدا هەر هەموو بەهرە و توانا رەوانبێژییەکانی خۆی بەکارهێنا بۆیە دادگا فەرمانی بێ تاوانی بۆ دەرکرد[89].

بەڵگەنامە مێژووییەکان لە دوو کاری زۆر دیاریدا ناویان بە نەمریی تۆمار کردووە:

یەکەم: دیالۆگی مینکسینۆس Menexenus ـی ئەفلاتوون: کە سوکرات دەڵێ: «خانمە مامۆستایەکی نایابم هەیە لە روانبێژی (وتاربێژی)ـدا. زۆرێك لە

وتاربێژە چاکەکانی فێرکردووە، لەسەرووی هەموویشیانەوە و باشترین وتاربێژ پێرکلیزە، لەمڕۆژانەدا وا بەر گوێم کەوتووە کە وتارێکی جەنازەیی لەبارەی مردووەکانمانەوە رازاندۆتەوە، ئەویش ئەو وتارە بوو کە پێرکلیز لە ئاهەنگە جەنازەییە بەناوبانگەکەدا خوێندییەوە. ئەم وتارەم لە ناو دڵما هەڵگرتووە. بۆیە ئیسپازیا با ئامادە بێت بە قەمچی تێم بسرەوێنێت ئەگەر شتێکم لە یاد بچێتەوە[٩٠].

دووەمیان: ئەو تابلۆ زەیتییە لە کەچی قۆقز کە لە دەروازەی کتێبخانەی زانکۆی ئەسینادا هەیە، تابلۆکە وا وێنەی کێشاوە لەپاڵ سوکرات و فیدیاس کە دەستی گرتووە بە سمۆیەکەوە، سۆفۆکلیس، پێرکلیز سەرکردەی جەنگی پیلۆپۆنیزی، ئەفلاتوون لە کاتی گەنجیدا، ئەنتستین، ئەنکساگوراس، پیبیادیسی قۆزەوەیە..هتد. ئەگەرچی، روونە هەندێك لە کەسایەتییەکانی ئەم تابلۆیە ناکرێت لە یەك کاتدا پێکەوە کۆبووبنەوە. لە کاتێکدا هەندێکیان وەکو ئەرخەمیدس هەرگیز لە ئەندامانی هۆڵە بەناوبانگەکەی (صالون) ئیسپازیا نەبوون.

## دووەم: وتارە جەنازەییەکەی پێرکلیز

لە ساڵی ٤٣٢ پ.ز ئەو جەنگە هەڵگیرسا کە ناومان ناوە "جەنگی پیلۆپۆنیز". قۆناغی یەکەمی دە ساڵی رەبەق (٤٣٢ ــ ٤٢٢ پ.ز) درێژەی کێشا و دونیای گریکی بۆ دوو بەش دابەش کرد: یەکێکیان "دوری" کە سپارتە پێشڕەوی دەکرد. ئەوی دیکەیشیان: سیفەتێکی ئەیۆنیانەی بەسەردا زاڵبوو و ئەسینا سەرکردایەتی دەکرد. پێرکلیز سەرکردایەتی ئەم جەنگەی کرد، پلانەکەی خۆی بە پشت بەستن بە هێزی دەریایی ئەسینا، کۆبوونەوە لەپشت "دیوارە درێژەکان"ــەوە دارشت[٩١].

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر هەڵگیرسانی جەنگەکەدا ئەسینایییەکان بە پێی نەریتی خۆیان لە دەرەوەی دیوارەکانی شار کۆبوونەوە: بۆ ئەوەی گوێ لە وتاری جەنازەیی "لاواندنەوە" بگرن کە تایبەت کرابوو بەم جۆرە بۆنانە بۆ یادکردنەوەی ئەو شەهیدانەی کە لە جەنگەکەدا شەهید کران[٩٢].

پێرکلیز ئەو کەسەبوو ئەسینا هەڵیبژارد، ئەویش چووە سەر بڵندگۆیەکی بەرز کە بە تایبەت ئامادەکرابوو تا زۆرترین خەڵکانی ئامادەبوو گوێیان لە دەنگی بێت، ئەویش گوتی:

«زۆرینەی ئەو کەسانەی لەم جۆرە بۆنانەدا لە رابردوودا قسەیان کردووە ستایشێکی پڕ بۆن و بەرامەی ئەم نەریتە پەیڕەکراوەیان کردووە کە بۆ بەخاکسپاردنی شەهیدەکان ساز دەدرێ، بەو پێیەی رێزلێنانی ئەو شەهیدانەی لە گۆڕەپانی جەنگدا تیاچوون ئەرکێکی پیرۆزە. بەڵام من ئەمەم پێ پەسەند نییە: چوون بە بڕوای من ئەوانەی بە کردەیی ئازایەتی و نەبەردی خۆیان سەلماند، ئەوەندەیان بەسە کە بە کردەییش شانازییەوە باس لە ئازایەتییەکەیان بکەین، وەك ئەوەی لەم بۆنەیەدا کە دەوڵەت رێکی خستووە بینیتان، هەر بەو جۆرەش رێزلێنانیان پەیوەست نییە بە زمانپاراویی و نەپاراویی وتاربێژەکەوە. وشەیەك لەبارەی باوباپیرانمانە دەڵێم، کە جێی خۆیەتی کاتێك ماتەمینێك بۆ شەهیدەکانمان دەگێڕین بە رێزەوە باس لە پێشینانیش بکەین. ئەم زەمینە هیچ رۆژێك خاڵی نەبووە لەو پاڵەوانانەی کە بە بوێریی خۆیان

توانیویانە نەوە دوای نەوە بۆ منداڵەکانیانی جێ بهێڵن.. ئەگەرچی من وتارێك نارازێنمەوە لەبارەی ئەو شتانەوەی کە دەیزانن».. [٩٣]. پاشان پێرکلیز وازی لە شەهیدەکانی جەنگەکەی و باسکردنی پێشینان هێنا و.. کەوتە ژماردنی مەردایەتییەکانی هاولاتی ئەسینایی، سیستەمی حوکمڕانییەکەی بەشێوەیەکی گشتی، بۆیە وتی:

«.. من دەڵێم سیستەمی فەرمانڕەوایی لای ئێمە کۆپییەك نییە لە دام و دەزگا سیاسییەکانی دەرو دراوسێمان، ئێمە لاسایی کەس ناکەینەوە، بەڵکو نموونەیەکین چاومان لێدەکرێ. دەستووری ئێمە دیموکراتییە. چونکە سیستەمی فەرمانڕەوایی لە دەستی کەمینەدا نییە، بەڵکو وا لە دەستی هەموو گەلدا. ئەگەر کەسێك بپرسێ بە چ رێگەیەك کێشمەکێشە کەسییەکان یەکلایی دەکەنەوە، وەلامی ئێمە ئەوەیە هەموو هاولاتیان لەبەردەم یاسادا یەکسانن. خۆ ئەگەر دیسان لەبارەی دامەزراندنی کەسێك لە پۆستێکی بەرزدا، بەتایبەت لە ناوەندەکانی بەرپرسیارێتی گشتیدا، لێمان بپرسێت ئەوا وەلاممان ئەوەیە: ئەوەی حسابی بۆ دەکرێت پێگەی چینەکەی ئەو کەسە نییە، بەڵکو ئەو توانا کردەییانەیە کە ئەو کەسە هەیەتی. هیچ کەسێك نابینیتەوە دوور لە رۆشنایی بوەستێت لە خزمەتکردنی دەوڵەتدا لەبەرئەوەی هەژارە، ژیانی سیاسی لای ئێمە ئازاد و کراوەیە، مۆنۆپۆل و موڵکی هیچ کەسێك نییە. ئێمە دەست وەرنادەینە ژیانی دراوسێکانمانەوە، لێشیان تووڕە نابین ئەگەر بەو جۆرە بژین کە خۆیان پێیان خۆشە، تەشقەلە بە پیاوێك ناکەین کە حەزی پێ ناکەین تا ئەو کاتەی زیانی بۆمان نەبێت[٩٤]. ئێمە لەژیانی تایبەتیشماندا روحی ئازادی و لێبوردەیی باڵی بەسەرماندا کێشاوە، بەلام لە پرسە گشتییەکاندا پارێزگاری دەکەین لە رێزگرتنی یاسا».

«ئێمە رێز لەو کەسانە دەگرین کە ناردومانننە ناوەندەکانی دەسەلاتەوە، وەك چۆن گوێڕایەڵی یاساکانیش دەکەین، بەتایبەتیش ئەو یاسایانەی چەوساوە و ستەمدیدەکان دەپارێزێت، ئەو یاسا نە نووسراوانەش کە دژ بە پێشێلکاریی رووتی مافی هاونیشتمانیانن».

«خەسڵەتێکی دیکەیش هەیە، کاتێك ئێمە لە کارەکانمان دەبینەوە لە دۆخێکداین کە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ چێژوەرگرتن لە هەموو جۆرەکانی برەودان بە خۆمان، ئەوەتا لای ئێمە کێبەرکێ لە گەمە وەرزشییەکان و ئەو جەژنانەدا هەیە کە ڕێکدەخرێن و تێیدا بە درێژایی ساڵ قوربانی دەبەخشرێتەوە هەیە، هەروەها جوانی لە ماڵەکانماندا، تامی خۆشی ئەوتۆ کە هەموو رۆژێك دڵخۆشمان دەکات و لە بێزاری و بێتاقەتی دوورمان دەخاتەوە، دەبینینەوە، بەهۆی گەورەیی شارەکەیشمانەوە بەرهەمی زەمین لە هەموو تازە بابەتێك دێنە نێو بازاڕمانەوە —ئەوەش ئاساییە کە بەرهەمی وڵاتانی دیکەش بەکاربهێنین ــ وەك چۆن لەپاڵێشیدا بەرهەمە ناوخۆیی و ناوچەییەکانی خۆمان بەکاردەهێنین».

«ئێمە بەهرە و تواناکان دەنرخێنین جا بوارەکەی هەر چییەك بێت: چونکە لای ئێمە بەرزبوونەوەیەکی ناوازە لە خۆیدا جێگەی نرخاندنە، ئێمە حەزمان لە جوانییە بە بێ ئیسرافکردن، داناییمان خۆشدەوێ —واتە فەلسەفەکاری ــ بە بێ لاوازی و خۆتەسککردنەوە، بە بێ ئەوەی شەهامەتی پیاوانە لە دەست بدەین، هیچ کەسێك لە ئێمە تەسلیم بە کەسێکی تر نابێت کە دەستوەردان بێت لە سەربەخۆییە روحییەکەی و داهێنانە پڕ بەرهەمەکەی، ئێمە بە تەواوی پشت بە خۆمان دەبەستین».

«بەڵام سامان و دەوڵەمەندی بە شێوەیەکی دروست بەکار دەهێنین، بۆ لاف و گەزاف و خۆدەرخستنی پووچ نایخەینەگەڕ، پێشمان عەیب نییە دان بە بوونی هەژاری بە کۆڵمانەوە بنێین، بەڵکو عەیبی گەورە کەمتەرخەمییە لە بەرەنگاربوونەوەی هەژاری، هاونیشتمانی ئەسینایی بەهۆی گرنگیدان بە کاروبارە تایبەتییەکانی خۆیەوە لە کاروباری وڵاتەکەی غافڵ نابێ، بەڵکو ئەوانەمان کە دەچنە ناو کاری بازرگانییەوە شارەزاییەکی باشیان هەیە لە کاوربارى سیاسیی وڵاتەکەیاندا، ئەوەش یەکێکە لە خەسڵەتە تایبەتییەکانمان، ئێمە لەبارەی پیاوێکەوە کە گرنگی نادات بە کاروباری وڵاتەکەی ناڵێین گرنگی بە بواری تایبەتی خۆی دەدات بەڵکو دەڵێین هەرگیز گرنگی بە هیچ شتێك نادات. ئێمەی ئەسینایی بڕیارەکانی خۆمان دەدەین و پلانەکانی

خۆمان دادەڕێژین دوای ئەوەی گفتوگۆ و مشتومڕی گونجاویان لەسەر دەکەین: چونکە پێمان وا نییە دژیەکییەك هەبێت لەنێوان گفتار و کرداردا، بگرە خراپترین شت ئەوەیە خوێنگەرمیت بۆ کارێك هەبێت بەرلەوەی بە باشی مشتومڕت لەسەر ئەنجامەکانی کردبێت».. [٩٥].

«پێویستە —بە وشەیەك بڵێم ــ ئەسینا مامۆستا و قوتابخانەی وڵاتی یۆنانە، من رایدەگەیەنم هەر تاکێك لە هاونیشتمانەکانمان، لە هەر موو بوارەکانی ژیانەوە دەتوانێت ئەوە پیشان بدات کە گەورەی خۆی و خاوەنی خۆیەتی، بە ئاسانی و کارامەیی ئامادەباشە بۆ چارەسەرکردنی هەموو کاروبارێکی ناکاو. ئەم قسەیەم دەربڕینێك نییە بەهۆی ئەم بۆنەیە بیڵێم، وتەیەکیش نییە زمانلوسی و رووپامایی تێدا بێت، بەڵکو من راستی ئەڵێم و باس لە واقیع دەکەم، بەڵگەش بۆ راستگۆیی قسەکەم ئەو پێگە بڵندەیە کە دەوڵەت بەهۆی ئەم فەزیلەت و خوخدانەی باسم کردن هەیەتی»...

«درێژەم دا بە گەورەیی ئەسینا، چونکە ئەمەوێت یەکەمجار دڵنیاتان بکەمەوە لەوەی ئێمە لە پێناویدا دەجەنگین زۆر لەوە بە نرخترە کە خەڵکانی تر لە پێناویدا جەنگاون: دووەمجاریش بۆ ئەوەی بەڵگەتان لەسەر ئەوە بۆ بهێنمەوە کە بۆچی ئەو شەهیدانە شایەنی ئەم رێزلێنانە، ئەم بۆنەیەن کە سازمان داوە... بە ستایشکردنی ئەم شارە، قسەکردن لەبارەی فەزیلەتەکانییەوە بۆئەوە بووە ئاماژەیەکی خێرا بدەم بە قوربانیدانی ئەم شەهیدانە، نموونەی ئەو پیاوانەی تر کە شارەکە بەرمەبنای فەزیلەتەکانیان خۆڕاگری و پایەبەرزی خۆی بنیات ناوە».. [٩٦].

هەوڵماندا —بەپێی توانا ــ ئەم وتارە جەنازەییە درێژە کورت بکەینەوە کە پێرکلیز لە بۆنەی ماتەمینی شەهیدانی ئەسینادا پێشکەشی کردووە، کە لە یەکەم ساڵی شەڕی دە ساڵەی پیلۆپۆنیزیدا کوژران، رەنگە گرنگترین رەگەزەکانی وتارەکە بریتییە لەمانەی خوارەوە:

١- پێركلیز بە ستایشكردنی نەریتی پەیڕەوكراوی بۆنەی رێزلێنان لە شەهیدەكان دەست پێدەكات. بەڵام دەیەوێت هەر لەو بۆنەیەدا رێز لە باوپیرانیشیان بگرێت كە هەرگیز بۆ یەك رۆژی ژیانیشیان دەست بەرداری نیشتمان نەبوون.

٢- ڕاستییەكەی پێركلیز بە شێوەیەكی سەرەكی جەخت لەسەر خەسڵەتە راستەقینەكانی "كەسی ئەسینایی" دەكاتەوە، زۆربەی وتارەكە لەلایەك دەربارەی سیفەتەكانی هاونیشتمانی ئەسینابیە، لەلایەكی دیكەیش دەربارەی سەربەزی ئەسینایە بە شێوەیەكی گشتی.

٣- وەسفی سیستەمی فەرمانڕەوایی دەكات لە ئەسینادا، ئەویش سیستەمی دیموكراسییە و هاونیشتمانی ئەسینایی شانازی پێوە دەكات، بە نموونەیەكی دەداتە قەڵەم كە وڵاتانی تر چاوی لێ دەكەن. ئەوەش واتە فەمانڕەوایی گەل نەك فەرمانڕەوایی چین یان گروپ یان دەستەیەك.

٤- خەسڵەتكانی ئەم سیستەمە بریتییە لە:

أ- هەموو كەسێك لەبەردەم یاسادا یەكسانە.

ب- هەموو هەلەكان لەبەردەم تاكەكاندا رەخساون بۆ هەڵبژاردنی لێهاتووان و خاوەن تواناكان بۆ پۆستە بەتاڵەكان.

ت- گرنگ ئاستی چینایەتی كەسەكە نییە، چوونكە ئەوە چینەكە نییە ئامادەی بكات بۆ پڕكردنەوەی ئەو پۆستە بەرزانەی زیاتر بەرپرسیارێتیان لە ئەستۆیە.

پ- سامان و پارەوپول بایەخێكی نییە، تاكەكانیش بەهۆیی هەژارییانەوە دوور نین و بێ بەش نین لە رۆشنایی خزمەتكردنی شارەكەی خۆیان.

ج- ژیانی سیاسی ئازاد و كراوەیە و مۆنۆپۆلی كەس نییە.

ح- هەر مرۆڤێك بۆی هەیە بەو جۆرە بژی كە خۆی پێی خۆشە تا ئەو جێیەی زیان بە خەڵكانی تر نەگەیەنێت.

خ- روحی ئازادی و پێكەوە هەڵكردن بەسەر ژیانی تایبەتی هاونیشتمانی ئەسیناییدا زاڵن، لە پرسە گشتییەكانیشدا ملكەچی یاسان.

٥- دوای ئەوانە پێرکلیز دەچێتەوە سەر باسکردن لە "هاونیشتمانی ئەسینایی"، سیفەتەکانی ئەو هاونیشتمانەش بریتین لە چێژ وەرگرتن و خۆشی و حەسانەوەی دەروونی دوای ماندووبوون لە کار.

٦- هاونیشتمانی ئەسینایی بێ زێدەڕەوی بەهرە و تواناکان دەنرخێنێت و حەزی لە جوانییە، بێ لەدەستدانی شەهامەتی پیاوانەش دانایی خۆشدەوێت.

٧- هاونیشتمانی ئەسینایی لە هیچ شتێکدا تەسلیمی کەسێك نابێت کە دەست وەربداتە سەربەخۆییە روحییەکەی و داهێنانە پڕ بەرهەمەکەی. ئەو بەتەواوی پشت بەخۆی دەبەستێت.

٨- هاونیشتمانی ئەسینایی تەنانەت ئەگەر کاری بازرگانیش ئەنجام بدات، بە باشی شارەزایە لە کاروبارە سیاسییەکانی ولاتەکەی.

٩- پاشان پێرکلیز شانازی بەوە دەکات ئەسینا مامۆستا و قوتابخانەی یۆنانە، ئەوەی ئەسینا لە پێناویدا دەجەنگێت —کە ئازادییە — زۆر لەوە بەنرخترە کە خەڵکانی تر لە پێناویدا جەنگاون. فەزلی شەهیدەکانیش هەر لەوەدایە.

بۆیە باسی ئەم رەگەزە سەرەکییانەی وتارەکەی پێرکلیزمان کرد، چونکە دەبینین لەو وتارەی ئیسپازیادا دووبارە دەبنەوە کە سوکرات لە "دیالۆگی مینکسیوس"ی ئەفلاتووندا بۆمانی دەگێڕێتەوە.

## سێیەم: ئیسپازیا و.. دیالۆگی "مینکسینوس"

دیالۆگەکە لەبارەی ئەو وتارە "جەنازەیی"ـەوەیە کە سوکرات لە ئیسپازیای هاوڕێی "پێرکلیزی کوڕی ئەکزانسیپس Xanthipus" گوێی لێ بووە، هەر ئەویش بووە فێری هونەری وتاربێژیی کردووە، وەك چۆن خەڵکانێکی تریشی فێری وتاربێژی، وتاری یادکردنەوەی ئەو شەهیدانەی لە جەنگدا تیاچوون کردووە، ئەفلاتوون گرنگی بە دیاریکردنی ناسنامەی شەڕەکە و جۆری جەنگەکە نەداوە[٩٧].

دیالۆگەکە بە پێشەکییەکی گاڵتەجارانە بە دووڕوویی وتاربێژەکان دەست پێدەکات و تەنانەت وا بە خەیاڵی مرۆڤدا دێت کە "ڕوپامایی و دووڕوویی و زمانلوسی" بایەتی دیالۆگی مینکسیوسە، هەموو ئەمانە تەنیا لە پێشەکییەکەدا دەردەکەون کاتێك سوکرات بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: «ڕەنگە وا بۆ مرۆڤ باشتر بێت لە جەنگەکەدا بمرێت: چونکە بەم جۆرە، تەنانەت ئەگەر هەژاریش بێت، بەختی لە جەنازەیەکی چاك دەبێت، خەڵکیش بە وشەگەلێك کە شایەنی نییە ستایشی دەکەن، دەسەڵاتیش فەزیلەتەکانی دەردەخات، جا خاوەنی ئەو فەزیلەتانە بوویێت یان نا، بگرە مرۆڤ بەم وشانە ئەبلەق دەبێ، وا وێنای خۆی دەکات بۆتە مرۆڤێکی گەورە، بگرە گەورەتر و بەرزتر و خانەدانتر لەوەی کە بۆی دەچوو! ئەم هەست و هۆشە بە رێز و پایەبەرزیی تا سێ رۆژ (کە ماوەی بۆنەکانە) لەگەڵی ئەمێنێتەوە، تەنیا لە رۆژی چوارەم و پێنجەمدا لێی تێدەگات»..[٩٨].

کۆمێنتی مینکسیوسیش ئەوەیە: «ئەی سوکرات تۆ بەردەوام گاڵتە بە وتاربێژەکان دەکەیت، ئەمرۆش بۆ ئەم بۆنەیە وتاربێژێکیان هەڵبژاردووە (ئەویش پێرکلیزە) و پێشم وا نییە ئەرکەکەی ئاسان بێت: چونکە —وای بۆ دەچم — دەبێت وتارێکی دەمگۆیی (إرتجالی) پێشکەش بکات»..!

سوکرات وەڵام دەداتەوە: پێویست ناکات پێرکلیز ترسی هەبێت چونکە "ئیسپازیا"ی مامۆستای روانبێژیی (البیان) هونەری وتاربێژیی فێرکردووە، بە راستی هەر ئەویش ئەو وتارە جەنازییەی ئامادە کردووە کە سەرکردەی ئەسینا پێشکەشی دەکات[٩٩]. من خۆم گوێم لێی گرتووە، بگرە لە ناو دڵمدا پاراستوومە، ئامادەشم بە قەمچی لێم بدا ئەگەر شتێکیم لە بیرکرد»[١٠٠].

## چوارەم: وتاری جەنازەیی "ئیسپازیا"

دوای ئەوە سوکرات، لەژێر پێداگری مینکسیوسدا، دەست دەکات بە گێڕانەوەی وتارە جەنازەییەکەی ئیسپازیا، دەڵێت ئەو دەستی بە وتارەکە کردووە هەر بەو جۆرەی کە پێرکلیز کردوویەتی لەو وتارەی پێشتر باسمان لێ کرد، بە ستایشکردنی ئەم نەریتە بەرزەی ئەسینا بۆ یادکردنەوەی شەهیدەکانی «پێویستە یادی شەهیدەکان بکرێتەوە، وتار هەبێت بۆ ستایشکردنی پاڵەوانە مردووەکان و ئامۆژگاریی زیندووەکان بەتایبەتیش کوڕ و براکان بۆ لاساییکردنەوەی شەهیدەکانیان».. [101]. "ئیسپازیا" بەم جۆرە دەستی کرد بە وتارەکەی بۆ سوکرات، پاشان درێژە بە قسەکانی دەدات و دەپرسێت: بەڵام دەکرێت ئەم وتارە بە چ جۆرێك بێت؟ چۆن دەست بکەین بە ستایشکردنی ئەم پاڵەوانانە؟ من پێم وایە وا بۆ کارەکە باشترە ستایشی چاکەکانیان بکرێت، هەر بە راستیش ئەوانە چاکترینەکانن، چونکە لە چاکترینەکان کەوتوونەتەوە، بۆیە ستایشی بنەچەی خانەدانی، پەروەردەی باشیان دەکرێت».. [102].

### ١- خانەدانی بە بنەچە:

هەر لە لەدایکبوونەوە ئەوانە پاڵەوانن، پێشینانی ئەوانە بێگانە نەبوون، بەڵکو نەوەی ئەم زەمینە چاکەن، لەسەری ژیاون، هەڵیگرتوون و شیری پێداون، بە پاراستنی گۆشکراون، دایکی راستەقینەیان بووە کە لە باوەشیدا حەواونەتەوە، لەبەرئەمانە دەبێت سەرەتا باس لە سەربەرزیی ئەو زەمینە بکەین کە دایکە، هەر ئەوەش رێگەیەکی گونجاوە بۆ سەربەرزڕاگرتنی ئەو نەوانە، هەر بە راستیش وڵاتێکە شایەنی پیاهەڵدانە، ئەوەش بە هۆی پایەبڵندی ئەسیناوە کە تەنیا ئێمە ستایشی ناکەین، بەڵکو سەراپای رەگەزی مرۆیی ستایشی دەکات، بگرە لای خواوەندەکانیش خۆشەویستە [103]، ئەم زەمینە وەك دایکێکی میهرەبان وابووە بۆ منداڵەکانی، وەك چۆن ژن دایکایەتی خۆی بە شیرپێدانی کۆرپەکەی دەسەلمێنێت (نەك دایکێك ئەم و کانیی شیرەی نەبێت) هەر بەو جۆرەش وڵاتەکەمان دایکایەتی خۆی بەوە دەسەلمێنێت گەنم و جۆ بۆ نەوەکانی بەرهەم بهێنێت، کە مرۆڤ بۆ خوارن پێویستی پێیانە، ئەوەش

نیشانەیەکە بۆ دایکایەتییەکی راستگۆیانەتر لە دایکایەتی ژن، چونکە ژن لە دووگیانی و منداڵبوونیدا لاسایی زەمین دەکاتەوە، نەك زەمین لاسایی ژن بکاتەوە».. [١٠٤].

## ٢- پەروەردەی چاك:

ولاّتی ئێمە کە بەردەوام ئازاد و بێگەرد بووە، نەوەکانی خۆی لە باوەش گرتووە و پەروەردەی کردوون تا ئەوەی بوونەتە پیاو، ئینجا خواوەندەکان ئەوەی پێ بەخشیون ببنە دانا و مامۆستا، ئەم خواوەندانەن ژیانی ئێمە رێکدەخەن، فێرمان دەکەن و لە هونەرەکانی ژیانی رۆژانەماندا رێنمایمان دەکەن.

باوباپیرانمان لە دایك بوون و فێربوون، حکومەتیان بۆ خۆیان پێك هێناوە، حکومەتێکی دانا و زانا بۆ چاکترین پیاوان، —هەندێ کات ـــ ناویشیان لەم شێوازەی حکومەتە ناوە حکومەتی دیموکراتی خۆ ئەگەرچی شێوەی حکومەتەکەمان "ئەرستۆکراتی" بێت، چونکە باشترین سیستەمی حوکمڕانییە».. [١٠٥].

«گەلی ئێمە —بەردەوام ـــ رێزی لە کارە جوانەکان ناوە، بە گشتی و تایبەتەکانیشەوە، پێیشی وایە پێویستە لەپێناو ئازادیدا بجەنگێت، هەر لەو پێناوەشدا بوو کە لەگەڵ سپارتەییەکان کەوتە جەنگەوە، وەك چۆن لەگەڵ بەربەرییەکانیشدا جەنگاوە.

«هەر لەبەرئەوە جەخت لەوە دەکەمەوە ئەو پیاوانە تەنیا باوکانی ئێمە نەبوون، بەڵکو باوکانی ئازادی، باوکانی ئازادیی ئێمە، هەموو ئەو ئازادییانەش بوون کە لەم کیشوەرەدا دەیچنینەوە.

هەموو ئەسینایییەکان ئەوەیان بینیووە ئەسینایییەکان چیان کردووە، بوونەتە قوتابی پاڵەوانانی ماراسۆن Marathon[١٠٦]، هەر بەو جۆرەش سەربازە ئەسینایییەکان لە دەشتەکانی ماراسۆندا، وەك دەریاوان لە سەلامیس Salamis [١٠٧]ـدا، بوونەتە مامۆستا لە هونەرە سەربازییەکاندا بۆ هەموو هیلاس» [١٠٨].

به بۆچوونی ئیسپازیا ئەوەی ئەتوانێ عەیبێك لە شارەکەمان بدۆزێتەوە یاخود تۆمەتێکی بداتە پاڵ تاکە شتێکە، یان تەنیا یەك تۆمەتە، ئەویش ئەوەیە: زیاد لە پێویست میهرەبان و نەم و نیانە، بە پاڵ لاوازەکانەوە دەوەستێت، زیاد لە پێویست یارمەتی دەدات، ناتوانێت دەستی یارمەتی بکێشێتەوە لەوەی زیانی پێدەگەیەنێت کاتێك بە کۆیلەیی دەیبینێت، لەوەش زیاتر بگرە ئازار و مەینەتییەکانی بۆ سووك دەکات. ئەسینا یارمەتی یۆنانییەکانی داوە و لە کۆیلایەتی ئازادی کردوون، هەر بە ئازادیش مانەوە تاوەکو خۆیان خۆیان کۆیلە کرد»[١٠٩] .

ئەوانە هێڵە سەرەکییەکانی ئەو وتارە جەنازەییە بوون کە سوکرات لە "دیالۆگی مینکینوس"ـدا، لە زمانی "ئیسپازیا"وە باسی دەکات، بە چاوخشاندێکی خێراش ئەو لێکچوونە زۆرە دەردەکەوێت کە لە نێوان ئەو وتارە و وتارەکەی پێرکلیزدا هەیە کە پێشتر باسم باسمان لە گرنگترین رەگەزەکانی کرد. ئەوەی سوکرات جەختی لێ دەکاتەوە ئەوەیە ئیسپازیا لە هونەری وتاربێژیدا مامۆستای پێرکلیز و وتاربێژەکانی دیکەی ئەسینا بووە.

## پێنجەم: دوو پاساو دژی "مینکسینوس"

کێشەگەلێك هەن هەندێك لێکۆڵەر ئەیانوروژێنن، بەم جۆرەی خوارەوە:

کێشەی یەکەم: ئەو وتارە کە سوکرات لە زمانی ئیسپازیاوە باسی دەکات بایەخێکی فەلسەفی نییە: ئەوە تەنیا جۆرێکە لە رەوانبێژی یان دەربڕین یان زمانپاراویی زمانەوانی بێ ئەوەی هیچ بیرۆکەیەکی فەلسەفی، بە واتای تەواوی ئەم وشەیە، لە خۆ بگرێت.

کێشەی دووەم: وێڕای ئەوەی ئەفلاتوون دیالۆگی مینکسینوسی نووسیوە، وێڕای ئەوەی ئەو دیدگایەی کە داویەتییە پاڵ ئیسپازیا دروستە، هەر بە راستیش تایبەت بووە بە، کەچی ئەفلاتوون گاڵتەی لە وتاربێژی و وتاربێژان دێت، تەنانەت—لە

روانگەی هەندێك توێژەرەوە ــ دەكرێت هەموو دیالۆگەكەش وەك پارچەیەك ئەدەبی "گاڵتەجاڕی و تەشقەڵەپێكردن" دابنرێت، ئینجا ئەفلاتوون كاتێك ئەم دیالۆگەی نووسیوە جددی نەبووە!.

دەرهەق بە كێشەی یەكەمیان، ئەوانەی دەڵێن وتارەكە بایەخی فەلسەفی نییە ــ دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە:

١- ئەی ئەمە چۆن لەگەڵ ئەوەدا دێتەوە كە دەڵێن ئەفلاتوون ئەم دیالۆگەی نووسیوە؟ بە دەربڕینێكی تر: چۆن راڤەی ئەوەی بكەین ئەفلاتوون ئەم دیالۆگەی نووسیوە وێڕای مۆركە ئاشكرا نافەلسەفیەكەی؟ چۆن دەتوانین بڵێین ئەم دیالۆگە تاكە بەرهەمی "نافەلسەفییانە"ی ئەفلاتوونە؟ ئەی چۆن لەگەڵ دیالۆگەكانی تردا رێك دەكەوێت؟

٢- لە لایەكی دیكەشەوە ئایا "هونەری وتاربێژی" لقێك نییە لە فەلسەفە؟ ئایا هەر خودی ئەفلاتوون لە دیالۆگی گۆرگیاسدا دوو جۆری وتاربێژی لێك جودا ناكاتەوە، یەكێكیان پشت دەبەستێ بە دووڕوویی و روپامایی، ئەوەش جۆرێكی داڕزا و ناپەسەندە، جۆرەكەی دیكەشیان كە باش و جێی پەسەندە ئەوە وتاربێژییەیە كاردەكات بۆ باشتركردنی دەروونی هاونیشتمانیان..[١١٠].

٣- ئایا ئەرستۆ كتێبێكی سەربەخۆی لەبارەی وتاربێژییەوە نەنووسیوە؟ كە بە كردەیی ئاماژە بەو "وتاری جەنازەیی"ـە دەدات كە سوكرات لەسەر زمانی ئیسپازیاوە باسی دەكات، پاشان —بە ئاماژەیەكی زیرەكانەی لێهاتوو ــ دەڵێت: «دژوار نییە ستایشی ئەسینییەك بكەین لە سپارتە»[١١١] دوژمنی سەرسەختی ئەسینا! وا پێدەچێ ئەرستۆ دان بە راستگۆیی دیالۆگی مینكسینوسدا دەنێت، هەروەها پەیڕەوی لە كەلەپووری زووكاتی (مبكر) ئەكادیمی كردووە، كلیلی راڤەكردنی دیالۆگەكەمان دەداتە دەست..[١١٢].

٤- ئایا وتاربێژی—بە درێژایی سەدەكانی ناوەڕاست ــ لە نێوان ئەو كۆمەڵە سیانەكییە Trivium دا نەبووە كە زماننانسی و وتاربێژی و لۆژیكی دەگرتەوە،

ناویان نابوو "زانستە عەقڵییەکان"، چونکە کردارەکانی عەقڵی لە خۆدەگرت —و ئاماژەبوون لەسەر دۆخی عەقڵی ــ و ئینجا فەلسەفی ــ بۆ وتاربێژیی لای یۆنانیەکان و لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ؟!

کێشەی دووەم: ئەوەیە کە ئەفلاتوون جددی نەبووە بەڵکو دیالۆگی مینکسینوس هیچ نییە جگە لە پارچەیەك ئەدەبی گاڵتەجاڕانە و تەشقەڵەپێکردن، تاربێژی لە سەردەمی ئەفلاتووندا بە شێوەیەکی تایبەت بەشێك بووە لە فەلسەفەی سۆفستایی، کەسایەتی ئیسپازیاش کەسێتییەکی ئەدەبی و خورافی نییە ئەفلاتوون دروستی کردبێت، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە، ئەم ژنە ناوبانگێکی زۆری هەبووە، بۆیە نزیکتر لە راستی ئەوەیە بڵێین ئەفلاتوون ئەوەی بە زەینی خۆیدا هێناوە کە ئیسپازیای مامۆستای وتاربێژیی کەسێکی سۆفستاییە بەشدارییەکی دیاری کردووە لە پەرەسەندنی هونەری وتاربێژی و پێغەمبەری ئەم هزرە نوێیە بووە کە ئەفلاتوون پێی وابووە کاریگەری نەرێنی لەسەر ئەسینا هەیە))...

واتای ئەمەش ئەوەیە کە "دیالۆگی مینکسینوس" بۆ رەخنەگرتن لە ئیسپازیای سۆفیست، گاڵتەکردن بە وتەکانی، تەشقەڵەکردن بە هونەری وتاربێژی نووسراوە، ئەگەرچی ئەفلاتوون خۆی دانی بەوەدا ناوە ئەم هونەرە (واتە هونەری رەوانبێژی) لقێکە لە فەلسەفە، وێڕای ئەوەی دانی بەوەشدا ناوە ئیسپازیا فەیلەسووف بووە، بەڵام فەیلەسووفێکی سۆفیست بووە کە وەك هەموو سۆفستاییەکانی سەردەمی خۆی، شیاوی تەشقەڵەپێکردن و رەخنەلێگرتنە، وێڕای ئەوەی ئێمە لەم حاڵەتەدا گەیشتووینەتە ئەو دەرەنجامەی دەمانەوێ بیسەلمێنین، ئەویش توانای "ئیسپازیا" ــ و ژن بە شێوەیەکی گشتی ــ بۆ فەلسەفاندن، بە چاوپۆشین لە جۆری ئەو فەلسەفەیە، بۆیە دەمانەوێت کەمێك لەسەر "ئەو بەرەنجامە نێگەتیڤانە" هەڵوەستەیەك بکەین کە لە زەینی ئەفلاتووندا بووە.

## شەشەم: ئیسپازیا و بزوتنەوەی وتاربێژیی سۆفستایی

ئەو بەرەنجامە نێگەتیڤانە چی بوون کە لە زەینی ئەفلاتووندا بوون کاتێك ویستوویەتی رەخنە لە بزوتنەوەی وتاربێژیی سۆفستایی بگرێت..؟!

بێگومان، کاتێك ئەفلاتوون دیالۆگی "مینیکسینوس"ی نووسیوە، ئەو رەخنانەی لە زەیندا بووە کە دواتر لە دیالۆگی "کۆمار"دا ئاراستەی سیستەمی دیموکراسی دەکات. پێشتر بینیمان ئەفلاتوون —تەنانەت لە زمانی ئیسپازیای هاوسەری پێرکلیزی پێشەنگی دیموکراسییەتی ئەسینابیشەوە — سیستەمی ئەرستۆکراتی بە باشترین سیستەم دادەنێت. گومانی تیا نییە رقی ئەفلاتوون لە سیستەمی دیموکراسی لەو بۆچوونەیەوە هاتووە کە جۆرێکە لە فەوزا تێیدا مرۆڤ بە هەمووشێوەیەك ئازادە، هیچ شتێك کۆتبەندی ناکات و بۆ هیچ سەردارێکیش ملکەچ نابێت..هتد[113]. لە کتێبی هەشتەمی "کۆمار"ـدا ئەفلاتوون پێی وایە خەسڵەتی دیموکراسی زێدەرِەویکردنە لە هەموو شتێکی ئازادییەکی رزیو، یەکسانییەکی رزیودا: «بەجۆرێك ئەو کۆیلانەی کە بە پارە دەفرۆشرێن لەرِووی ئازادییانەوە یەکسان دەبن بەو خاوەن کۆیلانەی کە دەیانکرِن»[114]. لە دیالۆگی "یاساکان"ـیشدا دەڵێت: «ئازادییەکی تەواو و رەها لە هەر کۆت وبەندێکی سەرجەم جۆرەکانی دەسەڵات زۆر خراپترە لە ملکەچبوون بۆ فەمانرِەوایەك کە هێزێکی سنوورداری هەبێت»..[115]، ئازادبوونێکی تەواو نییە لە هەموو جۆرەکانی دەسەڵات.

بەڵام پەیوەندی ئەمانە بە ئیسپازیاوە چییە؟ چی لەبارەی ئیسپازیای مامۆستای وتاربێژییەوە بڵێین..؟! دەڵێین ئەفلاتوون، وەك سوکرات، زۆر شت دەربارەی "هونەری وتاربێژی" لە ئیسپازیاوە فێربووە، بەڵام رەنگە ئەوەی ئەفلاتوون فێری بووە ئەو زیان و جێکەوتە نێگەتیڤانە بووبێت کە هونەری وتاربێژی وەك لقێك لە لقەکانی فەلسەفە لە خۆی گرتوون. ئەوەش لەبەرئەوەی فەلسەفە سیستەمێکی مەعریفی هەیە هەوڵ بۆ دەرخستنی حەقیقەت و رۆشنکردنەوەی زەینی خەڵکی دەدات، وەلێ لەلایەکی دیکەشەوە رەوانبێژیی* توانای قەناعەتپێکردنی خەڵکیی هەیە بە شتانی نارِاست،

یان تۆ بڵێ توانای سڕینەوەی حەقیقەتی هەیە بەتایبەت ئەگەر گوێگر بڕێکی پێویست زیرەکایەتی—وەك سوکرات و ئەفلاتوون ــ نەبێت کە بتوانێت ئەوەی بۆ دەرکەوێت. بایەخی رەخنەگرتن لە "وتاری جەنازەیی" کە سوکرات لە ئیسپازیباوە ئەزبەری کردبوو، هەروەها ئەو بانگەشە و ساختەکارییانەی مێژوو، جۆری ئەو رەوانبێژییەی بە ناهەق هەست و سۆزی خەڵکی دەبزواند، هەر لەمەوە دێت. رەنگە ئەمە بووبێت وای لە ئەفلاتوون کردبێت هەر لەگەڵ دەستپێکی وتارەکەدا دەست دەکات بە گاڵتەجاڕی بە دووڕوویی وتاربێژەکان کە تەنانەت ستایشێکی ئەوتۆی هاونیشتمانی دەکەن هەر تێیدا نییە "ئەوەی پێی دەوترێت واقوڕماو بەم وشانە"، ئیدی وا خۆی دەبینێت کە بۆتە مرۆڤێکی گەورە!

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەوەی سوکرات لە دڵی خۆیدا پاراستوویەتی "هونەری وتاربێژیی سۆفستاییە" ئەوەش واتە هێزی کاریگەری لەسەر جەماوەر، قسەکردن لەبارەی کاروبارانێکەوە گەل وا لێ دەکات بخەڵەتێت و خۆی لێ ببێتە شتێکی تر لەوەی لەبارەی خۆیەوە دەیزانی!

ئەگەر ئێمە وێنەی ئەسینای ساڵی ٣٨٦ پ.ز بە زەینی خۆماندا بێنین ئەوا نابێ بڵێین ئەم "شێواندنەی مێژوو" لە مەزنکردنی دیموکراسییەتی ئەسیناوە هەڵقوڵاوە، چوون ئەسیناییەکان خۆیان ئەم دیموکراسییەتەیان سەرزەنشت کردووە. بەڵام یەکەم بابەت کە پێویستە سەرزەنشت بکرێت —کە سەرچاوەی سەرەکی وتاربێژی بووە ــ ئیسپازیایە: ئەم "ڕۆشنکەرەوە" ئەیۆنییەی، بە گوێرەی قسەی ئێدمۆند بلۆدۆ Edmund Bloedow ــی یەکێك لە لایەنگرانی ئەم روانگەیە، تاکە ژنی ئەندام بووە لە بازنەی پێرکلیزدا..[١١٦].

# کۆتایی

ئەگەر ئەو تێڕوانینەمان پەسەند کرد کە دەڵێت ئەفلاتوون دیالۆگی "مینکسینوس"ی بۆ گاڵتە و تەشقەڵەکردن بە ئیسپازیا، ئەو هونەری وتاربێژییە سۆفستاییەی کە نواندویەتی، نووسیوە —کە ئەمە ڕێی تێ دەچێ وا بێت ـــ ئەوا ئەمە کۆمەڵێك پرس و باسی گرنگ هەڵدەگرێت، بەم جۆرەی خوارەوە:

١- ئەمە بەڕوونی واتای ئەوەیە ئیسپازیا یەکێك بووە لە ڕۆشنبیرە درەوشاوەکان، بیرمەندە کاریگەرەکان لەسەر ژیانی ئەسینا، هەروەها واتای ئەوەیە خاوەنی عەقڵێکی تیژبینانە بووە لە بابەتە سیاسییەکان کە بەلای گەلەوە گرنگ بوون، ، ڕای بایەخدانی بە هونەری وتاردانیش.

٢- واتای ئەمەش ئەوەیە ئەو ڕووداوە بە جددی وەربگرین کە ئیسپازیا هاوکاری پێرکلیزی کردووە لە وتارە جەنازەییە بەناوبانگەکەیدا.

٣- ئیسپازیا لەو کاتەدا لە ناوەندی بازنەی فەلسەفی سۆفستائیدا بوو، ئەویش بازنەیەك بوو خۆی تەرخان کردبوو بۆ شیکردنەوەی دەربڕین و شرۆڤە و نووسینی هونەری وتاربێژی.

٤- هەروەها واتای ئەوەیە ئەفلاتوون وەك سەرچاوەی هەڕەشە لێی ڕوانیوە، نەك هەڕەشەیەکی کەسییانە، بەڵکو هەڕەشەیەکی سیاسی و عەقڵی لە ژیانی کولتووریی ئەسینادا.

٥- وا دەردەکەوێت ئەفلاتوون بە نوێنەری خراپ بەکارهێنانی فەلسەفە، بگرە خراپ بەکارهێنانی دانایی و حەقیقەت لەمیانەی کۆنترۆڵکردنی دەربڕین و بەهرەی لە هونەری وتاربێژیدا، لێی ڕوانیوە.

٦- وا دەردەکەوێت ئەو تۆمەتە ئیلحادییەی درایە پاڵی، بەهۆیەوە لەبەردەم هەزار و پێنج سەد دادوەردا دادگایی کرا بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی خەڵکانی تریش بە سەرچاوەی هەڕەشەیان زانیووە، سەرباری ئەوەش لەو تابلۆ گەچییەدا کە لەسەر دەروازەی کتێبخانەی ئەسینادا نەخشێنراوە، زیندوو ڕاگیراوە و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕێزی ئەسیناییەکان وەك ژنە بیرمەندێکی ئەسینایی لە دەڵەتشارەکەیاندا.

# بەشی پێنجەم

## دیۆتیما.. مامۆستای سوکرات

(ئەی دیۆتیما، لەبەرئەمە، هەوڵی بەدەستهێنانم دایت، من پێویستم بە
مامۆستایەکە،
تکات لیّ ئەکەم فێرم بکە..)

سوکرات: خوان ٣٠٧

## یەکەم: دەستپێك

ئیسپازیا —کە بەشی پیشوو لەبارەیەوە دووایین ـــ و دیۆتیما Diotima کە لەم بەشەدا قسەی لەسەر دەکەین، تەنیا ئەو دوو ژنە فەیلەسووفەن کە لە دیالۆگە سوکراتییەکاندا باس کراون، بەلاّم —بۆ بەدبەختی ـــ تەمێکی چڕیان لە دەوریان دروست کردووە بۆئەوەی خەسڵەتی فەلسەفەکارییان لیّ دوور بخەنەوە، (لەوانەیە ئەمە بۆ دووپاتکردنەوەی لاوازیی عەقڵی بێت لای ژنان بەشێوەیەکی گشتی) ـــ یەکەمیان بەهۆی رۆڵی لە داڕشتنی "وتاری جەنازەیی" کە دیالۆگی "مینکسینوس"ی ئەفلاتوون لە دەوری دەسوڕایەوە، وا لێی دەڕوانن نموونەیەکە بۆ تەشقەڵەکردنی سوکراتی، میزاجی گاڵتەجاڕانە لای ئەفلاتوون.

بەلاّم دووەمیان دەڵێن گوایە تەنیا کەسایەتییەکی خورافییە و ئەفلاتوون بە خەیاڵە ئەدەبیەکەی ئەفراندوویەتی، لە دیالۆگی "خوان"ـدا وای پیشانداوە ئەو بووە سوکراتی فێری "هونەری خۆشەویستی" کردووە.

لە لایەکی دیکەیشەوە حیکایەتێکی مێژوویی هەیە کە دەڵێت دیۆتیما وەك کاهینی "مانتینا Mantinea" کاری کردووە، لە دەوروبەری ٤٠٠ پ.ز ژیاوە. لە زەمەنی تاعوندا کردووە سەردانی ئەسینای کردووە، ئەگەرچی بە زۆری وا پێدەچیّ هەر لەم سەردانەدا چاوی بە سوکرات کەوتووە، گەواهیدەرانێك لە مێژوو و لە شوێنەوارەکانیش هەن لەسەر ئەوەی "دیۆتیما" کەسێکی راستەقینە بووە نەك وەك گرووپی یەکەم دەیلێن، کەسێکی خورافی بوبێت.

لە سەرەتاوە دەست دەکەین بە باسکردن لە دیالۆگی "خوان"ـی ئەفلاتوون.

## دووەم: خوانی "ئەگاسۆن"

خوان ئاهەنگێك بوو شاعیری تراژیدی ئەگاسۆن Agathon لە دەروبەری ساڵی ٤١٦ پ.ز، بە بۆنەی سەرکەوتنییەوە لە یەکەم "تراژیدیا"ـیدا سازی دا، رۆژی

دواتریش بە ئاهەنگێڕانێکی تەقلیدی لەگەڵ شاعیر و ئەکتەرەکاندا سازی کرد[١١٧]، لەبەر ئەم هۆیە بە زۆری پێی دەوترێت "خوانی ئەگاسۆن".

دوای ئەوەی ئامادەبووان نانیان خوارد "ئەریکسیماخوس Eryximachus" پێشنیاری کرد لەبارەی بابەتی "خۆشەویستی"ـیەوە بدوێن، هەمووان بە پێشنیارەکەی رازی بوون، لێگەڕان "فایدروس Phaedrus" یەکەم کەس قسە بکات، ئەویش لە سەرەتای قسەکانیدا وا وەسفی خۆشەویستی کرد کە لەبەر زۆر هۆکار لە نێو خواوەندەکان و هەموو مرۆڤەکاندا خواوەندێکی گەورەی پایەبەرزە.

پاشان نۆرەی "پورنیاس Pauranias" هات –شاعیرێکی زۆر هۆگر بوو بە ئەگاسۆنەوە ــ پێی وابوو خۆشەویستی چەندین شەقڵی جیاوازی هەیە، هەیانە ئۆرستۆکراسییانەیە، هەیانە هەرچی و پەرچییانەیە. ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی «ئەفرۆدێت دوو کەسیایەتی هەیە: یەکەمیان: ئەفرۆدێتی ئاسمانی کە خۆشەویستی بڵند و خانەدانانە پێیەوە پەیوەستە. دووەمیان: ئەفرۆدێتی ڕەشۆکی و زەمینی کە خۆشەویستی نزم و هەرچی و پەرچییانە پێیەوە پەیوەستە. خۆ ئەگەر یەك ئەفرۆدێت هەبووایە ئەوا دەشیا یەك ڕەگەزی خۆشەویستی هەبووایە»..[١١٨].

پاشان "ئەریکسیماخوس Eryximachus"ی پزیشك قسەی کرد، بوونی دوو جۆر خۆشەویستی پەسەند کرد: خانەدانانەی ئاسمانی، هەرچیی و پەرچییانەی نزم، لەگەڵ هەندێك دەستکاریدا، ئەویش ڕێکخستنی وەرزەکان بوو کە کاریگەری هەردوو جۆرەکەی خۆشەویستی دەردەخات، خۆ ئەگەر یەکەمیان زاڵ بێت ئەوا مرۆڤ و ئاژەڵەکان نەشونوما دەکەن و کێڵگە و گوانی ئاژەڵان گەشەدەکەن، ئەگەر دووەمیشیان خۆی باڵادەست کرد بەڵا و نەگبەتی هەمووان دەگرێتەوە، سەرەی وشکەساڵی و بێبارانی دێت، دەرد بڵاو دەبێتەوە، نەخۆشی پەیدا دەبێت[١١٩].

پاشان نۆرەی "ئەرستۆفان Aristophanes"ــی شاعیرە گەورە هات، ئەویش پێی وابوو یەکەمجار خواوەندەکان ژن و پیاویان بە یەك بوونەوەر دروست کرد و چوار دەست و چوار قاچی، دووڕووی هاوشێوە، سەرێك کە بە هەموو لایەکاندا دەسوڕا،

چوار گوێی هەبوو. ئەم بوونەوەرە سەیرە لەوپەڕی هێزدا بوو، بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر دەڕۆیشت، بە دواوە و بە پێشدا و هەرچۆنی ویستبا دەڕۆیشت..هتد، بە کورتی: سامناك بوو تا ئەو رادەیەی تووشی غرور بوو، ویستی بەرەو ئاسمان سەربکەوێت، بۆیە خواوەندەکان کردیان بە دوو کەرتەوە تا هێزی کەم ببێتەوە و غرور و لە خۆبایبوونی بێتەوە خوار، ئیدی لەدوای دوو لەتکردنی مرۆڤی یەکەمەوە بۆ ژن و پیاو، هەر لەتێك بە دوای لەتەکەی تریدا دەگەڕێت، خۆ ئەگەر بگەن بە یەکتری بە توندی باوەش بە یەکدا دەکەن، وەلێ ئەیانەوێت وەك پێشتریان لێ بێتەوە و ببنەوە بە یەك مرۆڤ.

پاشان "ئەگاسۆن Agathon"ـی شاعیر قسەی کرد، ئەو وای بۆ دەچوو خۆشەویستی لە خواوەندەکان چکۆلەترە[١٢٠]، دڵ بزوێن و هەست ناسکە، بەرگەی توندیی ناگرێت و حەوسەڵەی خراپەکاریی نییە، بۆیە دەبینین لە روح و دڵی خەڵکیدا دەژی، هەر کە توندەڕەوییەکی تێدا بەدی کرد لێی هەڵدێ، لێی دووردەکەوێتەوە، چونکە ژیان و شوێنێکی بۆ گونجاو نییە تەنیا لەو جێیە نەبێت کە نەرم و نیانی و ناسك و نازاداری و ملکەچی تێدایە، هەروەها حەزی لە داوێنپاکی و خۆ کرنترۆڵکردنە[١٢١].

## سێیەم: دیۆتیما Diotima

کاتێك دەگەینە قسەی سوکرات لەبارەی "دیۆتیما"وە راستییەکەی دەگەینە قورسترین بەشەکانی "دیالۆگی خوان" –وەك ستانلی رۆزۆن S. Rosen ــ لە توێژینەوە قەبەکەیدا لەبارەی ئەم دیالۆگەوە پێمانی دەڵێت[١٢٢]. قسەکانی پێشتر هەرهەموویان –هەر لە قسەکانی "ئەریکسیماگۆرس" و "فایدرۆس"ــەوە تا دەگات بە دوا قسەکەریان "ئەگاسۆن" ــ رێخۆشکردن بوون بۆ قسەی سوکرات لەبارەی "خۆشەویستی"ــیەوە ئەوەش ئەو تەوەرەیە کە دیالۆگەکەی لەبارەوەیە. قسەی سوکرات بەشێوەی گفتوگۆی ئەو و "دیۆتیما"یە کە کاهینێکی شاری مانتینایە. لە ناوچەی پیلۆپۆنیز، سوکراتیش دەڵێت کە ئەسینایییەکان ئەم کاهینە باش دەناسن، چوون ئەوبوو توانی بۆ ماوەی دە ساڵی رەبەق نەخۆشی تاعونیان لیٚ دوور بخاتەوە[١٢٣]. زماناسی گەورە "والتەر کرانتس Walther Krantz" وای بۆ دەچێت "دیۆتیما" بانگهێشتێکی پیٚ گەیشتووە بۆ یارمەتیدانی ئەسینا و پاراستنی لە پەتای تاعون کە پێش دە ساڵ لە شەڕی پیلۆپۆنیز روویداوە. هەروەها مێژوونووسی یۆنانی "توکیدیدس Thuycudides" وای بۆچووە پێشبینییەکان کۆك بوون لەسەر نزکیبوونی روودانی ناڵە و هاواری جەنگ و نەخۆشی. لەم دۆخە ناخۆشەدا دوور نییە دەوڵەتشاری ئەسینا، بۆ رووبەڕوونەوەی ئەم مەینەتییە، پشتی بەستبێت بە کاهینێك لە شوێنێکی دیکە. ئینجا زۆر رێی تێدەچیٚ کە "ژنە کاهینی مانتینا" لەم ماوەیەدا بوونی هەبووبێت (واتە لەدەوری ساڵی ٤٤٠ پ.ز) و لەو وەختەشدا چاوی بە سوکراتی گەنج کەوتبێت[١٢٤].

ئەم چاوپێکەوتنە نە شتێکی سەیر بووە، نە دەگمەنیش بووە، کاتێك مێژوونووسەکان بۆمانی دەگێڕنەوە سوکرات ژنەکەی خۆی لە ماڵ زیندانی کردبوو، رقی لە عەقڵ و بیرکردنەوەی بو، لە هەمان کاتیشدا هەوڵی دەدا چاوی بە ژنە رۆشنبیرەکان بکەوێت کە هەندێك کات فێری دەکردن و لە زۆر کاتیشدا لێیان فێر دەبوو، ، ئەفلاتوون و زینەفۆن و ئەوانی تر دەگێڕنەوە کە هەوڵی بۆ ئیسپازیای

هاوڕێی پێرکلیز داوە کە لە بەشی پێشوودا لەبارەیەوە دووایین، ئەویش بە هەمان شێوە ژنێکی بێگانە بوو و لە شاری مالّتاوە هاتبوو، لە ئەسینا نیشتەجێ بوو تا بووە هاوڕێی گەورەترین سیاسی لە مێژووی ئەو شارەدا، ئەویش پێرکلیز بوو[١٢٥].

هەروەها زینەفۆن Xenophon لە یاداشتەکانیدا دەگێڕێتەوە «کاتێك سوکرات چەند دەنگۆیەکی لەبارەی ژنێکی جوانەوە لە شارەکەدا بیست کە پێشوازی لە هاوڕێیان دەکات، جوانی ئەم ژنەش لە سەرووی پەسندانەوەیە تا ئەو رادەیەی نێگارکێشەکان دەچوون بۆ وێنەکێشانی ــ بە هاوڕێکانی گوت: "دەبێت بڕۆین بۆ بینینی، چونکە ناتوانین تەنیا بەوەی کە لە دەمی خەڵکییەوە دەیبیستین، باش لێی تێ بگەین". بۆیە رۆیشت بۆ ماڵی تیۆدۆتا Theodota و بینی کە وێنەی دەکێشرێت، ئیدی سوکرات بە جوانییە دلڕفێنەکەی سەرسام بوو.. فەیلەسووفی گەورەی ئەسینا لێی پرسی: پارەی خەرجیت لە کوێ بوو؟ ئایا ماڵ و سامانێکت هەیە" خانوویەکت هەیە خەرجیت دابین بکات یان کۆیلەیەك..؟ ئەویش وەڵامی دایەوە بۆ خەرجییەکانی پشت بە هاوڕێ دەست و دڵکراوەکانی دەبەستێت..هتد، ئیدی لەبارەی شێواز و بەهای ژیانەوە لەگەڵی کەوتە مشتومڕ..هتد[١٢٦]. گرنگ ئەوەیە ئێستە ئەگەر ــلەڕووی مێژووییەوە ــ سەلمێنراو بێت سوکرات تەنیا بە بیستنی ناوی "تیۆدۆتا"ی جوان، وێڕای ئەوەی تەنیا بۆ گاڵتە و خۆشی بۆ بینینی رۆیشتووە، ئەی ئایا لۆژیکیتر نییە گرنگییەکی زیاتری بە "دیۆتیما"ی کاهینی مانتینیا دابێت کاتێك بیستوویەتی لە ئەسینایە؟ بەتایبەت سوکرات مێژوویەکی درێژی لە گوێگرتن بۆ دەنگی سروشتی کەسەکی ناخی خۆی هەبووە، تەنانەت وا ناوبانگی رۆیشتووە "شەیتانێکی تایبەت" یان "روحێکی ناوەکی Daemon تایبەت" بەخۆی هەیە کە دەیخاتە بزوان، ئەویش ئەمە بە ئاماژەیەك دادەنێت لە ئاسمانەوە، وێڕای ئەوەش سوکرات هەر بە راستی راوێژی لەگەڵ چەندین کاهینی دیکەدا کردووە. ئەمە لە "دیالۆگی پۆزش ــ ئەپۆلۆجی" ــدا بە روونی دیارە کە ئەفلاتوون لە زمانییەوە بۆمانی دەگێڕێتەوە: «شریفۆن Chareephon کە هەر لە

تافی لاویمەوە هاوڕێمە پرسیاری لە کاهینەی دێلفی کرد لەبارەی ئەوە کێ لە من داناترە، ئەویش وەڵامی دایەوە: لە نێو پیاواندا کەس لە ئێمەمانان داناتر نییە». [127].

لە دیالۆگی "خوان"یشدا ئەو خزمەتکارە دێت کە بۆ بانگکردنی سوکرات چووە، بە ئامادەبووان ئەڵێت: «سوکرات لە بەرهەیوانەکەی تەنیشتمان وەستاوە بێ ئەوەی هۆشی لای کەس بێت، ئاگای لە بانگی منیش نەبوو».. [128]. هەروەها لە هەمان دیالۆگدا ــ پەسنی قسەی دیۆتیمامان بۆ دەکات بەوەی «قسانێکن حیکمەتیان لێ دەبارێت»...، ئەویش پێی دەڵێت «لەوانەیە حیکمەتت گەیاندبێتە ئەوپەڕی خۆی».. [129]. کاتێکیش پرسیار لە سوکرات دەکات وەڵامەکەی بەم جۆرەیە: «ئای دیۆتیما ئەگەر بتوانیبا وەڵامت بدەمەوە، ئەوا ئەوەندە بە حیکمەتەکانت سەرسام نەدەبووم، خۆمم بە قوتابیت دانەدەنا تا قسەکانت لێ وەربگرم، لە تۆوە مەعریفەی خۆشەویستی فێر ببم».. [130].

هەموو ئەمانە وامان لێ دەکەن بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی دیداری سوکرات و "دیۆتیما" دیدارێکی راستەقینە بووە، نەك تەنیا چیرۆکێك ئەفلاتوون دروستی کردبێت. بەڵام ئەمە ئەو پرسیارەی پێشتر دەخاتەوە روو: ئایا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دیۆتیما کەسایەتییەکی راستەقینەی واقیعییە نەك تەنیا کەسایەتییەکی وەهمی یان خورافی، کە ئەفلاتوون بە خەیاڵە ئەدەبییەکەی دروستی کردبێت، بە تایبەتش دەزانین ئەفلاتوون ئەدیبێکی بەهرەمەند بووە..؟!

## چوارەم: دیۆتیما.. کەسێتییەکی خورافی!

لە دیالۆگی "خوان"ـدا کاتێك نۆرەی قسەکردنی سوکرات دێت، دەڵێت:

«قسەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە لە بارەی خۆشەویستی لە مانتینا Mantinea لە ژنێکم گوێ لێ بووە بە ناوی "دیۆتیما" کە خاوەنی ژمارەیەك کاری بە پێزە».. [131].

جا ئایا ئەم ژنە کە سوکرات دەڵێ گوایە "هونەری خۆشەویستی" لێوە فێربووە کەسایەتییەکی راستەقینەیە، یان کەسایەتییەکی ئەفسانەیی خەیاڵییە زەینی

ئەفلاتوون دایهێناوە؟ لێرەدا گرنگە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، لەم کێشەیە توێژینەوە بکەین، بەر لەوەی فەلسەفەی "دیۆتیما" بخەینەڕوو.

یەکەمجار ئەو بەڵگانە دەخەینەڕوو کە لایەنگرانی وای دەبینن بە توندی پشتیوانی لەو قسەیە دەکات "دیۆتیما" کەسێکی مێژوویی راستەقینە نییە، بەڵکو کەسێتییەکی خورافییە، ئەم بەڵگانەش لەمانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

١- تەبیعەتی ئەفلاتوون بەو جۆرە نەبووە بە تووشی ژنێکەوە بووبێت تا رۆڵی سەرەکی لە دیالۆگەکەدا بگێڕێت، وەك ئەوەی لەگەڵ دیۆتیمادا لە دیالۆگی "خوان"ـدا کردوویەتی.

٢- ناتوانین ئەوەی سوکرات ئەیڵێت بە جددی وەربگرین، چونکە ئەو هیچ کات لە ژنێك فێر نەبووە، وا پێدەچێ بۆچوونەکانی "دیۆتیما" بۆچوونی خودی سوکرات بن.

٣- دەبێت وا لە دیالۆگی "خوان" بڕوانین کە نموونەیەکی ناوازەیە لە بەهرە ئەدەبییەکانی ئەفلاتوون وەك "ڕۆماننوسێك"، ئەوەش واتە کەسێتی دیۆتیما ئەفلاتوونی ئەدیب دایهێناوە، خۆی لە پشتییەوە شاردۆتەوە تاوەکو ئەوە بڵێت کە دەیەوێت.

٤- لە سەرچاوە کۆنەکاندا، جگە لە دیالۆگی "خوان"، باسێکی ئەوتۆ لە کەسێتی "دیۆتیما" نەکراوە تا بتوانین بۆی بگەڕێینەوە.

٥- ڕەنگە "دیۆتیما" داهێنراوی سوکراتیش خۆی بووبێت، یاخود نموونەیەکی دیکەی "تەشقەڵەپێکردنی بە ناوبانگی سوکراتی" بووبێت! خۆ سوکرات کاتێك وا پەسنی "دیۆتیما" دەدات کە "کاهین" بووە و خاوەنی بەرهەمانێکی بەپێزە، توانیویەتی بۆ ماوەی دە ساڵ تاعون لە ئەسینابییەکان دوور بخاتەوە[١٣٢] ـــ هیچی نەکردووە جگە لە قەشمەرجاڕیی، واتە دەبێت وا لە هەموو ئەوانە تێبگەین کە جۆرێکە لە گاڵتەجاڕیی، شێوەیەك لە قەشمەربازیی بەناوبانگی سوکراتی. سوکراتی قەشمەربازی گەورە کاتێك گەنج بووە باوەڕی بە بۆچوونەکانی "دیۆتیما" هەبووە،

پاشان لە قۆناغی پێگەییشتوویدا فەرامۆشیان دەکات، لێرەدا ویستویەتی —بە شێوازی قەشمەربازی ــ بۆچوونە زووکاتەکانی (المبكره) بداتە پاڵ کەسایەتییەکی دیکە!

## پێنجەم: دیۆتیما.. کەسایەتییەکی راستەقینە!

ئەو بەڵگە و پاساوانەی پێشوو کە لایەنگرانی ئەو بیرۆکەیەی گوایە "دیۆتیما" کەسایەتییەکی خورافییە، هەڵوێستی خۆیان پێ پشت ئەستوور کرد، گەیشتن بە دەرەنجامێکی گرنگ ئەویش ئەوەی ژنێك نییە بەم ناوە، ئینجا ئەو بۆچوونانەیشی لەبارەی فەلسەفەی خۆشەویستییەوە دەیخاتە روو یان بۆچوونی سوکراتن لە سەردەمی گەنجێتیدا، یاخود بۆچوونی ئەفلاتوونن.

فەیلەسوفی ئەفلاتوونی ئەی. تایلۆر A. E. Taylor (١٨ ــ ١٩٤٥) وای بۆ دەچێت لە راستیدا سوکرات ویستویەتی قسەکانی خۆی بگۆڕێت بە دیالێکتیك یان گفتوگۆ یان هزری رەسەن، بەوەی بیانخاتە سەر دەمی ژنێك بە ناوی "دیۆتیما" ــ ئەویش کاهینێك بوو لە مانتینیا ــ و سوکرات پرسیار و وەڵامی نێوان خۆی و ئەم کاهینە دەگێڕێتەوە، ئەوەش ئەو گفتوگۆیە بوو کە چاوانی پێ کردەوە بۆ تێگەیشتن لە نهێنییەکانی حەقیقەتی خۆشەویستی[١٣٣].

"تایلۆر" درێژە بە قسەکانی دەدات بۆ بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی خورافیبوونی کەسێتی "دیۆتیما"، کە خەیاڵی ئەفلاتوونی ئەدیب دایهێناوە، دەڵێت: «لەلایەکی دیکەیشەوە لە توانای مندا نییە لەگەڵ زۆرێك لە توێژەرە نوێیەکاندا هاوڕا بم سەبارەت بەوەی "دیۆتیما" کەسێتییەکی خورافییە، لەبەر ئەوەی هێنانی کەسێتییە خورافییەکان و ناوە وەهمییەکان بۆ نێو دیالۆگەکە —بە بۆچوونی من ــ فێڵێکی ئەدەبییە کە بە تەواوی لای ئەفلاتوون بزرە ــ وەك لە بەشی پێشوودا باسمان لێ کرد».. [١٣٤].

"دیۆتیما" کاهین بوویێت یان فەیلەسوف، ئەوە قسەیەکە دەکرێت لەلایەن خودی ئەفلاتوونەوە وەڵام بدرێتەوە و پووچەڵ بکرێتەوە، کە سەرچاوەی متمانەی راستییەکانە لەسەر مێژووی سوکرات، جا ئەو لە زۆربەی دیالۆگەکاندا بۆمان روون دەکاتەوە سوکرات بە قووڵی کەسێکی ئیماندار بووە، خاوەن مێژوویەکی درێژی گوێگرتن بووە لە دەنگی عەرافەکان یان کاهینەکان، بۆیە ئێمە جارێکی دیکەش ئاماژە بە تایلۆر دەدەین، کە لەم بارەیەوە دەڵێت: «هەر لەو کاتەوەی سوکرات چیرۆکی "شریفۆن"ی هاورێی لەگەڵ کاهینەی دلفیدا وەك بەڵگەیەکی بەرگریکردن لە کاتی دادگاییەکەیدا دەگێڕێتەوە، دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین هەرگیز سوکرات دەروەستی ئەوە نەبووە راوێژ بە کاهینەکان نەکرێت، بەڵکو بە تەواوی بڕوای بە رێنماییەکانیان هەبووە.. وێڕای ئەوەش، راوێژی "شریفۆن" بە کاهینەی دێلفی لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا بووە کە یەکتربینینی سوکرات و دیۆتیما تێدا روویداوە.

سەرەڕای ئەوەیش عادەتی راوێژکردنی سوکرات بە "ژن" و وەرگرتنی ئامۆژگاری لە ژنە کاهینەکان لە دیالۆگی "مینۆن"ـیشدا باس کراوە، کاتێك دەڵێت: "لە پیاوان و ژنانێکی دانای رۆچوو لە کاروباری ئیلاهیدا، بیستوومە، ئەوانیش دەستەیەکن لە پیاوان و ژنانی کاهین کە هەوڵێکی بەرچاویان داوە بۆ تێگەیشتن لە پاساو Rationale ـی ئەو رەفتارانەی ئەنجامی دەدەن».. [١٣٥].

زمانزانی ئەڵمانی "ف. کرانتس W. Krantz" لە وتارێکیدا لەبارەی "دیۆتیما"وە وێنەی هێڵێکی تەواو راستەوانەی بە کەسێتی "دیۆتیما"ی نوێ لای شاعیری رۆمانسی دلڕفێن هۆڵدەرلین Helderlin (١٧٧٠ ــ ١٨٤٣) کێشاوە. سوکرات و هۆڵدەرلین هەردووکیان قوتابیی دوو ژنە مامۆستا بوون خۆشەویستی و داناییان لێوە فێر بوون. جیاوازیش لە نێوانیاندا جیاوازییە لە نێوان فەیلەسوفێکی فێڵبازی گاڵتەجاڕی لێبوردە، پیرێکی لووت پان، شاعیرێکی تەنیای نیگەرانی ناوازە لە جوانی و گەنجیدا، هەروەها جیاوازیش لەنێوان دوو ژنە مامۆستاکەیشدا جیاوازییە لەنێوان عەرافە و کاهینێکدا کە دوای بۆچوونی جیاواز لەبارەی خۆشەویستییەوە بە

وتەیەكی یەكلاكەرەوە خۆی گەنج دەكاتەوە —دەبێت ژنێكی پیر بووبێت تا ئەم حیكمەتەی هەبووبێت ــ، لەگەڵ كچێكی گەنجی هێمن و ناسك كە جوانی و میهرەبانی و تێگەیشتن لە چاوان و دڵی دەڕژێت بۆ ئەو شاعیرەی كە قەدەر خستیە سەر ڕێگای، ویستی لە ماڵیدا بژی، لە كانییەكەیەوە تینوێتی ئەبەدیی خۆی بشكێنێت، دواجاریش تێیدا نغرۆ ببێت[١٣٦].

## شەشەم: بەڵگەیەك لە شوێنەوارەكان

لە مۆزەخانەی نیشتمانی نابلیدا سندوقێكی برۆنزیی بچووك هەیە نوسخەیەكی دۆزراوەی شوێنەواریی لە دیالۆگی "خوان" تێدا دانراوە، لەسەر بەرگی سندوقەكە وێنەیەكی جوان كێشراوە، "ئۆتۆجان Otto Jahn" —یەكێك لە پسپۆرەكانی نەخشی كۆنی كلاسیكی ــ ئەو زەخرەفانەی كە لەسەر ئەم وێنەیە كێشراون بەم جۆرە پەسن دەدات:

«وێنەكە گوزارشت لە دیمەنێكی سادە دەكات هیچی تیا نییە جگە لە كورسییەكی بێ پشت، ژنێك بە عەزییەكی درێژی رازاوەوە لەسەری دانیشتووە، هەروەها كاڵایەكی داوە بە جەستەیدا كە بەشی خوارەوەی پێ داپۆشیوە، تاجێكی لەسەر ناوە لە غودەیەك دەچێ تەنیا ناوچەوانی دیارە. ئاشكرایە دیمەنی ژنەكە وا پیشان دەدات خەریكی قسە كردنە، ئەو بابەتەی قسەی لەبارەوە دەكات هەموو هۆشی بەلای خۆیدا بردووە. دەتوانین بڵێین —بێ ئەوەی ترسمان لەوە هەبێت بكەوینە هەڵەوە ــ زەینی ژنەكە بە تەواوی رۆچووە كاتێك رووی قسەكانی لە پیاوێك كردووە لە بەردەمیدا وەستاوە.

پیاوەكەش كە بە بەرگێكی سادەوە وەستاوە بەلای دەستی چەپیدا رووی سوڕاندووە، بەڵام سنگ و شانەكان و دەستی راستی بە تەواوی روتن، سەری كەمێك بەلای راستدا لار كردۆتەوە، سەری رووت، پێی پەتی، لوتی پان، چاوانیش لەژێر دوو برۆی چڕدا بە قوڵا چوو، لێوەكانیشی ئەستوور..هتد». دوای ئەوەی "ئۆتۆجان"

بەراوردی ئەم وێنە برۆنزیە و نەخشەکانی تری سەردەمی ئەفلاتوون دەکات، دوای ئەوەی پەسنی کەسایەتی "ئیرۆس Eros" (خۆشەویستی) دەدات کە لەنێوان ژن و پیاودا دەردەکەوێت، وتەکانی بەم جۆرە کۆتایی پێ دێنێت:

«گومانم نییە لەوەی لێرەدا لەبەردەم سوکرات داین کە چاوەکانی بڕیوە لە/ و ئاگایی خۆی راگرتووە بۆ "دیۆتیما" کە خەریکی قسە کردنە تا سروشتی خۆشەویستی یان وەك خۆی دەڵێت "نهێنییەکانی خۆشەویستی"ی فێر بکات، لەو کاتەشدا کە ئەم "تێڕامانە پیرۆزە" باڵی کێشاوە بە سەریاندا خوای خۆشەویستی "ئیرۆسی خواوەند Eros"[137] خۆی لێیان نزیك کردۆتەوە لە بەرگێکی کەهەنوتیدا کە پیاوانی ئایینی لە وەختی جێبەجێکردنی سروت و ریتواڵە ئاینییەکاندا لەبەری دەکەن».

لێکۆڵەرێکی تر ئەویش "پۆلینۆ مەنگازینی Palino Mangzzini"ــیە، دەڵێیت وێنەی ئەو پیاوەی لەو وێنەیەدا هەیە، هەمان وێنەی سوکراتە لە شێوەی دوو پەیکەری سەدەی چوارەمی زایینی. بە واتایەکی تر وێنەکە لەسەر پەیکەری سوکرات بەو شێوەیەی ئەسناییەکان دایانهێناوە، کێشراوە، لەکاتێکدا وا دەردەکەوێت ئیرۆسی خوای خۆشەویستی لە شێوەی بوونەوەرێکی ئەفسانەییە بە دوو باڵی فریشتەییەوە لە بەرامبەر وێنەی سوکرات و دیۆتیما.

وێڕای ئەوەی "مەنگازینی" بە راشکاوی دەڵێت –جگە لەم بەڵگەیە ــ ئایا کەسێك بە ناوی "دیۆتیما"، کە هەر ناشزانین پەیوەندی بە سوکراتەوە چی بووە هەیە یان نا، پاشان لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت:

«... بەلای ئەوانەی دیالۆگی "خوان"ی ئەفلاتوونیان خوێندۆتەوە گومانیان لەوە نییە دیۆتیما کەسێتییەکی راستەقینەیە و هاوشێوەی ئەو وێنە کێشراوەیە»...

سەرەڕای ئەوەش ئێمە دەبینین پێی وایە ئەو وێنە راستەقینەی سوکرات و "دیۆتیما" کە لە سەر بەرگی سندوقە برۆنزیەکە هەیە و ئەوەی "خوان" وێنای کردووە، دەبێت بەراوردی بکەین بەو وێنە برۆنزییەی دیکە کە هەردوو لای

سندوقەکەی داپۆشیوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ٣٤٠ ــ ٣٣٠ پ.ز، وێنە کێشراوەکانی "خوان" ڕەنگە جۆرێك بێت لە زیندوڕاگرتنی یادی ئەو ئاهەنگەی "ئەگاسۆن" سازی کردووە ــ یان لەوانەیە بە بۆنەی جەژنی سەد ساڵەی دیداری سوکرات لەگەڵ "دیۆتیما" بووبێت، کە ساڵی ٤٤٠ پ.ز ڕوویداوە، بەتایبەتیش ئەمە تەنیا حەڤدە ساڵ دوای مردنی خودی ئەفلاتوون دەرکەوتووە، ئەویش ئەوکاتەی "سپیسپوس Speusippus"ی خوشکەزاکەی سەرۆکایەتی ئەکادیمیای دەکرد. بۆیە دوور نییە کەسێتی دیۆتیما ڕاستەقینە بووبێت، نەك کەسێکی وەهمییانەی دروستکراوی خەیاڵ، نەك کەسێکی ئەفسانەییش، بە دڵنیاییشەوە ئەفلاتوون دەزانێت دیۆتیما ڕاستەقینە بووە یان نا. مادام ئەفلاتوون ئەوە دەزانێت، کەواتە چۆن دەکرێت قوتابییەکانی، کە بێگومان مشتومڕیان لەگەڵ کردووە و هاوکارییان کردووە لە ئامادەکردنی دەستخەتە شوێنەوارییەکەی دیالۆگەکە، لە بابەتی کەسایەتی دیۆتیمادا هەڵەیان کردبێت..؟!

راستییەکەی دۆزینەوەی ئەم سندوقە برۆنزییە بەڵگەیەکی شوێنەواناسانەی گرنگمان دەخاتە بەر دەست کە بە توندی پشت ئەستووری بوونی "دیۆتیما"، وەك کەسێکی ڕاستەقینە دەکات، وێڕای هەموو ئەوانەیش گەواهییەکی نووسراومان هەیە، وا لە خوارەوە دەیخەینەڕوو[١٣٨].

## حەوتەم: گەواهییەکی نووسراو

ناوی "دیۆتیما" لە ماوەی پێنج سەدەدا نەهێنرا، نە لە شانۆدا، نە لە کاری ئەدەبیدا، نە لە هیچ کتێبێکی مێژوو یان ئینسکلۆپیدیا یان کتێبێکی فەلسەفیدا، زانیارییەکانی و فەلسەفەکەی لەبارەی "خۆشەویستی ئیرۆتیکی"ــیەوە تەنیا لە دیالۆگی بەناوبانگی "خوان"ــی ئەفلاتووندا باس کراوە.

پاشان لە سەدەی دووەمی زاینیدا لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی دیکەی ژندا وەکو "تارگێلیا Thergelia" و "ئیسپازیا Aespassia" لە شانۆیەکی کۆمیدیی

نووسەری یۆنانی "لوسیان Lucian"دا بە ناونیشانی "خەساو The Eunch" دەردەکەوێتەوە، کە بە دەرخستنی حەقیقەتێکی واقیعی لەبارەی "دیۆتیما" و "تارگێلیا" و "ئیسپازیا" دەست پێدەکات، کاتێك نووسەرەکە وا ئاماژەیان پێ دەکات کە ژن دەتوانێت ببێتە فەیلەسوف، جا "ئەمانە لە جیهانی کۆندا ژنانێکی فەیلەسوف بوون". ئەوەی راستی بێت نووسەرەکە لە کۆنتێکستی تکاکردنی "خەساو" لە "دیۆکلیس Diocles"ـدا باسیان دەکات، بۆ ئەوەی کارئاسانی بۆ بکات وەزیفەیەکی فەرمی وەك مامۆستای فەلسەفە وەربگرێت، ئەویش لەو کاتەدا وەك "نێرەموکێك" تەماشای "خەساوەکە" دەکات، واتە وەك ئەوەی پیاوێکی رەسەن نییە، بەڵکو ژنانییە، لەم روانگەیەشەوە تکاکردنی "خەساوەکە" بۆ کارکردن لە کایەی فەلسەفەدا، ئەگەر لەڕووی مێژووە ئەوە سەلمێنراوە فەیلەسوفانێکی ژن هەبوون، لەبارەیانەوە زانراوە بە فەلسەفەوە سەرقاڵ بوون و خوێندویانە، نەك ئەوەی تەنیا لای ئەم یان ئەو فەیلەسوف قوتابی بووبن ــ ئەگەر هەموو ئەمانە راست بن، ئەوا "خەساوەکە" کە "پیاو ــ ژن"ـە مافی خۆیەتی رەزامەندی بۆ بوون بە مامۆستا لە بواری فەلسەفەدا بەدەست بهێنێت، رێی دروستکردنی کۆمەڵێك قوتابی پێ بدرێت کە لای بخوێنن، ئا لێرەدایە دەبینین ئاماژە بە سێ ژنە فەیلەسوف دەدات، ئەوانیش: "ئیسپازیا" و "دیۆتیما" و "تارگێلیا"ــن!

رەنگە نووسەرەکە ویستبێتی لە یەك کاتدا گاڵتە بە "خەساوەکە" و "ژنە فەیلەسووفەکان"یش بکات! لەوانەیە ویستبێتی بڵێت ژنە فەیلەسوفەکان لەو "خەساوە" دەچن کە سیفەتی مێینەی هەڵگرتووە، کەچی دەیەوێت خۆی بە پیاو بچوێنێت و فەلسەفە بڵێتەوە. بەڵام ئەمە رووینەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەقی سەرەکی پاساوەکە لە دەوری ئەوە ئەسوڕێتەوە کە ئایا دەکرێت "خەساوەکە" بە مامۆستایەکی گونجاو دابنرێت بۆ لاوەکان لە تەمەنی خەوندا...؟! تەنیا ئەو ئاماژەیە هەیە کە "دیۆتیما" و "تارگێلیا" و "ئیسپازیا" فەیلەسوفانێك بوون کە بە کردەیی

مومارەسەی فەلسەفەیان کردووە، تایبەت بە "دیۆتیما"ش تەنیا ئەو ئاماژەیە هەیە کاهینێکی فەیلەسوف بووە کە لە مێژە مردووە"[139]!!

کتێبانێکی تر هەیە لە سەدەی دووەمی زاینیدا، کە راستەوخۆ ئاماژەیان بە "دیۆتیما" کردووە بە بێ بوونی هیچ گومانێك لە بوونی مێژوویی و کەسایەتی راستەقینەی ئەو، ئەریستیدز Aristides لە وتارەکانیدا Orations ئاماژەی بە "دیۆتیما" کردووە، هەروەها یەکێك لە شرۆڤەکەرانیش لە نامەکانیدا بۆ ئەریستیدز ئەمەی کردووە[140].

هەروەها لە سەدەی دووەمی زاینیدا "ماکسیمۆس Maximus ـی تێری"ی (لە شاری Tyre کەناری باشووری لوبنانەوە هاتووە) لە دەوروبەری ساڵی ١٢٥ ــ ١٨٥ ز ئاماژەی پێکردووە، کە سێ جار باسی دیۆتیمای کردووە.

هەروەها دەتوانین ئاماژە بە کلیمنت ئەسکەندەری (١٥٠ ــ ٢٢٣ ز) بکەین کە لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەم و سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی زاینیدا ژیاوە، کە ئەویش لە کتێبەکانیدا باسی "دیۆتیما"ی کردووە.

لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی زاینیدا دەبینین سێمستیوس Themisyius (٣١٧ ــ ٣٨٨ ز) ی سیاسەتمەداری یۆنانی، یان شرۆڤەکەری بەرهەمەکانی ئەرستۆ باسی دیۆتیمای کردووە وەك مامۆستای سوکرات.

بگرە پرۆکلس Proclus ـی دوا فەیلەسوفی ئەفلاتوونیزمی نوێ (٤١٠ ــ ٤٨٥) لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی زاینییدا ــ سێ جار ئاماژەی بە "دیۆتیما" کردووە، دەڵێت ئەو لە سەردەمی ئەفلاتووندا کەسایەتییەکی راستەقینە بووە، تەنیا کەسێتییەکی خەیاڵی نییە.

بەم جۆرە دەبینین نۆزدە سەدە بەسەر سەردەمی ئەفلاتووندا تێدەپەڕێت، واتە لەو سەردەمەوە کە دیالۆگی "خوان"ی لە دەوروبەری ٣٨٨ پ.ز تێدا نووسراوە تا ساڵی ١٤٨٥، کاتێك "مارسیلۆ فسینۆ Marcilio Ficino"[141] ـی فەیلەسوفی ئیتالی "وتارە"کەی بلاو کردەوە، تاکە بیرۆکەیەك نابینین بلێت "دیۆتیما Diotima"

کەسێتییەکی راستەقینە نەبووە، چاوی بە سوکرات کەوتووە و گفتوگۆیەکی بە ناوبانگ لەنێوانیاندا روویداوە کە ئەفلاتوون لە دیالۆگی "خوان"دا تۆماری کردووە. بەم جۆرە "دیۆتیما" بۆ ماوەی نۆزدە سەدە —وەك توێژەرەکان و فەیلەسووفەکان و بەڵگە شوێنەوارییەکان دووپاتی دەکەنەوە ــ کەسایەتییەکی راستەقینە بووە و بوونێکی مێژوویی هەبووە. رەنگە سەرنجی فسینۆی فەیلەسوفی ئیتالی لە حوکمێکی پێشوەختەوە هاتبێت کە پێشتر لە زەینیدا بووە، لەوانەشەوە سەرچاوەکەی داب و نەریتە زاڵەکان بووبێت، ناوەرۆکەکەی ئەمەیە: بێ مانایە قسە بکەین لەبارەی، بگرە هەر بیریش لە بوونی "فەیلەسوفی ژن" بکەینەوە، یاخود زۆر ئەستەمە وێنای بوونی (ژنێکی فەیلەسوف) بکەین، چوون ئەو دوو وشەیە پێك دژن و لە یەك گوزارشتدا یەك ناگرن کە بتوانین هەبوونی مرۆیی پێ پەسن بدەین!

ئەم بڕیارە پێشوەختە ئەو رێسایەبوو کە پێنج سەدەی دواتر پشتی پێ بەست، ئەو بیرۆکەیە دەرکەوت کە دەڵێ "دیۆتیما" کەسێتییەکە خەیاڵی بووە ئەفلاتوونی ئەدیب دایهێناوە، هیچ نییە جگە لە بەڵگەیەك لەسەر لێهاتوویی و توانای ئەدەبی ئەم فەیلەسوفە، بێ ئەوەی زەحمەتی وەڵامدانەوەی ئەو بەڵگانە بدەنەوە کە پێشتر لەبارەیانەوە دووایین، بەتایبەتیش بەڵگە شوێنەوارییەکان![١٤٢].

### هەشتەم: تیۆرەكانی دیۆتیما

#### ١- سروشتی خۆشەویستی

وەك سوكرات دەگێڕێتەوە ــ "دیۆتیما" پێی وابووە خۆشەویستی سروشتێكی تایبەتی هەیە كە دەتوانین ناوی بنێین "نێوانكارەیی/ الوسگیە"، نە جوانە نە دزێو، نە چاكەیە نە خراپە، بەڵكو نێوانێكە لەنێوان ئەمیان و ئەویاندا، وەك چۆن حاڵەتی عەقڵ لەنێوان دانایی و جەهلدایە، مرۆڤ بیروباوەڕێكی دروستی هەیە بەڵام ناتوانێت بەڵگە بۆ دروستییەكەی بهێنێتەوە، هەر ئاوەهاش خۆشەویستی نە جوانە و نە چاكە، نە دزێوە و نە خراپە، بەڵكو "نێوانی نێوان"ــە، وەك چۆن لەنێوان بوونەوەرێكی فانی و هەبوویەكی سەرمەدیدایە، نیوە مرۆڤە و نیوە خودا، پێغەمبەری خواوەندەكانە بۆ خەڵكی، نێردراوی خەڵكییە بۆ لای خواوەندەكان، نوێژ و نزا و قوربانی و قوربانیكردنەكانی خەڵكی بۆ لای خواوەندەكان بەرز دەكاتەوە، لە خواوەندەكانیشەوە فەرمان و نەهی، پاداشت و سزاكان بۆ خەڵكی دەگوازێتەوە، لەبەرئەوەی سروشتێكی هاوبەشیشی هەیە بۆیە دەتوانێت بەو بەرداشەدا تێپەڕێ كە دەتوانێت دونیای خەڵكی لە جیهانی خواوەندەكان جیا بكاتەوە. بۆیە گەردوون بۆ دوو بەشی تەواو لێك جیا دابەش ناكات[١٤٣].

#### ٢- لەدایكبوونی خۆشەویستی:

"دیۆتیما" پێی وایە خەسڵەتگەلێكی پێكدژ لە سروشتی خۆشەویستیدا هەیە: وەك كۆكردنەوە نێوان بوونی فانی و بوونی سەرمەدی، جوانی و دزێوی، چاكە و خراپە، دانایی و جەهل، كە دواجار دەگەڕێتەوە بۆ لەدایكبوونی خۆشەویستی، ئەوەش لە راڤەكردنی ئەم چیرۆكەدا دەگێڕدرێتەوە:

خواوەندەكان ویستییان بە بۆنەی لەدایكبوونی "ئەفرۆدێت Aphrodite"ــی خواوەندی جوانی و سێكسەوە ئاهەنگ بگێڕن، بۆیە "زیۆس Zeus"ــی گەورە

خواوەند خوانێکی گەورەی ساز کرد کە: "پۆرۆس Poros"ــی خواوەندی دەوڵەمەندی تێیدا ئامادەبوو، دوای خواردنی شێوان "پێنیا Penia" "پێویستی یان هەژاری" دزە دەکاتە سەر ئەو خوانە و بە دوای شتێکدا دەگەڕێت، بە پاڵ دەرگایەکەوە وەستا، "پۆرۆس" —خواوەندی دەوڵەندی و ساماندارییی ــ لەبەر زێدەڕەویی لە خواردنەوەی مەیی خودایی، چوو بۆ لای زیۆسی هاوڕێی و مەستی گرتی و لەژێر دارێکدا لێی نوست، "پێنیا"ش وای بە بیردا هات کەمێك لەو نەگبەتی و کلۆڵییەی خۆی سوك بکات بە سکپڕبوون بە منداڵێك لە "خواوەندی دەوڵەمەندی" بۆیە لەگەڵی نوست و بە "خۆشەویستی" سکپڕ بوو! کەواتە خۆشەویستی «لە ئاهەنگی لەدایك بوونی ئەفرۆدێتی خواوەندی جوانیدا بۆتە سك، لەبەرئەوە تاسەیەکی زۆری تێدا دەبینیتەوە بۆ جوانی، کاتێکیش باوکی "دەوڵەندیی"ــی و دایکیشی "هەژاری"ــیە ئەوا خۆشەویستی ئەم خەسڵەتە دژ بە یەکانە هەڵدەگرێت[١٤٤]، هەژارێکی نەدارە، لەسەر زەوی و کەلاوەکان و کۆڵان و رێگەکاندا رادەکشێت، ئەمەی لە دایکییەوە بۆ ماوەتەوە، وەلیێ لەلایەکی دیکەوە، هەولێکی کۆڵنەدەرانە دەدات بۆ چاکە و جوانی: پردەکان، ئازایەتییەك کە خوازیاری دانایییە و هەوڵ بۆ باڵابوون دەدات! ئەمەیشی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە، بۆیە سەیر نییە کە پیاوێکی هەژار شەیدای ژنێکی دەوڵەمەند ببێت یان بە پێچەوانەوە، چونکە ئەمە خاسیەتی خۆشەویستییە: خۆشەویستی پێکهاتەیەکە لە دەوڵەمەندی و هەژاری، لە جەهل و دانایی، لە هێز و لاوازی، لە "پێنیا" و "پۆروس"[١٤٥]!!

هەروەها خۆشەویستی خۆشەویستی حیکمەتە: چونکە حیکمەت شتێکی جوانە، خۆشەویستی خۆشەویستی جوانییە، چونکە لە ئاهەنگی لەدایکبوونی "ئەفرۆدێت"ــدا بوو بە سك، بۆیە تاسەیەکی زۆری بۆ جوانی تێدا رسکا، بەڵام کاتێك خۆشەویستییە بۆ دانایی، ئەوا مانای ئەوەیە کە نە دانایە و نە جاهیل، بەڵکو نێوانێکە لەنێوان حیکمەت و جەهلدا، ئەوەش دەرەنجامێکی ترە لە

لەدایکبوونەکەیەوە دروست بووە چوونکە باوکی دانایەکی زیرەك بوو (دەوڵەمەندی و ساماندارییی) و دایکیشی جاهیلێکی بێ توانا (کلۆڵی و هەژاری و پێویستی)!

### ٣- مایەی خۆشەویستی بۆ خەڵك

"دیۆتیما" وای دەبینێت خۆشەویستی بە گوێرەی لەدایکبوونی، بە پێی سروشتی خۆی، بریتییە لە خۆشەویستی جوانی —وەك پێشتر باسمان کرد ــ ئەگەر بپرسین، جوانی لە چی پێك دێت.؟! یان ئامانجی خۆشەویستی چییە کە عاشقی جوانی هەوڵی بۆ دەدات..؟! وەك دیۆتیما وەڵامی داوەتەوە: ئامانجەکەی بریتییە لە هەبوونی شتە جوانەکان. خۆ ئەگەر جارێکی دیکەش پرسیمانەوە: ئەی ئەوەی خاوەنی جوانی بێت بە کەڵکی چی دێت؟ ئەوا وەڵامەکە برتییە لە خستنەڕووی پرسیارێکی تر: ئەوەی کە دەستی بە چاکە دەگات چی وەدی دێنێت؟ دۆخی جوانی هەمان دۆخی چاکەیە، یەك وەڵام بۆ هەردوو دۆخەکە هەیە: ئەویش ئەوەیە بەختەوەری بۆ خۆی وەدی دێنێت، بەختەوەری لە هەبوونی چاکەدایە. هەمان شتیش لەبارەی خاوەندارێتی جوانییەوە بڵێ، بۆیە بەختەوەری لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئامانجە، ئێ خۆ ناکرێت لێمان بپرسن بۆچی مرۆڤ ئەیەوێت بەختەوەر بێت...؟!

لەبەرئەوەی بەختەوەری دوا ئامانجی هەموو کردەیەکی مرۆییە، ئەوەش ئەوپەڕی ئامانجی هەر رەفتارێکی مرۆییە.

### ٤- خۆشەویستی.. چەند جۆرێکە!

بەڵام ئایا هەموو خەڵکی دەیانەوێت خاوەنی چاکە بن؟ ئایا خۆشەویستی لەنێوان هەموو خەڵکیدا هەیە..؟ خۆ ئەگەر ئەمە وا بێت، ئەی بۆچی دەبینین هەندێ خەڵك خۆشەویستی دەکەن، هەندێکی تریان خۆشەویستی ناکەن؟

"دیۆتیما" —بە گشتی ــ وایدەبینێت ئێمە "جۆرێك" لە خۆشەویستی دادەتاشین و ناوی دەنێین "خۆشەویستی" ئەمە لە کاتێکدا وشەی "خۆشەویستی" بە

رەگەزێك، یان جۆرێکی گشتگیرتر و بەرفراوانتر لەم بەکارهێنانە بەرتەسکە دەوترێت، رەنگە ناوی جیا جیامان لە جۆرەکانی یەکەم خۆشەویستیش نابێت، بە واتایەکی تر "خۆشەویستی" ناوی رەگەزێکە بە هەموو ویستێك بۆ چاکە و بەختەوەری دەوترێت. ئەوەش حەقیقەتی خۆشەویستییەکی بەهێز و زاڵە. بەڵام ئەو ویستە بە ئامرازی جیاواز گوزارشت لە خۆی دەکات، لای خەڵکانێك "ویستەکە" بەرەو خۆشەویستی سامان ئاراستە دەکرێت، لای هەندێکی دیکە بەرەو خۆشەویستی هێزی جەستەیی، لای هەندێکی تریش بەرەو خۆشەویستی "حیکمەت"، بەڵام هەمیشە لەبارەی ئەو کەسانەوە ناڵێین "خۆشویستراو"ن (بابەتی خۆشەویستی) چونکە کردەی خۆشەویستی لەو کەسانەدا کورت دەکەینەوە کە بەرەو لایەکی دیاریکراو ئارەزووەکانیان ئاراستە دەکەن بۆیە پێیان دەڵێین ئەویندار (سۆبژەی خۆشەویستی).

### ٥- خەڵکی چۆن گوزارشت لە خۆشەویستی دەکەن؟

لە پێناسەی خۆشەویستی و روونکردنەوەی سروشتەکەی بوینەوە، ئێستا دەبێت ئەوە دەر بخەین کە: چۆن چۆنی خەڵکی گوزارشت لە ویستی خۆیان بۆ خاوەندارییی هەمیشەیی چاکە دەکەنەوە، ئەگەر باوەڕمان بەوە هێنا کە هەموو خەڵکی چاکەیان خۆشدەوێ و هەمیشەش ئامانجیان هەبوونیەتی؟

#### أ- لەدایکبوونی ئەوەی جوانە:

"دیۆتیما" پێی وایە لەدایکبوونی جوانی دوو جۆرە، دەکرێت بە جەستە بێت یان لە رێگای رۆحەوە. کاتێك مرۆڤ دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن، ئەوا هەست بە ویستێکی سروشتی بۆ لەدایکبوون دەکات، بەڵام ناتوانێت ئەمە بکات تەنیا لەڕێگەی جوانییەوە نەبێت نەك دزێوی، شتێکی خودابیش لەم پرۆسەیەدا هەیە، لە سکپڕی و لەدایکبووندا بوونەوەری فانی بەختی نەمربوونی بۆ هەڵدەکەوێت. پرۆسەکەش بێ گونجان و تەبایی سەر ناگرێت. دزێوی لەگەڵ خوداییدا ناگونجێت، لەکاتێکدا جوانی لەگەڵیدا تەبا دەبێت، لەبەرئەوە خواوەندی جوانی ئەو خواوەندەیە کە چاودێری

لەدایکبوون دەکات، کاتێکش مرۆڤ هەست بە ئازارەکانی دۆخەکە دەکات، ئەوا ئەوە پەیوەستە بە جوانییەوە، هەست بە ئاسوودەیی دەکات، هەست بە شادییەکی چێژبەخش دەکات، هەموو ئەمانەش لەدایکبوون سووك و ئاسان دەکەن. بەڵام دزێوی و ناشیرینی بە پێچەوانەی ئەمەوە روو دەدەن، کە مرۆڤ دڵی دەگوشرێت، بە ئازار و بێ هیواییەوە بە خۆیدا دەشکێتەوە، منداڵبوونی نارەحەت دەبێت، ئازارەکانی سکپڕی هەڵدەگرێت، منداڵەکەی نابێت، بەم جۆرە دەبینین کاتێك کەسێك سکپڕە و ژان دەیگرێت، بە توندی بەرەو جوانی کێش دەکرێت، چونکە جوانی یارمەتی دەدات بۆ حەوسەڵکردنی ئازارەکانی ژانەکە[١٤٦].

خوێنەر لە سەرنجدانی ئەم بیرۆکەیە و پەیوەندییەکەی بە گوزارشتکردن لە خۆشەویستی، کە دیۆتیما بۆ سوکراتی دەخاتەڕوو، هەست بە سەختی دەکات، بەڵام بیرۆکەکە بەو رادەیەش قورس نییە، خۆشەویستیی سێکسی کە ئاراستەی ژن دەکرێت ئامانجی لەدایکبوونی جیلێکی نوێیە کە پیاو دووبارە بکاتەوە. بەڵام خۆشەویستیی هزرەکان ئامانجی لەدایکبوونێکی روحیە کە پێدانی بیرۆکەی نوێیە، ئەمەش ئەشێت لە پیاودا رووب بدات، چوون لێرەدا "سکپڕی" سکپڕییەکی هزرییە و جیلێکی نوێی هزریمان بۆ بەرهەم دێنێت، بەڵام "لەدایکبوون" گوزارشتە لە خۆشەویستی لە دوو حاڵەتدا، ئەی بۆچی لەدایکبوون ئامانجی خۆشەویستییە؟ وەڵامەکە ئەوەیە لەدایکبوون ئەبێتە مایەی جاویدانەگییەك کە بوونەوەری فانی هەوڵی بۆ دەدات، جا ئەوە لەدایکبوونێکی جەستەیی نەوەیەکی نوێی مرۆیی بێت یان لەدایکبونێکی روحی هزرە نوێیەکان، لە هەردوو دۆخەکەدا هەوڵ بۆ نەمریی دەدات: جاویدبوونی مرۆڤ لە رێگەی لەدایکبوونەوە، یان نەمریی لەرێگەی هزرەکانییەوە، کاتێکیش خۆشەویستی وەك وتمان خاوەندارییەکی بەردەوامی چاکەیە، ئەوا دەبێت ویستی بۆ جاویدبوونی ویستەکەی بۆ چاکە هەبێت، لەوەشەوە پێویستە خۆشەویستی خۆشەویستیی نەمریی بێت وەك چۆن خۆشەویستیی چاکەیشە. ئەمەش گوزاشتێکی ترە لە خۆشەویستی، یان وێنەیەکی ترە لە وێنە زۆرەکان.

### ب- هۆکاری خۆشەویستی و ئارەزوو:

"دیۆتیما" پێی وایە ئەوەی بەسەر ئاژەڵاندا دێت شیاوی وردبوونەوە و سەرنجدانە، چونکە ئاژەڵان بە باڵندە و دڕندە و گیانەوەرەکانەوە..هتد کاتێك ئارەزووی لە وەچەخستنەوە دەبێت، نێچیرەکەی دەخاتە نێو رەزامەندی خۆشەویستییەوە بۆ ئەوەی پێکەوە جووت بن، ئینجا هەوڵ دەدات بۆ دابینکردنی خواردن بۆ بێچووەکانی، لە پێناو ئەم دوو ئامانجەشدا هەتاکو مردن دەجەنگێ و ململانێ دەکات، ئێشی برسێتی و ئازار دەچێژێت، هەموو ئەمانە لەپێناو پاراستنی وەچە و بەردەوامێتی رەگەزەکەیە، رەنگە گوتبێتمان "عەقڵ" پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە رەفتارە، بەڵام ئەمە راڤەیەکی هەڵەیە، ئەوەی بۆ ئاژەڵ راستە بۆ مرۆڤیش راستە، جا سروشتی فانیش ئەوەیە کە ستایشی مانەوە و نەمریی دەکات، ئەم کارەیشی بە رێگای لە دایکبوون و وەچەخستنەوەیە. لە دایکبوون ئەوەیە تاکی لەدایکبوو دەخاتە جێی تاکی مردوو، بەم جۆرە تاك بوونەوەرێکی تازە دروست دەکات کە دەبێتە بەردەوامیدەری، کتومت وەك ئەوەی خانەگەلێك لە جەستەی لەنێو دەچێت و خانەگەلێکی دیکە سەر لە نوێ جێیان دەگرنەوە، ئەم پرۆسەی نوێبوونەوەیە قژ و ئێسك و گۆشت و خوێنیش دەگرێتەوە، واتە هەموو جەستەی، هەر بەو جۆرە روحیشی دەگرێتەوە. کەسێتی تاك لە یەك دۆخدا جێگیر نابێ، وەك چۆن لە یەك شێوازیشدا خووەکانی و ئارەووەکانی و خۆشبەختی و ئازار و ئومێدەکانی چەق نابەستێ، هیچ شتێك لەمانە وەك ئەوەی کە هەن جێگیر و نەگۆڕ نین، بەڵکو بە بەردەوامی نوێبدەبنەوە و نەرمی و مرونەتیان تێدایە، هێشتایش ئەوەی کە تازەیە جێی کۆن دەگرێتەوە.

### ج ـــ زانین (مەعریفە):

"دیۆتیما" دەڵێت ئەوەی بەسەر بەشەکانی زانیندا دێت شیاوی سەرنجدانە: هیچ شتێك بە تەواوەتی لە مەعریفە شاراوە نییە، هەروەها لە پەیوەندیدا بە مەعریفەوە،

شوناسی خۆمان بەو جۆرە ناپارێزین وەك ئەوەی لە بوارەكانی تردا دەیكەین، بەڵكو هەر بەشێك لە بەشەكانی زانین ملكەچ دەبێت بۆ پرۆسەی گۆڕین و ئاڵوگۆڕ كە جەستە ملكەچی دەبێت، هەر كردەی یادهاتنەوەش خۆی واتای لێ جیابوونەوەی مەعریفەیە، بۆیە لەبیركردن بریتییە لە ترازانی زانین، بیرهاتنەوەش بریتییە لە پاراستنی مەعریفە لە ڕێگەی لەجێدانانی بیرۆكەیەكی نوێ لەجێی ئەو بیرۆكەیەی لەدەست چووە، بەم جۆرەش دەبینن شوناسێكی وەهمی بە بەردەوامی لە مەعریفە دادەماڵێن. بەم جۆرەش بوونەوەرە فانییەكان مانەوە و نەمریی وەدی دێنن. ئەو وەك ئەوەی هەیە وەك بوونەوەرە جاویدانەكان نییە، چونكە ئەمە تەنیا سیفەتی خواوەندەكانە، بەڵكو بە پرۆسەی خستنەوەجێی (تعویچ) تاكێك بە تاكێكی تر لە ڕەگەزی مرۆییدا.

### د- هەوڵدان بۆ نەمریی:

كەواتە بوونەوەری فانی دەیەوێت مانەوە و نەمریی لە ڕێگای نەوەی نوێیەوە بۆ خۆی مسۆگەر بكات، چونكە ئەو لە خۆیدا ناتوانێت نەمر بێت، مرۆڤ خواوەند نییە كە بوونێكی سەرمەدیی هەبێت، بەڵكو بوونەوەرە و ئەگەر شتێك بدۆڕێنێ شتێكی تر دەخاتەوە جێی، ئەگەر هەموو جەستەیشی لەدەست بدات لە نەوەكەی خۆیدا دووبارەی دەكاتەوە، بەم شێوەیەش دەتوانێت بە ڕێگای تایبەتی بەشداریی لە نەمریدا بكەن. هەر بوونەوەرێكی زیندوو بە سروشتێكی لەم جۆرە خۆی دەپارێزێت، هەر لێرەشدایە ئەو هۆكارەی وا لە تاك دەكات سەرقاڵ بێت بە خۆشەویستییەوە تاكو مانەوە و نەمریی بۆ خۆی دەستەبەر بكات. خۆشەویستی ناوبانگ و شكۆمەندی كاریگەرییەكی بەهێز لە خەڵكی دەكەن، وەلێ خۆشەویستی نەمریی شتێكی ترە، چونكە بێ باك لەو مەترسییانەی كە گەمارۆیان دەدەن بەرەو ڕووی سەوڵ لێدەدەن، بگرە ئەگەر پێویست بێت قوربانی بە ژیانی خۆیشیان دەدەن، ئایا "ئیلیكستیس"[١٤٧] دەیتوانی لە پێناو هاوسەرەكەیدا "ئەدمیتۆس Admetus"ـی، شای تسالیا بمرێت،

یاخود ئەخیل خۆی بخاتە بەردەمی مردن لە پێناو "کۆرۆدۆس Korodos"[١٤٨]ــی هاوڕێیدا، شای "ئەتیکا" بمرێت، تا وڵاتەکەی لە داگیرکاریی دەورییەکان رزگار بکات[١٤٩]، شاکەی خۆی بۆ نەوەکان بپارێزێت، ئایا هەموو ئەمانە دەیانتوانی بمرن ئەگەر یەقینییان لە نەمریی ناو و نیشانیان نەبووایە؟ نەخێر ویستی شکۆمەندی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ کاری ناوازە و دەگمەن، هەرچی چەندەیش مرۆڤ بەرزتر بێتەوە حەزی بۆ نەمریی زیاد دەکات. بەڵام ئەوانەی غەریزە داهێنەرانەکانیان بەرەو سێکس ئاراستە دەکەن، ئەوا غەمییان دەبێتە ژن، خۆشەویستییەکەیشیان دەبێتە خۆشەویستییەکی سێکسییانەی پەتی، دەیانبینیت وا گومان دەبەن نەمریی خۆیان بە خستنەوەی منداڵ بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن، بەڵام خەڵکانێکی تر هەن مەیلە داهێنەرانەکانیان مەیلی روحین، بە روح سکپڕ دەبن نەك بە جەستە، وەچەی روحییانەی وەك حیکمەت و فەزیلەت و..هتد بەرهەم دێنن، وا دیاریشە باشترین و سەربەرزانەترین لقی حیکمەت ئەوەیە کە رێکخستنی دەوڵەت و خێزان دەگرێتەوە، ئەویش: میانەگیری و دادوەرییە.

ئەوەی وەچەی روحی دەخاتەوە بەختەوەر ترە: چونکە منداڵەکانی (لەم دۆخەدا واتە هزرەکان) لە منداڵەکانی مرۆڤ جیاوازن، جوانتریشن لە منداڵەکانی بنیادەم، گومانیشی تێدا نییە خەڵکی ئەم منداڵانەیان پێ باشترە لەو منداڵانەی لە گۆشت و خوێنن، منداڵەکانی وەك "ئەلیادە" و "ئۆدیسە" و"نەسەبی خواوەندەکان" و"کارەکان و رۆژەکان"..هتد، ئەمانە ئەو منداڵانەبوون کە ناوبانگ، سەربەرزی و نەمرییان بۆ باوکانیان پەیدا کردووە، تەنانەت هەندێکیان هێند براوە بوون لەلایەن مرۆڤەوە پەرستراون بەهۆی ئەو منداڵە روحییانەوە کە لەدوای خۆیان جێیان هێشتوون، ئەمەش ئەو شتەیە کە هەرگیز لە مرۆڤدا بە هۆی منداڵە گۆشت و خوێنەکانییەوە رووی نەداوە.

### ٦- پەیژەکانی روح لە رێگای نەمریدا:

"دیۆتیما" وای دەبینێت ئەو پیاوەی کە دەیەوێت ئەو رێگا راستە بگرێتە بەر کە دەیگەیەنێت بە ئامانجە باڵاکەی، ئەویش نەمرییە، دەبێت هەر لە منداڵییەوە لە جوانی مرۆیی رابمێنێت، خۆ ئەگەر رێنماکەی بە باشی رێنمایی بکات ئەوا یەکەمجار بەرەو خۆشەویستی لاوێکی جوانی ئاراستە دەکات، پاشان بەرەو دەرکبردن بەوەی جوانی مادیی لە کەسێکدا هەمان جوانی مادییە لە کەسێکی دیکەیشدا، ئەگەر ستایشی جوانی رواڵەتیش بکات، ئەوا بێ مانایە ئەگەر دان بەوەدا نەنێت ئەو جوانییەی کە لە هەموو جەستەکاندا دەردەکەوێت هەر یەك جوانییە، لێرەدا دەبێت خۆشەویستییەکەی خۆی ئاراستەی جوانی بەشێوەیەکی گشتی بکات، بە جۆرێك کە خۆشەویستییەکەی بۆ خودی ئەو کەسە لاواز بکات، چونکە ئەوە دەزانێت ئەم هەست و سۆزە کەمتر بایەخی هەیە، دەبێت لێی بپەڕێتەوە بۆ قۆناغێکی تر، بەم جۆرەش بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستێکی باڵاتر، تا ئەوەی دەگاتە قۆناغێك کە جوانی روحی زیاتر لە جوانی جەستە رێزی لێ دەگیرێت، خۆ ئەگەر دەروونێکی خانەدانی خاوەن فەزیلەت لە جەستەیەکدا هەبێت کە بڕێکی جوانی ئەوتۆی نەبێت تا بە خۆشەویستییەکەی رازی بکات، بۆی دڵسۆز بێت، ئەوا ئەو بیرانەی بۆ دێت کە کار دەکەن بۆ بژارکردن و پەروەردەکردن، ئەوەش ئەو قۆناغەیە تێیدا خۆی دەبینێتەوە لەو جوانییە رادەمێنێ کە لە کار و سیستەمە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت، دواجاریش بۆی دەردەکەوێت جوانییەکان پەیوەستن بە یەکترییەوە، ئەو کاتەیش رقبوونە لەوە جوانی مادیی، کاڵ و کرچییەکەی دەردەکەوێت بەراورد بە جوانی روح، ئەخلاقیش دەگات بە زانستەکان و لە جوانییان رادەمێنێت، بەوەش تێڕوانینی خۆی لە جوانیدا بە واتا فراوانەکەی کۆدەکاتەوە، ئیدی هەست و سۆزێکی بێ نرخ یان نموونەیەکی تاکییانەی جوانی، دووری ناخاتەوە جا بابەتی خۆشەویستییەکەی لاوێك بێت، یان پیاوێك یان کارێك لە کارەکان، یان سیستەمێك لە سیستەمەکان، ئەوەش لەو ناوچەیەی جوانیدا روودەدات کە لە ئێستادا نیگای تێی گرتووە، پاشان بەهۆی خۆشەویستییە لێوڕێژەکەیەوە بۆ

دانایی، هەست و سۆزەکان و هزرە خانەدان و شکۆدارەکان دێنێتە ئارا، خۆ ئەگەر بەهۆی ئەم ئەزموونەشەوە بەهێز بێت ئەوا چاو لە یەك زانست دەبڕێت کە بابەتەکەی جوانییە.

### ٧- ئامانجی خۆشەویستی:

لە روانگەی "دیۆتیما"وە ئەوەی بەم شێوەیە سەر لە "نهێنییەکانی خۆشەویستی" دەر بکات، لەم رێگەیەدا تا کۆتایی بەرز ببێتەوە، لە کۆتاییدا جوانییەکی ناوازە دەدۆزێتەوە کە لە هەموو قۆناغەکانی پێشتردا ئامانج بووە، ئەم جوانییە یەکەم و بەر لە هەر شتێك جوانییەکی جاویدانە، دووەمیش لە لایەکەوە جوان نییە و لە لایەکی دیکەوە دزێو، لەم کاتەدا بەم جۆرە نییە، لە کاتێکی تردا بگۆڕێت، بە جیاوازبوونی رەوشەکان و هەلومەرجەکانیش ناگۆڕێت..هتد، بەڵکو جوانییەکی رەهایە و تەنیا لە خۆیدا هەیە.

کاتێکیش مرۆڤێك لە جیهانی هەستەکیدا پشت بە جوانی لاوێك دەبەستێت، پاشان چاوی دەکەوێتە سەر ئەم جوانییە رەهایە، ئەوا لە ئامانجەکەیەوە نزیکە، ئەمەش رێبازە کۆنەکەیە بۆ توخنکەوتنی رازەکانی خۆشەویستی کە مرۆڤ پەیڕەوی لێ دەکات کاتێك نموونەکانی جوانی لەم جیهانەدا بۆ دەردەکەوێت، دەیانکاتە پلیکانەی سەرکەوتن و هەڵزنان بۆ لای ئامانجەکەی کە ئەو جوانییە باڵا رەهایەیە لە نموونەی جوانیی هەستەکییەوە، پاشان لە نموونە زیاتر، پاشانیش دەرکبردن بە هێڵی هاوبەشی نێوان هەموو رەنگەکانی جوانیی هەستەکی، ئینجا بەرزبوونەوە لە جوانیی هەستەکییەوە بۆ جوانیی ئاکاری، لە جوانیی ئاکارییشەوە بۆ جوانیی مەعریفە، لە مەعریفە و لقە جیاوازەکانیشیەوە، بۆ مەعرفەی رەها کە تاکە بابەتەکەی جوانی رەهایە[١٥٠].

ئا لێرەدا —لەم شوێنەدا و بە پاڵ جوانی رەهاوە دەبێت مرۆڤ تەمەنی خۆی لە تێڕامان لەم جوانییە رەهایەدا بباتە سەر، ئەو کاتەیش گرنگی نە بە زێڕ و زیو دەدات

و نه به جل و بەرگ و نه به بابەتی شەهوەت و ئارەزووەکان..هتد، بەڵکو به روونی ماهییەتێکی پاکی بێ گەرد، ماهیەتێکی پوختی بێ لەکە بەدی دەکات، هەر کەسێکیش بگاتە ئەم ئاستە دەتوانێت دەرك به جوانی بکات[151].

## نۆیەم: فەلسەفەی دیۆتیما و.. فەلسەفەی ئەفلاتوون

رەنگە کەسی وا هەبێت پێشگیری به قسەکانی پێشوومان بکات و بپرسێت: جا کێ دەڵێ هەموو ئەو تیۆرانەی کە خرانە روو، ناوت لێنان "تیۆرەکانی دیۆتیما" خۆیان تیۆری ئەفلاتوون نین؟ ئایا ناکرێت ئەفلاتوون فەلسەفەکەی خۆی لەسەر زمانی "دیۆتیما" وە خستبێتە روو، وەك چۆن هەندێ کات دەیانخاتە سەر زمانی سوکرات؟

زۆر بە کورتی ـــ وەڵامی ئێمە ئەوەیە: ئەو تیۆرانە زۆر بە روونی جیاوازە و هەندێ کاتیش پێکدژە لەگەڵ تیۆرەکانی ئەفلاتوون، وەلێ ئەم وەڵامە پێویستی بە شرۆڤە و راڤەکردن هەیە.

### ١- چاکە و.. جوانی:

رەنگەی لە سەرەتاوە، لەبارەی چاکەوە، لێکچوونێکی رواڵەتی لەنێوان ئایدیای ئەفلاتوون و ئایدیای دیۆتیمادا هەبێت، خۆ ئەگەر بەختەوەری لای "دیۆتیما" لە خاوەداریی چاکەدایە، ئەوا بۆچوونی ئەو بۆ چاکە بە تەواوی جیاوازە لە بۆچوونی ئەفلاتوون لەبارەی چاکەوە، ئەوەش لەبەرئەوەی چاکە لای دیۆتیما چاکەیەکی کەسی و خودییە، یان تۆ بڵێ چاکەیەکی خۆپەرستانە یاخود چاکەی مرۆڤ بۆ خۆیەتی، ئێمە دەزانین ئەوە هەوڵێکە بۆ بەدەستهێنانی نەمریی لە رێگەی وەچەخستنەوەی مرۆڤ خۆی لە میانەی ئایدیای جوانییەوە. هەروەها بیرۆکەی جوانی ئایدیای ئەفلاتوونیانەی جوانی نییە، بەڵکو بیرۆکەیەکە تەنیا لەسەر ئاستی رواڵەتەکان نەك لەسەر ئاستی ئایدیای ئەفلاتوونی.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین لای دیۆتیما "جوانی رەها" لەگەڵ ئایدیای چاکەدا بەو جۆرەی ئەفلاتوون لە "کۆمار"دا باسی کردووە یەکناگرێتەوە[152]، وێڕای ئەوەش زمانی دیۆتیما لە پەسندانی جوانیدا بە شێوەیەکی روون "ئیلی"ـیانەیە، ستانلی رۆزۆن دەبێژێت:

«لای دیۆتیما چاکە ئایدیایەك لە ئایدیاکانی ئەفلاتوون نییە. هەروەها روانگەی ئەو بۆ جوانی هەمان روانگەی ئەفلاتوون نییە بۆ ئایدیای جوانی.. پەسندانی جوانی لەلایەن دیۆتیماوە پێشوەخت گریمانەی تیۆری ئایدیاکان ناکات. بەڵام دەتوانرێت وەك بەشێك لە ئامادەسازی و پەرەپێدان لای سوکرات تێبگەیشترێت».[153]. هەروەها دەڵێت: «لە پەسنی دیۆتیمادا بۆ جوانی لە خۆیدا هیچ شتێك ناگەرێتەوە بۆ جیهانێکی تەواو دابڕاو لە رواڵەتەکان لای مرۆڤ، جیابوونەوەی جوانی وێنەیەکی دەگمەنە ناتوانین لە هیچ شتێکی تردا ببینین تەنیا بە هۆی ئەو ئایدیایەوە نەبێت کە تێدا شاراوەیە: تەنانەت ئەگەر راستیش بێت ئەفلاتوون کاتێك خوانی نووسیوە تیۆرەکەی لە بارەی ئایدیاکانەوە تەواو کردووە، ئەوا ئەم تیۆرە زۆر دوورە لە باس و خواسی "خوان"ـەوە»[154].

## ٢- جیهانبینی "دیۆتیما" بۆ جاویدانەگی:

لە دیالۆگی "خوان"ـدا دەروون دەتوانێت بگاتە نەمریی —بە واتا میتافیزیکییەکەی ـــ بەهۆی پرۆسەی منداڵبوون و وەچەخستنەوەوە.. بەوەی ناوێك یان سومعەیەك وەك جێکەوتێك جێ بهێڵێت..[155].

بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئەمە بەدەست بهێنێت؟ ئەگەر مرۆڤ بیەوێ شتێکی زیاتر لە ناو و سومعە جێ بهێڵێت، ئەگەر ویستی "هزرگەلێك" بخاتەوە و کاریگەری لەسەر ئەوانیتر دابنێت، ئەوا وەك هەنگاوی یەکەم، پێویستە یەکەمجار خۆی بناسێت، بزانێت خۆی کێیە؟ ئەی ئەو شوناسە کەسییە خودییە کام جۆرەیە کە "دیۆتیما" بڕوای پێیەتی..؟

### أ- جاویدانەگی و.. شوناسی کەسی:

ئامانجی "دیۆتیما" لە حیکایەتەکەیدا لەبارەی خۆشەویستییەوە شیکردنەوەی ئەوەیە کە بە تێپەڕبوونی کات لە بوونی مرۆیی دەمێنێتەوە، ئەو کاتەیش هچ شتێك لە کەسەکە نامێنێتەوە جگە لە سیفەتەکانی، لەبەرئەوەی پێی وایە بوونی پەیوەندیداری بەردەوامی بوونەوەری زیندوو واتە سیفەتگەلێکی تری لێکچوو جێگای ئەو سیفەتانە دەگرنەوە کە لەناوچوون.. بەم جۆرەش دەتوانین بڵێین ئێمە لە نەوەکانمان و وەچە هزرییەکانماندا نەمرین، ئەوەش لای دیۆتیما بیرۆکەی سەرەکییە لەبارەی شوناسی کەسییەوە، کە زۆر جیاوازە لەو وێنایەی ئەفلاتوون لە دیالۆگلا کیبیادسی یەکەمدا (۱۲۹ ــ ۱۳۰ز) پێشکەشی کردووە، لەوێدا ئەفلاتوون پێی وایە شتێکی سەرەکی هەیە ئەویش "من"ــە واتە قەوارەیەك کە لە پشت هەموو ئەو سیفەت و چۆنییەتیانەوە دەوەستێت شیاوی گۆڕانن، لێرەدا دەروون لەخۆیدا لە پشت هەموو گۆڕانە بەشەکییەکانەوە ئامادەیی هەیە، لەسەر ئەم بنەمایەش دەتوانین راڤەی ئەوە بکەین بۆچی "من" لە ئێستادا هەمان ئەو کەسەم لە چکۆلەییدا هەبووم، یان کاتێك منداڵ بووم. لەو کاتەی کە لەگەڵ هەموو سیفەت و چۆنیەتییەکدا تێیدام، بەجۆرێك کە ئەتوانم خۆم بناسمەوە، ئینجا کاتێك بوومە گەنج ئەوا نەبوومە کەسێکی جیاواز لە خۆمی ئەو کاتەی چکۆلە بووم بە هەمان ئەو رادەیەی ببمە کەسێکی جیاواز بۆ نموونە لە براکەم، راستە ئێستا من کەسێتییەکم هەیە کە جیاوازە لە کەسێتی کاتی منداڵیم، وەڵی ئەم جیاوازییە وەك جیاوازی نێوان دوو کەسی مرۆیی نییە.

جاویدانەگی لای "دیۆتیما" واتەی ئەوە نییە —وەك ئەفلاتوون وای بۆ دەچوو ــ نەمریی دەروون دوای مردنی جەستەیە، بەڵکو واتە نەمریم لەوەچەکەمدا، جا یان لەڕێگەی نەوەخستنەوە کە هەمان سیفەتەکانی من هەڵدەگرنەوە، یان خستنەوەی هزرەکان (ئەمەش لەدایکبوونی روحییە) کە وام لێدەکەن لەم هزرانەدا بە زیندوویی بمێنمەوە ــ نەمریی لێرەدا نەمریی هزرە، کتومت وەك ئەوەی دەڵێین ئەفلاتوون نەمرە یان ئەرستۆ نەمرە ــ بێ ئەوەی مەبەستمان لەوە بێت دەروونی ئەفلاتوون یان ئەرستۆ

"نەمرە"، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ئەو دووانە بە جەستە بیست و چوار سەدەیە مردوون، بەڵام هێشتا لە هزرەکانیان دەکۆڵینەوە و شییان دەکەینەوە، شتیان لێوەردەگرین، رەخنەیان لێدەگرین...هتد، هێشتاش لەبارەی "هزریان"ـەوە قسە دەکەین و سوودیان لێ وەردەگرین، ئەمەش واتە ئەوە "هزرێکی نەمرە"، خۆ زاوزێی جەستەیی، واتە نەوەخستنەوە سیفەتەکان نەمر دەکات بەوەی وایان لێدەکات دووبارە ببنەوە لە وەچەی مرۆییدا، بیرۆکە بەهادارەکانیش هەر بەم جۆرەن، هێشتاش خەڵکی —تا ئەم ساتەوەختە لە هەموو کولتوورەکاندا ــ ئەلیادە و ئۆدێسە دەخوێننەوە، ئەمەش جۆرێکە لە نەمریی هزریی، هەمان شت لەبارەی "فارابی" یان "ئیبن سینا" یان "ئیبن روشد" یان "ئیبن خەلدون"یشەوە بڵێ.. ئەمانە نەمرن، خۆیان نا، بەڵکو بە هزرەکانیان.

ئەوەش واتە کاتێك ئێمە لەبارەی کەسێکەوە قسە دەکەین ناتوانین بەو جەوهەرە Substance ئاشنا بین کە لە ژێر رواڵەتەکاندا شاراوەیە —بۆچوونی دیۆتیما ــ، بەڵکو تەنیا کۆمەڵێك سیفاتی لێکچووی بەیەکداچووی بەردەوام، لێکنەپچڕاو لە زەماندا دەناسین «ئینجا دەبێت راڤەی دیۆتیما بۆ شوناسی کەسەکی بە جددی وەربگرین. لە روانگەی ئەوەوە نە "جەوهەر" هەیە و نە "زات"ێکی میتافیزیکی شاراوە، بەڵکو کەس بریتییە لە کۆمەڵێك سیفات. ئا لێرەدا رەوایە و جێی خۆیەتی ئەم بیرۆکەیە درێژ بکەینەوە بۆ چەمکی "جاویدانەگی" و ئایدیای "دیۆتیما" بۆ "خۆشەویستی" وەك ئەوەی سیفەتێکە لە سیفەتە تایبەتییەکان..»[١٥٦].

خۆ ئەگەر جگە لەم سیفەتانە کە گوزارشت لە شوناسی کەسەکی دەکەن شتێکی تر بوونی نەبێت، ئەوا واتای ئەمە ئەوەیە کاتێك کەسێکمان خۆشدەوێت ئێمە بەوە سیفەتەکانیمان (یان لایەنی کەم هەندێکیان) خۆشدەوێت، بەڵام گەر ئەمە راست بێت ئەوا دەبێتە ئەرکمان لەبارەی بەهای ئەم سیفەتانەوە بکەوینە پرسیار کردن، بەم جۆرەش لەجێی خۆیدایە بانگەشەی ئەوە بکەین خۆشەویستیمان دەبێت لەگەڵ بەهای ئەو سیفەتانەی خۆشمان دەوێن بگونجێت، دەبێت ئەو خەسڵەتانەمان خۆشبوێت کە

شیاوی خۆشویستنن لە هەر کوێ بن، ئەو کەسەیشی بە ڕێبازەکەی دیۆتیما و ڕاڤەی ئەو بۆ خۆشەویستی —بەم شێوەیە ــ دەڕوات دەکرێت پەرۆش بێت بۆ ڕێگای "ناکەسێتی"!!

لە کاتێکدا ئەفلاتوون وا دەبینێت دەروون جەوهەرێکی سەربەخۆیە لە جەستە، لەبەرئەوەی هەڵەیەکی کردووە لەم جەستەیەدا زیندانی کراوە و بە مەرگ لێی رزگار دەبێت، بەڵام لەگەڵێدا نامرێت، چوونکە روح نەمرە، هەروەها ئەفلاتوون تەنیا لە دیالۆگی "فایدۆن"ــدا چوار بەڵگە لەسەر نەمریی روح دوای لەنێوچوونی جەستە دەخاتە روو، ئەوانیش: بەدوایەکداهاتنی دژەکان، بیرهاتنەوە، سادەیی و ئالۆزی، نموونەی ژیان، بەڵام ئەو بەڵگەیەی کاری لێدەکات و پێی وایە زیاتر لەوانی تر قەناعەتپێکەرە تەنیا لە "فایدرۆس" و "یاساکان"ــدا بە سادەیی باسی دەکات، ئەویش ئەوەیە دەروون لە خۆیدا (بژاتھ) جوڵاوە[١٥٧].

**ب- جاویدانەگی و.. تیۆری بیرهاتنەوە:**

ئەفلاتوون تیۆری خۆی لەبارەی "جاویدانەگی دەروون" و تیۆری بیرهاتنەوەی ئایدیاکان پێکەوە دەبەستێتەوە، ڕەنگە باشترین نموونە بۆ ئەم پرۆسەی پێکەوە بەستنەوەیە —کە نموونەیەکی ئایدیالییە ــ ئەو تاقیکردنەوەیە بێت کە سوکرات کردوویەتی و لەسەر "مینۆن Meno"ی خزمەتکار ئەنجامی داوە، ئەویش کۆیلەیەکی چکۆلە بوو، سوکرات لەبارەی درێژی ئەو چوار لایەوە پرسیاری لێ دەکات کە ڕووبەڕەکەی هەشت پێی چوار گۆشەیە، خزمەتکارەکەش زانیارییەکی پێشتری لەبارەی ئەندازەوە نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سوکرات وای لێ کرد یاساکانی ئەندازەی بیربێتەوە کە دەروونی لە بوونی پێشتریدا زانیویەتی[١٥٨].

هەروەها ئەفلاتوون، لە دیالۆگی "فایدۆن"[١٥٩] و دیالۆگی "فایدرۆس"[١٦٠]ــدا، دووچاری لێك گرێدانەوەی نەمریی دەروون و تیۆری بیرهاتنەوەی ئایدیاکان دەبێت. بەڵام دەروون لای "دیۆتیما" بە تەواوی لەوە جیاوازە، لە بیرهاتنەوە (یادهاتنەوە)ی

ئایدیاکاندا به ڕێگای ئەفلاتوون نه بێ توانایه، نه ئەوەیش دەروونە، —دەروون هەر له بنەڕەتەوە نەمر نییە، لەبەرئەوەی لای دیۆتیما ــ مرۆڤ له ڕێگەیەکی تەواو نا ئەفلاتوونییەوە نەمریی وەدی دەهێنێت. دەتوانین بڵێین لای "دیۆتیما" دەروون هەرگیز نەمریی وەدی ناهێنێت، چونکه لای ئەو جاویدانەگی تەنیا میتافۆرییانەیە نەك میتافیزیکییانە.

## ج ــ جاویدانەگی و.. دۆنادۆنی ڕوحەکان:

وێڕای ئەوەی "دیۆتیما" پێی وایه ئارەزووی نەمریی پاڵ به مرۆڤەوە دەنێت بۆ بکۆشێ بۆ خستنەوەی وەچەیەك، ەچەیەکی مرۆیی، لێچووی بێت کەچی ئەو کەسەی توانای نەوەخستنەوەی نییە هەرگیز ناچێتە سەر ئەو ڕێگایەی پیاوی خراپەکار لای ئەفلاتوون پەیڕەوی لێ دەکات.

لەبەرئەوەی ئەفلاتوون پێی وایە دەروونی مرۆیی جەزای کردەوەکانی وەدەگرێتەوە، هەر کەسێك بە پێی کارەکانی پاداشت دەکرێت یان سزا دەدرێت یان جەزای خۆی پێدەدرێت. فەیلەسوف یان عاشقی حیکمەت خۆی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە کە مەڵبەندی دەروونەکانە، چێژ لە بینینی حەقیقەتە ئەبستراکتەکان وەردەگرێت، نە جەستە و نە مادە و نە ڕەنگەکان و نە وێنە هەستپێکراوەکانی تێدایە، بەڵکو مەڵبەندی دەروونە و دەبێتە خۆراکە ڕوحییەکەی، بەڵام نا فەیلەسوفەکان لە جەستەی مرۆڤەکان، جەستەی ئاژەڵەکاندا، بە پێی کارەکانیان، دۆنادۆن دەبن. پیاوی خراپەکار جارێکی تر دەروونی لە جەستەی ژنێکدا دۆنادۆن دەبێت، یان ڕەنگە لە جەستەی ئاژەڵێکدا. بۆیە دەبینین لە "تیماوس"ـدا دەڵێت: «ئەوەی لە بنەما ئاکارییەکان لابدات، هەر لە لەدایکبوونیەوە دەگۆڕێت بۆ سروشتی ژن، خۆ ئەگەر لەم دۆخەشدا خۆیان لە خراپەی لانەدا، ئەوا دیسان لە سروشتی دڕندەیەکەوە ئەگۆڕێت بۆ سروشتی دڕندەکی دیکە و ئیدی بەم جۆرە».. [١٦١].

بەم جۆرە بۆمان روون دەبێتەوە دۆنادۆنی روحەکان —کە لە رێگا فیساگۆریزمەوە لە هیندەوە وەرگیراوە ــ باوەڕی وایە پیاوە ترسنۆك و داوێنپیسەکان دواتر دەبن بە "ژن"، عەقڵ سووك و ساویلکەکانیش، ئەوانەی پێیان وایە بۆ نموونە فەلەکناسیی دەکرێت بە سەیرکردنی ئەستێرەکان بە بێ مەعریفەی بیرکاری بەدەست بخرێت، دەبنە باڵندە، ئەوانەیشی فەلسەفەیان نییە دەبنە دڕندەی وشکاوەکی، کەسە زۆر گەمژەکانیش لەڕووی تێگەیشتنەوە دەبنە ماسی[١٦٢].

بەڵام "دیۆتیما" بڕوای بە دۆنادۆن، گواستنەوەی دەروون لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر نییە، چونکە پێش هەموو شتێك دەروون جەوهەر نییە، پاشانیش نەمر نییە.. بۆیە جیاوازیەکی گەورە لە نێوان فەلسەفەی دیۆتیما و فەلسەفەی ئەفلاتووندا هەیە.

# کۆتایی

لەم بەشەدا باسمان لە کەسێتی "دیۆتیما" کرد و سەلماندمان کەسێتییەکی ڕاستەقینەیە، کاهین و فەیلەسوفێك بووە لە مانتینا، کاتێك ئەسیناییەکان بانگیان کردووە تا یارمەتیان بدات بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی تاعون، سەردانی ئەسینای کردووە، هەر لەم سەردانەیشیدا چاوی بە سوکرات کەوتووە، دوای ئەوانەش تیۆرەکانی "دیۆتیما"مان لەبارەی "خۆشەویستی" و "نەمریی" و "جوانی" و..هتد خستە ڕوو، لە کۆتاییشدا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە چۆن ئەم تیۆرانە لە زۆر لایەنییانەوە لە فەلسەفەی ئەفلاتوون جیاوازن، بگرە لە چەند لایەنێکی گرنگەوە (وەکو نەمریی دەروون، دۆنادۆنی ڕوحەکان...هتد) پێکدژن، ڕاستییەکەی دیۆتیما لە زۆر کلیلی سەرەکی لە فەلسەفە و تیۆرەکانیدا جیاوازی لە ئەفلاتوون هەیە، بۆ نموونە: تێڕوانینی لەبارەی چاکە، لەبارەی جاویدانەگی، لەبارەی دۆنادۆنی ڕوحەکان، تیۆرەکەی لە بارەی شوناسی کەسییەوە، تیۆرەکەی لەبارەی ئایدیاکانەوە..هتد، ناکرێت بگوترێت لێکۆڵەری پسپۆر لە ئەفلاتوون دەتوانێت هەندێك پێکدژیی لە هزری ئەودا بدۆزێتەوە لەبارەی بابەتێك لە بابەتەکانی لە دیالۆگێکەوە بۆ دیالۆگێکی تر، ئەوەش لەبەرئەوەی لێرەدا پێکژەکان سەرەکین لەبارەی هزرە سەنتەرییەکان کە لە هەموو یان زۆرینەی دیالۆگەکانی تردا بوونیان هەیە.

بەم جۆرەش لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین "دیۆتیما" یەکێك بووە لە "ژنە فەیلەسوفەکانی جیهانی کۆن" و بەڵگەیە —وەك چۆن ژن لە جیهانی نوێدا بەڵگەیە — لەسەرئەوەی کە نە لە توانا عەقڵییەکانی، نە لە ئامادەییدا بۆ فەلسەفەکاری، لە پیاو کەمتر نییە.

# بەشی شەشەم

## جولیا دونا..
## یان جولیای فەیلەسوف

- ئایا دەکرێت فەزیلەتی پاکداوێنی لای خەساو هەبێت؟
- ئایا تەنیا رێگری لە ستەم دادگەری دروست دەکات؟

ئەپۆلۆنیۆس Appolonius

# دەستپێك

"جولیا دونا" .. یان "جولیای فەیلەسوف" وەك مێژوونووسەکان لە سەدەی سێیەمی زاینیدا وای پێدەڵێن، ژنێك بووە کە بازنەیەکی لە بلیمەتترین عەقڵەکانی سەردەمی خۆی دروست کردبوو، بازنەیەك شاعیر ، فەیلەسوفی فیساگۆری ، مەشائی ، سۆفستایی ، مامۆستای رەوانبێژی ، پارێزەر ، سیاسەتمەدار ، پزیشك ، مێژوونوس و..هتد لە خۆ گرتبوو، ــ وەك لە دواتر باسی دەکەین ــ لەو سەردەمەدا ژیاوە کە ئیمپراتۆری ریواقی مارکۆس ئۆریلیۆس (١٢١ ــ ١٨٠ ز) ــ و پێش ئەفلۆتین (٢٠٥ ــ ٢٧٠ ز) و ئەفلاتوونیزمی نویێ، ژیاوە. وێڕای ئەوەی –ئەوەندەی ئێمە بزانین ــ کتێبێکی نووسراوی لە دوای خۆی جێ نەهێشتووە تاوتوێی ئەو بابەتە فەلسەفییانە بکات کە لێیانی کۆڵیەوەتەوە، کەچی خۆی بۆ توێژینەوەی فەلسەفی تەرخان کردووە ، وەك دواتر لە بارەیەوە دەدوێین ئەندامەکانی بازنەکەی ئاراستە کردووە تا سەبارەت بە بابەتگەلێکی دیاریکراوەوە بنوسن، کە بایەخێکی زۆری پێداون، ئەو تاکەکەس بوو لەنێوان ئەو کەسانەی پێیان دەڵێین فەیلەسوف –ڕەنگە بە ئاوارتەی مارکۆس ئۆریلیۆس ــ کە ناوی لەسەر سێ هەزار و پێنج سەد دراوی جیاواز لە سککە دراوە، هەروەها لەسەر زیاتر لە ١٨٠ بالآخانە لە بالآخانە گشتییەکان ، پەیکەرە بلاوەکان بە وڵاتەکەدا ناوی هەیە، تەنانەت لە کۆتاییدا خەڵکی سیفەتی پیرۆزییان داوەتە پاڵی!

یەکەمجار دەست دەکەین بە گێڕانەوەی وردەکارییەکانی ژیانی ئەم ژنە درەوشاوەیە ، پاشان هەوڵ دەدەین بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە:

بۆچی نازناوی فەیلەسووفیان لێناوە؟

## یەکەم: ژیانی جولیا دونا

"جولیا دونا Julia Donna" یان "جولیا دومنا J. Domna" ساڵی ١٧٠ ز لە ئیمیسا Emesa –کە کەوتۆتە دەوروبەری شاری حیمسی ئێستا ــ لە سوریا

لەسەر رووباری عاسی لەدایك بووە[١٦٣]، ناوی دۆما یان دومنا Domna نیمچە لێکچووە لەگەڵ وشەی لاتینی Domina کە واتای "خانم" دێت، ئەگەرچی ئەشێت ناوێکی ئەرمەنی بێت بە مانای مارتا Martha[١٦٤]، "یولیۆس باریانۆ Julius Basianus" ـی باوکی کاهینی گەورەی خوای چیا Elagabal بووە، لە ئیمسیادا خوای هەتاو بووە کە لەو کاتەدا ناوەندێکی ئایینی گرنگ بوو.. بەجۆرێك پەرستنی ئەم خواوەندە لەم ناوچەیەدا بڵاو بووە[١٦٥].

مێژوو لەبارەی پەروەردەی "جولیا"وە لە ژیانی منداڵی و سەرەتایدا هیچمان بۆ ناگێڕێتەوە، بەڵام وا پێدەچێ چاوی بە هەندێك لە رۆشنبیرە دیارەکان کەوتبێت کە سەردانیماڵیانیان کردووە ، وا دەردەکەوێت لەو مشتومڕانەی کە لەنێوان ئەوان و باوکە کاهینەکەیەوە بەڕێوەچوون، زۆر شت فێر بووبێت ، دواتریش دەردەکەوێت کە بەشێوەیەکی گشتی بایەخی داوە بە ئەستێرەناسی و بیرکاری، ئەو بایەخەش ئەو ژینگەیە تێیدا چاندوویەتی کە لە سەردەمی منداڵیدا تێیدا ژیاوە، هەروەها لەوانەشە "سێپتیمۆس سیڤیرۆس Septimius Severus"[١٦٦] بۆ یەکەمجار چاوی پێی کەوتبێت لەو کاتەی وەك سەرکردەیەکی سەربازی پارێزەری رۆمانی لە حیمس لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوو، ئەو کاتەیش جولیا لە نۆ یان دەساڵی تەمەنیدا بوو، دوای ماوەیەك لەوە "سڤیرۆس" خۆی بووە حاکمی هەرێمی لیۆن لە وڵاتی غال (فەرەنسای کۆن) ، هەر لەوێش ژنەکەی یەکەمی تیاچوو، ئیدی بەدوای هاوسەرێکی تری خۆشبەختدا دەگەڕا، ئا لێرەدا بوو بەوەی زانی خانمێکی گەنج لە حیمسی سوریا ئەستێرەکان بەختێکی شاهانەیان بۆ حەشارداوە، بۆیە بە پەلە تکای لێکرد و بەختی لە هاوسەرگیری هەبوو»[١٦٧].

راستییەکەی "جولیا" شایەنی هەموو ئەوانە بوو کە ئەکرێت ئەستێرەکان بۆیان نوسیبێت، ئەم ژنە –تەنانەت کاتێك تەمەنیشی چووە سەرێ ــ خاوەنی جوانییەکی دڵڕفێن بوو، قەشەنگی خەیاڵ و پتەویی عەقڵ و هێزی بڕیاری لەخۆیدا کۆکردبووەوە،

ئەمەش وەك ئیدوارد گیبۆن بۆی دەچێت، بە دەگمەن لای کچانی ڕەگەزەکەی هەبوون..[١٦٨].

سڤیرۆس ساڵی ١٤٦ ز لە گوندی لەبدە Lebda (لیبایی) لە کەناری باکوری ئەفریقا لە دایك بووە، دوای ئەوەی هەردوو زمانی یۆنانی و ڕۆمانی لە قوتابخانە خوێندووە، بۆ خوێندنی یاسا چووە بۆ ڕۆما ، لە سەردەمی ئیمپراتۆر "مارکۆس ئۆریلۆس"ـدا لە چەند وەزیفەیەکی بەرودوادا لە "ئیسپانیا، سەردینیا، ئەفریقا و سوریا" دامەزراوە، لە سەردەمی ئیمپراتۆر "کۆمۆدۆس Commodus"[١٦٩]ـیشدا بۆتە حاکمی گالیاGallia لە ناوەڕاستی فەرەنسا.

وتمان ژنەکەی یەکەمی لەم ماوەیەدا مرد ، سڤیرۆسیش لەبارەی ئەو هاوسەرەی کە بۆ ئەم دەست بدات راوێژی بە ئەستێرەناسەکان کرد —چونکە باوەڕێکی بەهێزی بە ئەستێرەناسی هەبوو ــ، ئەستێرەناسەکانیش پێیان گووت —لە سەر ڕووباری عاسی ــ لە سوریا کچێکی جوان هەیە، کە کچی کاهینی گەورەی خواوەندی چیایە بەختی دەڵێت دەبێتە ژنی یەکێك لە پادشاکان ، دەبێتە خانمە ئیمپراتۆرێکی خاوەن بەهرە، عەقڵی پتەو، دەربڕینی بەهێز، ئەویش "جولیا دونا"یە بۆیە هەوڵی دا هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات «بەم جۆرەش، وەك نووسەرێکی سەدەی چوارەمی زایینی دەڵێت، هەڵبژاردنی هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی سوریدا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی باوەڕی بە ئەستێرەناسی هەبوو»..[١٧٠].

سڤیرۆس و جولیا ساڵی ١٨٧ ـی زایینی هاوسەرگیرییان کرد، سڤیرۆس لە تەمەنی چل و یەك ساڵیدا بوو، بەڵام جولیا لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بوو، یەکەم منداڵیشیان لە ناوچەی لیۆن Lyons لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا لە ئەپریلی ١٨٨ بوو ، ناویان لێنا "باسیانۆس Bassianus" لەسەر ناوی باوکی "جولیا"، کە بە درێژایی مێژوو بە ناوی کاراکلا Caracalla ناسرا، بەڵام ناویان لە کوڕی دووەمیان نا گیتا Geta بەناوی باوکی سڤیرۆس و براکەیەوە، کە ساڵی دواتر لە ١٨٩ ز لە ڕۆما لەدایك بوو.

له ساڵی ١٩١ زایینیدا سڤیرۆس به حاکمی "بانونیا Pannonia" دیاریکرا که کەرتێکی رۆمانییه له ئەوروپای ناوەڕاست و بەشی رۆژئاوای هەنگاریای ئێستا و بەشەکانی رۆژهەڵاتی نەمسا و باکوری یوگسلافیای نوێ دەگرێتەوە ــ که ناوەندی سەرەکی سەرکردایەتییەکەی بوو له کارنتیۆم Carnuntum لەسەر روباری دانوب. ئەوەتا سڤیرۆسی هاوسەری جولیا سەرکردەی سێ ناوچەیە، کاتێکیش به کوژرانی ئیمپراتۆر کۆمۆدۆس Commodus[١٧١] ــی زانی — که کوشتنەکەی رێگەی بۆ خێزانی سڤیرۆس خۆشکرد ــ بۆیه هێزەکەی ناوی ئیمپراتۆریان له سڤیرۆسیان نا، پیلانگێڕەکانیش له رۆما عەرشەکەیان پێشکەش به "بریتناکس Bertinax" کرد، ئەویش سیناتۆرێکی به تەمەن و پارێزکار بوو، بەڵام دوای هەشتاو شەش رۆژ له فەرمانڕەوایەتی به دەستی پاسەوانێکی بریتۆری کوژرا، سڤیرۆس به خێرایی بەرەو رۆما کشا، ئەنجومەنی پیرانیش له ریزی خۆی دەنگیان بۆ ئەوەدا بچێته سەر تەخت ــ بەو جۆرەش به ئیمپراتۆری رۆما بانگیان کرد.

لەساڵی ١٩٣ ز، ئەو ساڵەی "سڤیرۆس" به سەرکەوتوویی و براوەییەوە خۆی کرد بەناو رۆمادا، تەنیا ناوی ئەو لەسەر دراوەکان نه نوسرا، بەڵکو ناوی "جولیا دونا"شی لێ نوسرا، هەر لەم ساڵەدا نازناوی "ئۆگۆستا Augusta"ــی ئیمپراتۆری به "جولیا" بەخشی، بەم جۆرەش دوای شەش ساڵ له هاوسەرگیرییان پێشگۆیی ئەستێرەناسەکان هاته دی و جولیا بووە شاژن، بەڵکو بووە "ژنه ئیمپراتۆر"ی رۆما!.

سڤیرۆس لەسەر تەختی رۆما دوو رکابەری بەهێزی هەبوو، یەکەمیان "نیجەر Niger" ــی حاکمی سوریا له رۆژهەڵات، دووەمیشیان ئەلبینۆس Albinus ــی حاکمی بریتانیا له رۆژئاوا. سڤیرۆس یەکەمجار به هێزەکەیەوە بەرەو رۆژهەڵات بەڕێکەوت و ساڵی١٩٣ ز "نیجەر"ی تێك شکاند و بگره خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی کوشتن، سڤیرۆس له رۆژهەڵات له دژی ئەوانەی هاوکار و پشتیوانی نیجەر بوون هەڵمەتەکەی درێژە پێدا، جولیاش لەو هەڵمەتەدا یاوەری مێردەکەی و نیشتەجێی سەربازگەکەی بوو، تا ئەوەی ساڵی ١٩٦ نازناوی "دایکی سەربازگه

Mater castrum" ی لێنرا وەك داننان بە رۆڵی ئەودا لە یاوەریکردنی هاوسەرەکەی و هاندانی سەربازەکان ، ئامادەبوونی بەردەوامی لە سەربازگەکەدا.

ئینجا دوای ئەوە "سڤیرۆس" پەرژایە سەر "ئەلبینۆس" کە هەندێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی پیران ئەیانویست ببێتە ئمپراتۆر، بۆیە هێزەکەی بەرەو لای ئەو جماند، ئەلبینۆسیش لە بەریتانیاوە پەڕیوە بۆ وڵاتی غال (فەرەنسای کۆن) ــ سڤیرۆس ساڵی ١٩٧ زایینی لە ناوچەی لیۆنی فەرەنسی تێکی شکاند ، ئەلبینۆس و ژنەکەی و منداڵەکانی و هاوڕێکانی کوشتن ، لایەنی کەم ٢٩ ئەندامی ئەنجومەنی پیرانیش کە پشتیوانیان لێی دەکرد.

دەڵێن بیرۆکەی سڤیرۆس بۆ لەنێوبردنی نەیارەکانی—نیجەر و ئەلبینۆس ــ لەجیاتی ئەوەی بیانکاتە هاوپەیمانی خۆی، لە بنەمادا دەگەڕێتەوە بۆ خولیای "جولیا" کە پێشنیاری لەنێوبردنیانی بۆ کرد ، لە ئامادەکارییەکانی ئەم کارەشدا پشتیوانی لێکرد بۆئەوەی دوو کوڕەکەی بکاتە جێنشینی باوکیان لەسەر تەختی رۆما، بەڵام بێگومان سڤیرۆسیش دەیویست کوڕەکانی ببنە میراتگری تەختەکەی، بۆیە بۆ ئەوەی "سڤیرۆس" رواڵەتی رەوایەتی بدات بە فەرمانڕەوایەتییەکەی، رایگەیاند "مارکۆس ئۆریلیۆس" کە ساڵی ١٨٠ ز مردووە زڕ باوکییەتی (بە تەبەنی) ، هەروەها دەنگۆی ئەوەیشی بڵاو کردەوە کۆمۆدۆس زڕ برای بووە!

دوای چەند مانگێکی کەم لە سەرکەوتنی "سڤیرۆس" لە لیۆن جولیا لە گەشتێکی تردا یاوەری هاوسەرەکەیی کرد، بەڵام ئەمجارەیان بۆ رۆژهەڵات ، ئەفریقا بە دیاریکراویش ساڵی ٢٠٣ ز، دوای گەڕانەوەیشیان ساڵی ٢٠٤ لە رۆمادا یارییە وەرزشییەکانیان دامەزراند، ئەمەش وەك بانگی کردنەوەی سەردەمێکی نوێ ، بە پێچەوانەی ژنە ئیمپراتۆری پێشوو جولیا رۆڵێکی دیاری هەبوو لە ئاهەنگەکاندا، بەڵام وێڕای رێز لێگرتن و ستایشکردنی بە نموونەی شەرەف کە جولیا لە رۆما و لەم سەر بۆ ئەو سەری ئیمپراتۆرییەکەدا بەختی لێی هەبوو، کەچی ساڵەکانی یەکەمی سەرەتای سەدەی سێیەمی دڵخۆشکەر نەبوون، پاشانیش "جولیا" ئاسوودە نەبوو،

هۆكاریش ئەوەبوو كە تووشی دوو كێشەی قورس هاتبوو: دوژمنەكان لە دەرباری ئیمپراتۆریدا ، دووەمیشیان رەفتاری دوو كوڕەكەی.

"پلوتیانوس Plautianus" كە وەك سڤیرۆس لە دایكبووی باكوری ئەفریقا بوو، متمانەپێكراوی ئیمپراتۆر بوو هەتا بووە میراتگرێكی كاریگەری نزیك لە سڤیرۆسەوە، سامانێكی زۆری كۆكردەوە و لە هەموو شوێنێك دەسەڵاتی زیادی كرد و بگرە لە هەموو جیهانی رۆمانیدا پەیكەری بۆ دروست كرا، ساڵی ٢٠٢ ز هاوسەرگیری رێكخست لەنێوان پلۆتیلا Plautilla ـی كچی و پاسیانۆس كوڕە گەورەی جولیا و سڤیرۆس كە ئێستە نازناوی "كاراكلا"ی لێنراوە، وێڕای بەرهەڵستی جولیا ، بەرهەڵستی زاوا لە ئەنجامدانی ئەم هاوسەرگیرییە!

جولیا لەم شێوە دەستڕۆیشتوویيە بەهێزەی "پلوتیانوس" بێزار بوو، ئەو یەكەم سەركردە بوو كە دەسەڵاتێكی فراوانی هەبێت، ئەم دەسەڵاتەیشی بە خراپترین شێوە بەكار دەهێنا، هاوسەرگیریی كچەكەیشی لەگەڵ گەورەترین كوڕی ئیمپراتۆر داهاتوویەكی باشی بۆ مسۆگەر كردبوو، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەوە سەلمێنەری بانگی كەوتنی بوو، كاتێكیش ئارەزووەكانی "پلوتیانوس" زیادی كرد و كەسانی ناو كۆشكی وروژاند ئیمپراتۆریان، بە بێ خواستی خۆی، ناچار بە كوشتنی كرد —كە هێشتاش خۆشی دەویست[١٧٢] .

پلوتیانوس بە رێگایەكی خراپ مامەڵەی لەتەك "جولیا"ی ناسك و نازداردا دەكرد: چونكە بەهۆی لێهاتوویی عەقڵی و زرنگییەوە زۆر رقی لێی بوو، لای ئیمپراتۆریش ئاژاوە و گێچەڵی زۆری بۆ نایەوە ، گومانی لە رەفتارەكانی دروست دەكرد ، بەڵگەی لە دژی كۆدەكردەوە، ئەویش بە ناچاركردنی ژنە خانەدانەكان لە رێگای ئەشكەنجەدانیانەوە بۆ گەواهیدانی درۆینە! هەندێك لە مێژوونوسەكان وای بۆ دەچن ئیمپراتۆریشی قەناعەتپێكردووە دادگایی بكات، بەڵام جولیا لە هەموو تۆمەتەكان بێ بەری بوو!

له بەختی باشدا "گیتا Geta"ــی زڕبرای ساڵی ٢٠٤ کەوتە سەر جێی مردن و بە سڤیرۆسی ڕاگەیاند "پلوتیانۆس" جێی متمانە نییە، دوای ئەوە بە پیلانگێڕی بۆ کوشتنی ئیمپراتۆر تۆمەتبار کرا ، ساڵی دواتر (٢٠٥ ز) لە سێدارە درا، یەکێك لە مێژوونووسەکان دەگێڕێتەوە یەکێك لەوانەی شایەتحاڵی لە سێدارە دانەکەی پلوتیانۆس بووە «هەندێك مووی ریشی لێکردۆتەوە و بردوویتی بۆ پۆتیلا (کچەکەی) و "جولیا"ی ژنی ئیمپراتۆر و ئەوانەی شتێکیان لەبارەی ئەوەی ڕوویدابوو دەزانی، کە مووەکانی پیشاندان هاواری کرد:

«بڕوانن! لە پلوتیانۆس هەر ئەمە ماوەتەوە! بۆ یەکێکتان ئەبێتە هۆی دڵخۆشی و بۆ ئەوی دیکەیشتان ئازار و دڵتەنگی»..[١٧٣].

بەڵام کێشەی دووەم کە تووشی "جولیا" بوو "کاراکلا" و "گیتا"ی کوڕی بوون، ئەم دووانە وەك نەریتی تاکەکان لەو کاتەدا، زۆرینەی کاتەکانیان بە گاڵتە و گەپ و چێژوەرگرتن و ڕابواردنەوە بەسەر دەبرد، بەڵام لەوەش خراپتر هەر یەکێك لەو دووانە رقی لەوەکەی تریان بوو! ئیمپراتۆریش، هەر لە خۆیەوە، هەوڵی دەدا کوڕەکانی ملکەچی باڵادەستییەکەی خۆی بکات ، هەر یەکەیان لەگەڵ ئەویتریاندا لە تەبابیدا بن. ساڵی ٢٠٨ یاوەری باوکیان کرد بۆ بەریتانیا بەڵکو لە دەرەوەی ڕۆما سوودێك ببینن ، بچنە نێو ژیانی عەسکەرییەوە ، وەك ژیانی ئەباترەکان پێکەوە بژین، بۆیە بەرپرسیارێتی ناوچەیەکی بە گیتا –کوڕە بچوکەکەیان ــ سپارد کە لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمانەکاندا بوو، لە کاتێکدا سڤیرۆس لەگەڵ "کاراکلا"دا دژی ئەو بەربەرییانەی ولایەتێکیان لە باکور داگیر کردبوو لە پێشڕەویدا بوون، بەڵام ئیمپراتۆر نەخۆشیی جومگەژان، کە تاو تاو لێی هەڵدەدایەوە، زۆری بۆ هێنا، "کاراکلا" هەوڵیدا کۆنترۆڵی سوپا بکات و درۆ و دەلەسە دژی براکەی بڵاو بکاتەوە، بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی داوا لە پزیشکەکان بکات پەلە لە مردنی باوکی بکەن، کە لەو کاتەدا لە سەرووی شەست ساڵییەوە بوو ، نەخۆشی جومگەژان لە جێدا خستبووی و دەبوو لەسەر دەستبار هەڵیگرن! هەرچی چەندەی نەخۆشییەکەی سڤیرۆس سەختتر ببووایە

ئەوا ئاگری چاوچنۆکی وەحشییانە و هەستی رەش لە دەروونی کوڕە گەورەدا زیاتر دەبوو و حەوسەڵەی دواخستنی دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەتەکەی نەبوو، زیاتر لە جارێکیش هەوڵیدا پەلە بکات لە پێشخستنی ئەو چەند رۆژە کەمەی کە باوکی مابوونی ، بێ سوودیش هەوڵیدا بۆ هەڵگیرساندنی ئاژاوە لەنێو سەربازەکاندا، سڤێرۆسیش لە ٤ی فێبریوەری ساڵی ٢١١ لە یۆرك York کە تەمەنی گەیشتبووە شەست و پێنج ساڵ ، دوای هەژدە ساڵ لە فەمانڕەوایەتی سەربەرزانە و سەرکەوتوو، گیانی سپارد. لە دوا ساتەکانی ژیانیدا وەسیەتی تەبایی و هاوپشتی بۆ دوو کوڕەکەی کرد ، سوپایشی راسپارد مایەی خێربن بۆیان، جەستەی سڤێرۆس سوتێنرا و "جولیا" خۆڵەمێشەکەی بردەوە بۆ رۆما بۆ ئەوەی لە گلکۆیەکی شکۆداری شیاو بە ئەباترەکاندا بنێژرێت[١٧٤] .

"جولیا" لە هەموو ئەو چاکسازییانەی کە مێردەکەی بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی ئەنجامیدان پشیتوانی بوو، جا لە بواری کارگێڕیدا بووبن یان ئەنجامدانی کاری گشتی، یان دروستکردنی پرد و چاککردنی رێگا بانەکان ، چاکردنەوەی بینا کۆنەکان.. هەروەها جولیا لە چاککردنی "هۆڵی کۆبوونەوەکانی ژنان" و دووبارە دروستکردنەوەی پەرستگای ڤێستا Vestaـی خواوەندی گەرمایی لای رۆمانیەکان، گەشتە زۆرەکانی لە گەڵ مێردەکەیدا –وێنەکانی سەر دراوەکان و نیگاری سەر بیناکان ئەمەمان بۆ دەردەخەن ــ بەڵگەیە لەسەر رێز لێگرتنی لەلایەن مێردەکەیەوە ، ئەو رۆڵە گرنگەی وەك ژنە ئیمپراتۆرێك گێڕاویەتی، بەڵام ئەوەتا ئێستا بە تەنیا جێی هێشتووە و ئەمیش بە دەست کێشەی دابەشبوونی دوو کوڕەکەی ، ململانێی نێوانیان لەسەر ئەوەی کامیان دوای مەرگی باوکیان دەبێتە میراتگری عەرشەکە، دەناڵێنێت.

راوێژەکارەکان کە باوکیان بە ئامادەیی "جولیا" دایانی مەزراندبوو، پێشنیاریان کرد بۆ دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەتەکە بە جۆرێك "کاراکلا" هەموو ئەوروپای بەر بکەوێت ، ئاسیاش بەشی "گیتا" بێت. بەڵام "جولیا" رێگری لە دابەشکردن کرد و

وتی: «کوڕەکانم.. دەتوانن هەموو زەوی و ئاوەکانیش دابەش بکەن، بەڵام چۆن ئەتوانن دایکتان دابەش بکەن»؟! بەم جۆرە بیرۆکەی دابەشکردنی رەت کردەوە، ئەگەر چی رق و کینە هەر لەنێوان ئەو دوو برایەدا بەرقەرار بوو ، بەڵام دواجار "کاراکلا" —بەنیازخراپی و تەڵەکەبازی ــ وەڵامی تکاکانی دایکی دایەوە و رزای بوو بە بینینی براکەی لە ماڵەکەیدا بەحسابی ئاشتەواییکردن و لێك رازیبوون —کاتێك لە قسە و باسدا بوون کۆمەڵێك ئەفسەر، کە بە شمشێرە هەڵکێشراوەکانیانەوە خۆیان حەشار دابوو، شاڵاویان هێنا و دایان بەسەر "گیتا" دا، دایکە حەپەساوەکەش هەوڵیدا لەنێوان دەستەکانیدا بیپارێزێت، بەڵام بەرگرییەکەی بێ سوود بوو، ئیدی دەستی بریندار بوو و بە خوێنی کوڕە بچووکەکەی تێکەڵ بوو، کەچی بینی کوڕە گەورەکەی هان و یارمەتی بکوژەکان ئەدا، ئینجا بەرەو سەربازگەکە هەڵهاتن و لە بەردەمی پەیکەری خواوەندەکاندا خۆیان بەزەویدا کوتا. کاتێکیش گەڕایەوە بۆ کۆشك بینی کۆمەڵێك ژنی خانەدان بەسەر کوڕە بچووکەکەدا دەگرین کە کەمێك لەمەوبەر مردبوو، ئیمپراتۆری رق لەدڵیش بە مردنی دەستبەجێ هەڕەشەی لێکردن ، هەڕەشەکەی خۆی بەسەر هەندێکیاندا جێ بەجێکرد ، حوکمەکەی بە جێگەیەنرا بە لەسێدارەدانی ژمارەیەکی زۆر، رێژەیەك زیاتر لە دە هەزار کەس لە هەردوو رەگەزەکە، لەنێویشیاندا پاسەوانەکانی و وەزیرەکانی و هاوکارەکانی، وێڕای ئەو کەسانەی کە بە سەرە داوێکیش پەیوەندییان لەگەڵ گیتا هەبووبێت، ئەوەی بە زەینی خۆیدا هێنا: خۆشەویستی سوپا بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، ئیدی وا سەیری خەڵکەکەی بکات کە کەم بایەخترن، «ئیدی دەستی کرد بە هاتوچۆکردن لەنێوان ئەوروپا و ئاسیادا ، جارێکیان بە رێکەوت، کە لە سوریا مابوویەوە، دایکیشی لەگەڵدا بوو، کاتێك ئەفسەرێك بە ناوی "مارتیاس" لێی نزیك بوویەوە و وای دەرخست ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات بە خەنجەر لێیدا، ئەوەش کۆتایی ئەو سەرکێشییە زۆردارییە بوو کە ژیانی ئەو سروشتی مرۆیی تێکەڵ بە رسوایی کرد»[١٧٥].

یەکێك لە مێژوونووسەکان دەڵێت دایکی غەمی لێخوارد: «بەڵام غەمەکەی بەهۆی مردنەکەیەوە نەبوو، یان لەبەرئەوە نەبوو تەمەنێکی درێژتری بۆ خواستبێت، بەڵکو لەبەرئەوەبوو هەستی بە سەرسوڕمان کرد کاتێك بۆی دەرکەوت دەبێت دیسان بگەڕێتەوە بۆ ژیانی تایبەتی خۆی».[١٧٦].

**دووەم: جولیای فەیلەسووف**

"جولیا"ی ژنە ئیمراتۆر سەرقاڵ بوو بە جێبەجێکردنی ئەرکە فەرمییەکانیەوە، لە کاتێکدا بەردەوام بە تەنگ بایەخدانە عەقڵییەکانی و پەرەپێدانی رۆشنبیریی و توێژینەوە فەلسەفییەکانییەوە بوو، بەڵگەی مێژوویی لەو بارەیەوە لە گەواهیدانی دوو کەس لە هاوسەردەمەکانی دەردەکەوێت: یەکەمیان: فەیلەسوفی سۆفستایی یۆنانی "فلوستراتوس Philostatus" ١٧٠ ــ ٢٤٥ زاییینی کە یەمجار لە ئەسینادا فێر بووە، ئینجا دوای ئەوە بەر لەوەی بڕوات بۆ رۆما و لە دەرباری ئیمپراتۆریایی "جولیا"دا بگیرسێتەوە و ببێتە یەکێك لە ئەندامەکانی بازنە فەلسەفییەکەی، تێیدا وانەی وتووەتەوە، هەر ئەویش خاوەنی کتێبی "ژیانی سۆفستاییەکان"ــە[١٧٧].

شایەتحاڵی دووەم: سیاسەتمەدار و مێژوونووسی رۆمانی "دیوکاسیوس Dio Cassius" (١٥٥ ــ ٢٣٠ ز) کە لە هەشت بەرگدا "مێژووی رۆما"ی نووسیوەتەوە. یەکەمیان —فلوستراتوس ــ هەر کات قسە لەبارەی جولیاوە بکات تەنیا بە نازناوی "جولیای فەیلەسوف" ناوی دەبات، هەروەها باس لەوەش دەکات «بازنەکەی جولیا پێکهاتبوو لە بیرکاریزانەکان و فەیلەسوفەکان» ، دەڵێت خۆی (واتە فلوستراتوس —و. کوردی ــ ) ئەندامێکی ئەم بازنەیە بووە.

بەڵام "دیۆ" دوای ئەوەی باس لە رەفتارە دوژمنکارانەکانی "پلۆتیانوس"ی وەزیری کاریگەری نزیك لە سڤیرۆس —بەرامبەر "جولیا" دەکات، دەڵێت: «لەبەر ئەم هۆیە جولیا دەستی کرد بە خوێندنی فەلسەفە ، زۆرینەی کاتەکانیشی لەگەڵ سۆفستاییەکان دەبردە سەر»، پاشان ئاماژە بەو ماوەیە دەکات کە "جولیا" لە

کوڕەکەیەوە نامەی فەرمی پێدەگەیشت ، لە ساڵی ٢١٥ ــ ٢١٧ ز پێشوازی لە پیاوانی ناودار دەکرد لە "نیکۆمیدیا" و ئەنتاکییە لە ئاسیای بچووك، دیۆ لەبارەیەوە دەڵێت: «جولیا هەتا بێ زیاتر خۆی بۆ توێژینەوەی فەلسەفە لەگەڵ ئەم پیاوانەدا تەرخان دەکرد».

ئەم تێبینییانە لە لایەن هاوچەرخەکانی جولیاوە ئەم پرسیارانە دێنێت بە بیرو هۆشدا:

١- ئەندامانی بازنەکەی جولیا، یان هۆڵە ئەدەبییەکەی، کێ بوون؟ و بایەخیان بە چی دەدا؟

٢- فەیلەسوفە سۆفستاییەکان لە سەردەمی ئەودا کێبوون؟

٣- ئەو فەلسەفەیە کامەبوو کە ئەو پێی پەسەندتر بوو؟

لە خوارەوە هەوڵ دەدەین دوا بەدوای یەك وەڵامی ئەم پرسیارانەی سەرەوە بدەینەوە.

### سێیەم: صالۆنی ئەدەبیی جولیا یان بازنە فەلسەفییەکەی

ئەندامەکانی ئەم صالۆنە کێ بوون؟ فلوستراتوس باس لەوە دەکات بازنەکەی جولیا پێکهاتبوو لە "بیرکاربزانەکان و فەیلەسوفەکان". وا دەردەکەوێ لێرەدا تێرمی بیرکاریزان مانای ئەستێرەناسەکان Astrologers ــە کە لەو سەردەمەدا ئەستێرەناسی بەشێکی دانەبڕاو بوو لە بیرکاری، وا پێدەچێ "جولیا" هێشتا هەر لە سوریا بایەخی بەم زانستە دابێت، بە تایبەتیش ئەو لەشاری حیمس لە دایك بووە، پێشتریش باسمان کرد باوکی کاهینی گەورەی "خواوەندی ژیا" بووە، وێڕای ئەوەش وا دەردەکەوێت مێردەکەیشی هاوبەشی بایەخدانی بووبێت بە ئەستێرەناسی، پێشتر باسمان لەوە کرد مێردەکەی بۆ مەسەلەی هاوسەرگیرییەکەی راوێژی بە بورجناسەکان کردووە ، هەر ئەوانیش بوون لەم کچە سووریە ئاگاداریان کرد کە بەختی دەڵێت شوو

به پاشایەك ئەكات. وێڕای ئەوەی ناوی بیرکاریزانەکان و ئەستێرەناسەکانی صالۆنە ئەدەبییەکەی، یان بازنە فەلسەفییەکەی جولیا لامان نییە، وەلێ ناوانێکی زۆر هەن مێژوونووسەکان باسیان کردووە و لیستێکی درێژیان لە رۆشنبیرە ناسراوەکان لە سەردەمی "جولیا"دا لێ دروستکردووە ، پێیان وایە هەموویان ئەندامی ئەو صالۆنە بوون، ئەمە وێڕای خوشکەکەی جولیا بە ناوی "جولیا میسا" و کوڕە مامەکانی و هەندێك لە خزمەکانی. لیستەکە ئەمانەی خوارەوە ئەگرێتەوە:

١- "پاپینیان Papinian" پارێزەرێکی ناسراو بووە –ڕەنگە کوڕە مامی جولیا بووبێت ــ کە لە خزمەت ئیمپراتۆر سڤیرۆسدا کاری کردووە ، زۆر چاکسازی یاسایی گرنگی جێ بەجێ کردووە.

٢- "ئۆلپیان Ulpian" قوتابی پارێزەرەکەی پێشوو "پاپنیان" بووە ، یەکێك بووە لەو کەسانەی سەرقاڵی یاسا بووە، ئەندامی ئەنجومەنی راوێژکاریی ئیمپراتۆر سڤیرۆس بووە.

٣- "ئۆرپیان Oppian" شاعیرێك کە کتێبێکی لەبارەی راوکردنەوە پێشکەش بە "کاراکلا"ی ئیمپراتۆری کوڕ کردووە و تێیدا وتویەتی: «بۆ دونای گەورە کە پێشکەش بە سڤیرۆسی مەزنم کردووە".

٤- "ئەتنایوس Athenaeus" نووسەری کتێبی "سۆفستاییەکان لە شێواندا"، ئەویش شرۆڤەیەکی خوانی سۆفستاییزم بووە ، زۆر زانیاریی بەر بڵاو لەخۆ دەگرێت.

٥- ئەسکەندەری ئەفرۆدێسی ــ گەورە فەیلەسوفی بەناوبانگی مەشائی و ناسراو بە شرۆڤەکەری گەورەی ئەرستۆ، ئەندامێتی ئەو لەم بازنەیەدا –وا دەردەکەوێت ــ هۆکارێك بووە بۆ بایەخ پێدانی و دامەزراندنی بە سەرۆکی قوتابخانەی مەشائییەکان لە ئەسینادا.

٦- "سرینس سامۆنیکوس Serenus Sammonicus" کە "کاراکلا" دوای کوشتنی "گیتا"ی برای، ئەویشی کوشت.

٧- "گالینۆس Galen" (١٢٩ ــ ٢١٥ ز) فەیلەسووف و پزیشکی رۆمانی بەرلەوەی لە رۆما نیشتەجێ ببێت بە هەر چوار لای ئیمپراتۆرییەتەکەدا گەشتی کردووە و بۆتە پزیشکی دەرباری ئیمپراتۆر "مارکۆس ئۆریلیۆس". فەلسەفەکەی لەبارەی: فەلسەفەی زانست ، سروشت ، لۆژیکەوە بووە.

٨- "ماریۆس ماکسیمۆس Maximus" کتێبێکی لەبارەی "ژیانی سپتموس سڤیرۆس"ــەوە نووسیوە، ئەو کتێبەش بۆتە سەرچاوەیەك لە مێژووی رۆمانیدا.

٩- "دیو کاسیوس Dio Cassius" مێژوونووسی بەناوبانگی رۆمانی و خاوەنی کتێبی "مێژووی رۆمانی" لە هەشت کتێبدا، هەروەها کتێبێکی چکۆلەیشی لەبارەی خەونەکان و مزگێنییەکانەوە هەیە.

١٠- "گۆردیان Gordian" حاکمی کەرتە رۆمانییەکان بووە لە ئەفریقا، ئەو کەسە بوو کە "فلوستراتوس" کتێبە بەناوبانگەکەی لەبارەی "ژیانی سۆفستاییی"ــیەوە پێشکەش کردووە ، دواتریش خۆی بووە ئیمپراتۆر، بەڵام هەمیشە کەسایەتییەکی رۆشنبیر بووە تەنانەت لەبارەوە گوتوویانە رۆژەکانی لەگەڵ ئەفلاتوون و ئەرستۆ و شیشرۆن و فرگیلدا بردۆتە سەر.

## چوارەم: سۆفیستاییەکان The sophists

بێگومان خوێنەری فەلسەفەی یۆنانی کاتێك تێرمی "سۆفستایی" دەبینێت ئەوا یەکسەر کۆمەڵێك ناوی درەوشاوە بە هۆشیدا دێت، وەکو: "پروتاگۆراس Protagoras" خاوەنی ئەو رستە بەناوبانگەی «مرۆ پێوەری هەموو شتێکە» و "گۆرگیا Gorgias" خاوەنی کتێبی "لەبارەی بوون، یان لەبارەی سروشتەوە" و کتێبێکی تر لە وتاربێژیدا ــ بەتایبەت کتێبی "نامەیەك لەبارەی هونەری وتاربێژییەوە". هەروەها ئەفلاتوون و ئەرستۆش باسی تێرمی سۆفستاییان کردووە و پێیان وابووە فەیلەسوفی سۆفستایی ئەو پیاوەیە کە بانگەشەی دانایی دەکات بەڵام تێیدا پەکی کەوتووە... هتد.

بەڵام تێرمی "سۆفستایی" لە سەردەمی "جولیا" دا هیچ واتایەکی خراپی نەبووە ، گوزارشت نەبووە لە هەڵوێستە فەلسەفییە کۆنە بەناوبانگەکە، بەڵکو لە راستیدا نازناو یان تێرمێکی شەرەفمەندانە بووە، بەو وتاربێژ و مامۆستای وتاردانانە وتراوە کە لە بەهرەی وتاربێژیدا گەیشتوونەتە چڵەپۆپە. سۆفستاییەکان لە سەدەی سێیەم و چوارەمی زایینیدا لە ترۆپکی ئەو رۆشنبیرانەدا بوون کە لە لایەن چینی باڵای گەل و خەڵکی گشتیشەوە رێزێکی زۆریان لێ گیراوە، هەروەها ئەبارترەکانیش رێزیان لێدەنان و پۆست و پێگە دیارەکانیان لە دەوڵەتدا پێ دەدان، لەبەرئەمە بە رادەیەك دەوڵەمەند بوون دیاریی ئەوەندە زۆریان بە گروپەکانیان دەدا کە بینای گشتی دروست بکەن، هەروەها ئەوان لە ژیانی خۆیاندا ئەوەیان دەرخست هونەری قەناعەتپێکردن دەکرێت کەرەستەی سەرکەوتن بێت لە ژیانی گشتیدا، یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانمان لەبارەی سۆفیستەکانەوە "فلوستراتوس"ــە کە ئەندامێکی دیار بووە لە صالۆنەکەی "جولیا"دا.

فلوستراتوس لە کتێبی "ژیانی سۆفستاییەکان"ــدا جیاوازی دەخاتە نێوان "سۆفیستی کۆن" کە "گۆرگیاس" لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینیدا دایمەزراندووە و

"سۆفیستی دووەم" کە "ئیسکینیس Aeschines"[١٧٨] لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا دروستی کردووە.

هونەری سۆفیستی کۆن پەیوەست بوو بە "وتاردانی فەلسەفی"ــیەوە و هەموو ئەوانەی بەکاریان هێناوە هەڵوێستگەلی فەلسەفییان لەو بابەتانەدا هەبووە کە لەو سەردەمەدا خراونەتە روو، وەکو: جوامێری، عەدالەت، میانەڕەوی ، شێوەی هەنوکەی جیهان.. هتد، بەڵام سۆفستاییەتی "دووەم" (فلوستراتوس پێی باشە وشەی "دووەم" بەکاربهێنین لەبری وشەی "نویٚ" کەچی لایەنگرانی ئیسکینیس لە گوشەنیگایەکی جیاوازەوە تاوتوێی بابەتەکانیان کردووە، هەیانە سیاسییە، هەیانە کولتووری گشتییە، تێیدایە بژاردکردنی هونەری وتاردان خۆیەتی، ئینجا ئەو بابەتانەی کە لێیان کۆڵیونەتەوە لە مێژوو و ئەدەبی کۆنی یۆنانییەوە وەرگیراون، هەروەها تێیدا بەهرەکانیان لە هونەری دەربڕیندا دەرخستووە).

فلوستراتوس لە کتێبەکەیدا باس لەو کەسانە دەکات تێرمی "سۆفستایی"ــیان لەسەر دەچەسپیٚ، وێڕای ئەوەی —بە بۆچوونی ئەو ــ سۆفستایی فەیلەسوفی پەتی نییە، بەڵام دەبیٚ بە قووڵی گویٚ لە هەشت فەیلەسوف بگیرێت، کە وا دەردەکەوێت لە سۆفستاییەکان بوون، چونکە تیۆرەکانیان بە ئاسانی و رەوانی ، پاراوی و روونیەوە خستۆتە روو، دوای ئەوە "فلوستراتوس" مشتومالّی نۆ سۆفستای کۆن دەکات لەوانە "پروتاگۆراس" و "گۆرگیاس" و "هیباس" و ئەنتیفۆن" و "پرۆدیکس" و ..هتد و زیاتر لە ٤٣ سۆفستایی دووەم، سەرەڕای ئەوەی لەوانەیە ئەو ئەم کتێبەی لەبارەی "ژیانی سۆفیستەکان"ــەوە دوای مەرگی "جولیا" نووسیبێت، ئەگەر چی راستە گریمانەی ئەوەش بکەین فلوستراتوس ئەندامێکی دیار بووە لە صالۆنەکەی جولیادا کە شارەزا بووە لە مێژووی سۆفیستائییەکاندا، جا زانیارییەکانی بۆ جولیا خستۆتەڕوو، مشتومڕی لەبارەی ئەو زانیارییانەشەوە کردووە کە پێی دەگەیشت یان ئەمانە نووسینی کتێبێکی بەدوادا هات.

بەڵگەمان بۆ ئەم کارەی ئەو، لە نامەیەکی خۆیەوە دەستمان کەوتووە کە بۆ "جولیا"ی نووسیوە و تێدا باسی ئەوەی بۆ کردووە ئەفلاتوون رقی لە سۆفیستەکان نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێیان سەرسام بووە، تەنانەت پشتیوانی لەو وێنە ئەدەبییەی گفتوگۆ کردووە کە "گۆرگیاس" و "پروتاگۆراس" و "هیبیاس" بەکاریان هێناوە. پاشان نموونەگەلێك لەو فەیلەسوفانە باس دەکات کە پێیان وابووە دەبێت لاسایی سۆفیستەکان بکرێتەوە، لەوانە "ئیسپازیای مەڵتی" کە لەبارەیەوە دەگێڕنەوە وەها زمانی پێرکلیزی تیژ و پاك کردووە تا تەقلیدی "گۆرگیاس"ـی پێ بکاتەوە و پاشانیش دەڵێ: ئیسکینسیش کە دەیناسیت (وتارەکە ئاراستەی جولیا کراوە) و مشتومڕمان لەسەر وتەکانی کردووە لەو دیالۆگانەدا کە بە شێوازێکی دڵڕەقانە نووسیونی، دوو دڵ نەبووە لەوەی کاتێك لەبارەی ژنە بیرمەندێکی ناسراوەوە دەدوێت ئەویش "تارگێلیا Targelia"یە، بەشێوەی گۆرگیاس بنوسێت.

فلوستراتوس نامەکەی بەم وتانە کۆتایی پێدێنێت:

«ئایا دەکرێت تکای ئەوە بکەم تۆش ئەی شاژنی مەزن لەگەڵ پلوتارك (٤٦ ـــ ١٢٠ ز)ـی بوێرترینی یۆنانییەکان بدوێت، تا واز بهێنێت لە سوکایەتیکردن بە سۆفیستەکان ، گەمژەیی بەرامبەر "گۆرگیاس" نەنوێنێت؟! خۆ ئەگەر بۆت رازی نەکرا، ئەوا —لایەنی کەم ـــ تۆ بە دانایی و ژیریی خۆت، ئەو ناوە دەزانیت کە لەوەها پیاوێك دەنرێت[١٧٩].

لە کاتێکدا "پلوتارك" نووسەری ناسراوی سەربوردەی یۆنانی نیو سەدە بەر لە لەدایکبوونی"جولیا" مردووە، ئەوا هەندێك لە توێژەران گومانیان لە دروستی نامەکە هەیە، بەڵام "فلوستراتوس" کاتێك داوا لە "جولیا" دەکات کە قسە لەگەڵ پیاوێکی مردوودا بکات، ئەوا —وا دەردەکەوێت ـــ بە ئەنقەست جۆرێك لە هونەری کۆنی ئەدەبی بەکار دەهێنێت، بە تایبەت "جولیا" شارەزایەکی تەواوی لە فەلسەفەی "گۆرگیاس" و سۆفستاییە کۆنەکانی تر هەبووە[١٨٠].

سەرباری شارەزایی جولیا لە سۆفستاییە کۆنەکان، کتێبەکەی "فلوستراتوس" کۆمەکمان دەکات بۆ ناسینی "سۆفستاییەکان لە سەدەی دووەم و سێیەمی زایینیدا، کە جولیا رووبەڕوو ناسیونی، ئەوانیش ئەم ناوانەی خوارەوەن:

"ئەپۆلۆنیۆس Apollonius" ـی ئەسینایی، (نەك ئەپۆلۆنیۆس تەیانی فیساگۆری کە پاش کەمێکی تر لەبارەیەوە دەدوێین)، لە ساڵی ١٩٦ یان ١٩٧ ز لە سەردانێکیدا بۆ لای سڤێرۆسی ئیمپراتۆر، چۆتە نێو مشتومڕێکی وتاربێژییەوە و تێدا براوە بوو.

"هیراکلیدس Heracleides" کاهینی گەورە لە لیکیا Lycia[181] کە بەوە ناسراوە سۆفستایی بووە ، ڕووداوێکی ناسراویشی لەبارەوە هەیە ئەویش ئەوەیە کاتێك لە بەردەم سڤێرۆسی ئیمپراتۆردا وتاری دەمگۆیی (ئیرتجالی) دەدا کەوت بە دەمدا.

"ئیلیاس Aellias" بیرمەندێکی رۆمانییە لە سەردەمی سڤێرۆسدا ژیاوە، بە یۆنانییەکی ساف قسەی کردووە، لەبارەی مێژووەوە نووسیویەتی ، لەبارەی سروشتی ئاژەڵیشەوە هەروا.

سۆفستاییەکی تر هەیە کە زۆر بە باشی ئیمپراتۆر و "جولیا"ـی هاوسەری ئیمپراتۆری ناسیوە، ئەویش "ئەنتیپاتر Antipater"ـە کە مامۆستای تایبەتی دوو کوڕەکەی بووە ، لای سڤێرۆسیش وەك وەزیر کاری کردووە ، دوای مردنی گیتاش لاواندنەوەیەکی نوسیوە کە براکەی گیتای تووڕە کردووە، لە تەمەنی شەست و هەشت ساڵیدا بە "مانگرتنی خۆویستانە لە خواردن" مردووە!

"فلوستراتوس" دەڵێت هیمۆکراتس Hemocrates ئەندامێکی دیار بووە لە بازنەی سۆفستاییەکان، هەروەها هلیۆدورس Heliodorus ـیش لەنێو بازنەی سۆفیستەکاندا بووە.

هەروەها لەبارەی فلسکس Phliscus ـیشەوە لە تسالیا کاتێك لە رۆما بوو: دەڵێت: «چووە ریزی بازنەکەی جولیاوە کە کۆمەڵێك فەیلەسوف و بیرکاریزانی لە خۆ

گرتبوو، ــ له ژێر چاودێری ئیمپراتۆردا ــ کورسی وتاربێژی له "ئەسینا" به دەست هێنا ، بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەم کورسی وتابێژییەوه له ئەسینادا سەرقاڵ بوو».

هەروەها "فلوستراتوس" خۆی یەکێك بوو له ئەندامه دیارەکانی صالۆنه ئەدەبییەکه یان بازنه فەلسەفییەکەی جولیا ، هەروەها یەکێش بوو له نزیکەکانی، بۆیه دەبینین دوای ئەوەی به ناو باسی "جولیا" دەکات دەبێژێت: «من سەر به بازنەی ئەو ژنه ئیمپراتۆرەم که ئێجگار سەرسامه به روونگووتن (بیان) و وتاردان»، له کۆتایی کتێبی "ژیانی سۆفستاییەکان" دا خۆی به یەکێك له سۆفیستەکان دادەنێت ، دەڵێت:

«بەڵام لەبارەی فلوستراتوس ، توواناکانییەوه لەبارەی یاسا و دادگاکان ، رەوانبێژیی ، سیاسەت ، نوسینی لێکۆڵینەوە ، وتاردانی گڕاوی و —دواجار: بەهرەی له قسەکردنی دەمگۆیی (ئیرتجالی) ــ ئەوا هیچم نییه بۆ وتن لەم بارەیەوه» [١٨٢] .

توێژەر به وردی له نووسەره نوێیەکان له بازنەکەی "جولیا" یان صالۆنه ئەدەبییەکەی "جولیا"ــی کۆڵیوەتەوە، له کۆتاییدا وتویەتی:

«بازنەیەك بووه که سۆفیستەکان و فەیلەسووفەکان و "جولیا" خۆیشی بەشداری له مشتومڕەکاندا کردووه ، چێژی لەو بابەتانه بینیووه که گفتوگۆ لەبارەیانەوه کراوه، هەروەها فلوستراتوس ، فلیسکسی سۆفیستیش تێدا ئەندام بوون».. [١٨٣] .

## پێنجەم: جولیا چ فەلسەفەیەکی خوێندووە..؟

دەقە هاوسەردەمەکانی"جولیا" وەڵامێکی روون و راستەوخۆی ئەم پرسیارەمان ناخەنە بەر دەست. ئەوەتا "فلوستراتوس" لە کتێبی "ژیانی سۆفستاییەکان"ـدا جەخت لەسەر شێوازی روونگوتن ، وتاربێژیی دەکاتەوە لای ئەوا پیاوانەی کە لە بازنەکەدا بوون، هەروەها هەندێك لە سۆفیستەکانیش کە گرنگیان داوە بە ئەفلاتوون و ئەکادیمیا ، لە کتێبەکەیشیەوە ئێمە دەزانین لە سەردەمی مارکۆس ئۆریلیۆسدا وا باو بووە ئیمپراتۆر تەنیا مامۆستای کورسییەکانی روونگوتن و وتاربێژیی لە ئەسینا و رۆمادا دیاری نەکردووە، بەڵکو مامۆستاکانی: ئەفلاتونیزم و ئەرستۆییزم و ریواقییەت و ئەپیکۆریزمیشی دیاریکردووە. رەنگە ئەم نەریتە هەتا سەردەمی "جولیا"ش مابێتەوە. بە هەرحاڵ "فلوستراتوس" ئاماژە بە جۆرە سەرەکییەکانی فەلسەفە دەکات لە سەدەی دووەم و سێیەمی زایینیدا کە لەوانەیە فێرخواز ویستی لەسەر فێربوونیان هەبووبێت، بەڵام راستییەکەی ئەگەر ئێمە بمانەوێت بایەخدانە فەلسەفییەکانی "جولیا" بزانین ئەوا وا باشترە لەو کتێبانەدا بەدوای ئەمەدا بگەڕێین کە خۆی فەرمانی نووسینیانی داوە، بێ دوو دڵی ئەمە ئاماژەیە لەسەر رەوتی بیرکردنەوەی ئەو.

## شەشەم: ئەو فەلسەفەیەی "جولیا" بایەخی پێداوە

وتمان رەنگە "جولیا" کۆمەڵێك بایەخدانی سەرەکی فەلسەفییانەی هەبوو بێت ، دەکرێت ئەمەش لەو کتێبانەدا ببینینەوە کە بە فەرمانی خانمی ئیمپراتۆر نووسراون، ئەی ئەم کتێبانە کامانەن؟ ئەوە جێی مشتومڕ نییە کە "جولیا" فەرمانی بە "فلوستراتوس" کردووە بۆ نووسینی کتێبێك لەبارەی ژیاننامەی ــ ئەپۆلۆنیۆسی تەییانی ــ ئەم فەیلەسوفە کێ بووە؟ و چ شتێکی سەرنجی جولیای راکێشاوە؟

### ١- ئەپۆلۆنیۆسی تەییانی Appollonius of Tyana:

فەیلەسوفێکی یۆنانی بووە سەر بە فیساگۆریزمی نوێ لە سەدەی یەکەمی زایینیدا (چوار ساڵ پێش مەسیح لە دایك بووە)، وەك "مەسیحی وەسەنی" تەماشای کراوە، لە تەرتوس ، لە ئەجیا لە پەرستگای ئەسکیلۆس خوێندوویەتی، خۆی خستە نێو رێبازەکەی فیساگۆرەوە، گەشتی بۆ هیند کردوە ، لە رێگەیشدا سەردانی بابل و نەینەوای کردووە، هەروەها سەردانی یۆنان و ئیتالیا و ئیسپانیای کردووە، چیرۆکی ژیانیشی پڕە لە سەیرەو سەمەرە و پەرجوو تەنانەت خەڵکی بە ساحیریان داناوە، بەڵام خۆی دووپاتی کردۆتەوە هیچی نییە جگە لە تیژبینی و پێشگۆیی، دوای ئەوەی سەرسوڕهێنەرانە لە دەست نیرۆن و دومیشیان رزگاری بوو، لە سەد ساڵیدا لە ئەفسس گیانی سپارد کە لەوێ قوتابخانەی فیساگۆریزمی دامەزراند ، لەم شارەدا گەیشتبووە رادەی پیرۆزیی، تەنانەت وێنەکانی لە زۆربەی پەرستگەکاندا هەڵواسرابوون، "کاراکلا"ش پەرستگایەکی بۆ دروست کرد، لەبارەی کتێبەکانیەوە ئەوە دەزانین "ژیانی فیساگۆرس" هی ئەوە کە فەرفۆریوس و یامبلیخوس پشتیان پێ بەستووە، هەروەها دەزانین "نامەیەك لەبارەی عەرافەوە" نووسینی ئەوە..هتد[١٨٤] .

ئەوە بیرۆکەیەکی خێرا و گشتی بوو لەبارەی ئەم فەیلەسوفەوە کە "جولیا" گرنگی پێداوە و فەرمانی کردووە کتێبێك لەبارەیەوە بنووسرێت، ئەی چی بوو کە سەرنجی جولیای بۆ خۆی راکێشا؟! راستییەکەی ئەوەی سەرنجی ئەوی راکێشابوو هەندێك یادەروەی بوون لەبارەی "ئەپۆلۆنیۆس"ــەوە کە قوتابییەکەی بەناوی

"دامیس Damis" بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێش گێڕاویەتییەوە کە دەڵێت: «ئومێدی ئەوە دەکات کتێبەکەی لە سەر شەرەفی ئەپۆلۆنیۆس بێت ، سوودێکی بۆ شەیدایانی زانست هەبێت»[185].

هەندێ کەس وا لە "ئەپۆلۆنیۆس"ـیان ڕوانیوە ساحیر و عەراف بووە، فلوستراتوسیش هەندێك حیکایەت لەبارەی توانا سیحرییەکەیەوە دەگێڕێتەوە، تەنانەت ئێمە لە چالاکییەکانیدا ناتوانین واقیع و خەیاڵ لە یەك دابڕین، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەپۆلۆنیۆس فەیلەسوفێك بووە لە قوتابخانەی فیساگۆریزمی نوێدا، لە تەیيانا Tayana ـی هەرێمی کاپادوسا Cappadocia لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك لە دایك بووە، لە گەنجێتیدا فەلسەفەی ئەفلاتوون و قوتابخانەی مەشائی و ڕیواقییەت و ئەبیکۆریزم و فیساگۆرسی خوێندووە ، لە تەمەنی شازدە ساڵیدا دەرگیریی ژیانی زوهدی فیساگۆرییانە بووە و پیادەی کردووە، گۆشت خۆریی و خواردنەوەی مەیی لەخۆی قەدەغە کردووە ، سەرزەنشتی قوربانیکردنی ئاژەڵانی وەك قوربانی بۆ خواوەندەکان کردووە، هیچ پۆشاکێکی لەبەر نەکردووە تەنیا ئەوانە نەبێت کە لە کەتان دروست کراون، هەروەها قژی درێژ و ریشن بووە، بە کورتی: بە هەژاری و زوهد و داێنپاکییەوە ژیاوە ، مومارەسەی سروتەکانی قوتابخانەی فیساگۆریزمی کردووە لەوانەش "بێدەنگی"، کە لە بارەیەوە دەگێڕنەوە پێنج ساڵی ڕەبەق بێدەنگی نەشکاندووە ، زۆر شت لە کاهینەکان و پیاوانی ئایینی لە سەرجەم وڵاتاندا فێر بووە، کاتێکیش گەشتی بۆ وڵاتی فارس کرد –کە لە ڕێگەیدا بوو بەرەو هیند ــ چاوی بە "مەجوس" –کاهینی زەردەشتی ــ کەوتووە، هەروەها لە هیندیش چاوی کەوتووە بە پیاوانی ئایینی براهمانی و لەبارەی هیندۆسییەتەوە گفتوگۆی لەگەڵ دامەزراندوون ، فەیلەسووفە "ڕووتەکان"ـیشی بینیووە، هەروەها سەفەری بۆ میسر کردووە و لە کاهینەکانی دۆڵی نیلەوە زۆر شت فێر بووە، پاشان بۆ یۆنان و ئیتالیا و ئیسپانیا..هتد، وەك پێشتریش باسمان کرد، ئیمپراتۆر نیرۆن Neron بە تۆمەتێکی پووچ خائینبوونی دایە پاڵی – هەروەها ئیمپراتۆر دومیشیان

Domitian ـیش هەمان کاری کرد، بەڵام سەرسوڕهێنەرانە توانی لە مردن رزگاری بێت ، لە ماوەی فەرمانڕەوایی نێرڤا Nerva دا، واتە لەنێوان ٩٦ و ٩٨ ز، مردووە[١٨٦].

فیساگۆرس کە "ئەپۆلۆنیۆس" بە ئیلهامبەخشیی روحی خۆیی داناوە، شەش سەدە پێش زایین کۆمەڵە ئایینیەکەی دامەزراندووە —وەك لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد، کە سەرقاڵ بووە بە توێژینەوەی زانستەکانەوە بەتایبەتیش بیرکاری ـــ لە ژیانیدا پەیڕەوی لە رێساگەلێکی توند کردووە وەك رێگای پاکبوونەوە و کارکردن بۆ نەمریی دەروون، پێشتر بە درێژی لەبارەی ئەم رێسایانەوە دووایین. فیساگۆریزمی نوێ ژیاندنەوەی رێنماییەکانی فیساگۆریزمی کۆن بوو کە تێکەڵ بە هەندێك توخمی ئەفلاتوونیزم سۆفیگەرایی کرابوو، مودراتوس Moderatus و ئەپۆلۆنیۆس Appollonius لە سەدەی یەکەمی زاییندا لە گەورەترین نوێنەرەکانی بوون.

هەندێك لە توێژەران وا لە کتێبەکەی فلوستراتوس لەبارەی "ژیانی ئەپۆلۆنیۆس" دەڕوانن کە حیکایەت، یان چیرۆکێکی خەیاڵییە، بەڵام وێڕای وردیی کتێبەکە لە رووی مێژووییەوە، کتێبێکی گرنگیشە بەلای ئێمەوە "وەك ئەوەی تۆمارێکی ئەو بنەمایانەیە کە "جولیای فەیلەسوف" ژیاندونیەتییەوە، بەتایبەت کاتێك لە نزیکەوە هیچ شتێك لەبارەی "جولیا" خۆیەوە نازانین، ئینجا لە غیابی بەرهەمی "جولیا"دا ئێمە وا لەم کتێبە ئەڕوانین نەك وەك ئەوەی تەنیا بە داوای ئەو نووسراوە، بەڵکو وەك ئەوەی ئەو هزرە سەرەکییانەش دەردەخات کە ئەو بایەخی پێداون ، ویستویەتی گەشە و پەرەیان پێ بدات، ئەم هرزانە لە دەوری بابەتگەلێکی هەمەجۆر و گرنگ سوڕاونەتەوە، لەوانەش: خودا و مرۆڤ و نەمریی و ئاکاری کەسەکی و فەلسەفەی سیاسی.. هتد[١٨٧].

ئاشکرایە "ئەپۆلۆنیۆس" گوزارشتی لە مەیلی خۆی بۆ فەلسەفەی فیساگۆرس کردووە کاتێك دەڵێت: «ڕێبازەکەی من تایبەت بە دانایی هەمان رێبازی فیساگۆرسی

فەیلەسوفی ساموس Samos ـە))، هەروەك لە فیساگۆرسیشەوە زۆر شت فێر بووە لە بارەی رەفتاری کرداریی لە ژیاندا: کۆنترۆڵکردنی دەروون، زاڵبوون بەسەر ئارەزووەکانیدا ، پەیڕەویرکردن لە رێسای دانایی. هەروەها ناچارەکی بۆ پەرستنی خواوەندەکانیش هەر لەوەوە فێر بووە: ((داننان بە بوونیدا جا چ دیار بێت یان نا دیار))، هەر بەم جۆرەش خوای وەك ئەفرێنەری جیهان ناسیووە کە هەموو شتێکی هێناوەتە بوون، چونکە خواوەندی چاکەیە[١٨٨] .

شێوازی خواپەرستی کە ئەپۆلۆنیۆس پەیڕەوی لێکردووە هەمان شێوازی خواپەرستییە لای "جولیا"ی کچی کاهینی گەورەی خواوەندی چیا کە هەر لە منداڵییەوە، واتە لەو کاتەی نوێژی بۆ خواوەندی خۆر دەکرد کە هەر چوار وەرزەکەی هەڵدەسوڕاند، پێی ئاشنا بووە، ئەوەش سەرچاوەی: رۆشنایی و رووناکی و ئاگر ، پێگەیشتنی بەروبووم بووە، هەروەها ئەپۆلۆنیۆسیش –وەکو جولیا ــ داوای دروستکردنی پەیکەری خواوەندەکانی کردووە لە پەرستگاکاندا ، پێی وا بووە ئەم پەیکەرانە –جا چ پەیکەری ئەپۆلۆ بێت یان زیۆس یان ئەسینا ــ هەوڵی عەقڵی مرۆیی دەنوێنێتەوە بۆ وێناکردنی حەقیقەتی ئایدیالی. بەڵام رەخنەیەکیش بووە لە کەلەپوری میسری کە وێنای خواوەندەکانی لەشێوەی ئاژەڵەکاندا کردووە[١٨٩]، بە بڕوای ئەپۆلۆنیۆس:

((لێکچوونێکی دیاریکراو هەیە لەنێوان خواوەندەکان و مرۆڤدا، ئەم لێکچوونە توانای ئەوەی بە خشیوە بەوانەی رەگەزی ئاژەڵ نین کە خواوەندەکان بناسن ، لەو سروشت و رێگەیە بڕوانن کە بەهۆیەوە بەشداری لە جەوهەری خوداییدا دەکەن.. خەڵکانی باش و چاك لە قوڵایی ناخی خۆیاندا شتێکیان لەم جەوهەرە خوداییە هەڵگرتووە))[١٩٠] .

ئەو وای دەبینێت هەموو شتێك لەناخی خۆیدا دەروونێکی نەمریی هەڵگرتووە، سەرچاوەی بوونی ئەم دەروونە ئەوەیە کە ((وەچە ناخاتەوە)) هەروەها ئەویش، وەك ئەفلاتوون، پێی وابووە مادام دەروون بە جەستەیەکی فانییەوە کۆت و بەند کراوە

کەواتە زیندانیە، پاشانیش بەراوردێك دەکات لەنێوان ژیانی دەروون لە جەستە و ژیانی مرۆڤ لە زیندان‌دا ، پێی وابووە مەرگ زرگاری و رەهابوونە لەم زیندانە، وەلێ ئەپۆلۆنیۆس ئاگای لەوە بووە بۆچوونی جیاواز و هەمەجۆر لەبارەی دەروونەوە هەیە، فلوستراتوسیش پێی وایە ئەگەر ئێمە بڕوا بە رێنماییەکانی ئەپۆلۆنیۆس لەبارەی دەروونەوە بهێنین «ئەوا دەتوانین ــ بە کامەرانی و چێژەوە ، بە زانینێکی شیاو بە سروشتی مرۆیی ــ رێگای بەرەو ئەو ئامانجە ببڕین کە خواژنەکانی چارەنووس Fates بۆیان دیاری کردوین»[191].

ئەو رێگەیە کامەیە خواوەندەکانی چارەنووس بۆیان دیاری کردوین، ئەمە لە زۆرێك لەو دەقانەی لەبارەی ژیاننامەی ئەپۆلۆنیۆسەوەن روون دەبێتەوە، وێڕای ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوەی تیۆری لەبارەی فەلسەفەی ئاکارەوە نەخستۆتەڕوو، کەچی جەختکردنەوە و چڕبوونەوە لەسەر پێویسیی گەیشتنمان بە فەزیلەتەکان دەبینینەوە: حیکمەت، جوامێریی، عەدالەت، میانەڕەوی، کۆنترۆڵکردنی دەروون. ئەپۆلۆنیۆس پێی وابووە ئەو مرۆڤەی عاشقی حیکمەتە لە کۆلۆدس رودس Colossus Rhodes مەزنترە[192] بەڵام دەرهەق بە جوامێریی ئەپۆلۆنیۆس جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە ئەوەندە بەس نییە فەزیلەتت وەك سیفەتێك هەبێت، بەڵکو دەبێت مرۆڤ مومارەسەیشی بکات.

ئەپۆلۆنیۆس قوتابییەکانی فێری فەزیلەتی داوێنپاکی و میانگیریی و خۆ کۆنترۆڵکردن دەکرد، بۆیە —دەرهەق بە بەکارهێنانی شتە مادییەکان ــ خۆیی لە پێویستییە سەرەکییەکاندا قەتیس کردبوو، چونکە پێی وابووە لە هەموو رەزیلەتەکان خراپتر رەزیلەتی چاوچنۆکی و خراپەیە، سەرەڕای ئەوەش رەخنەی لە مەستبوون و زۆر خۆریی گرتووە، هەروەها بڕوای وابووە بۆئەوەی زەینی مرۆییانەمان سازگار بمێنێتەوە، ئەوا وا باشترە "لە پتەوی و هاوسەنگیدا گوشاد بمێنێتەوە"، لێرەدا دەبینین خواردنەوەی ئاوی لە خواردنەوەی مەی پێ باشتر بووە، ئەگەر چی داوای لە

هاوڕێکانی یان پادشاکان نەکردووە بە یەکجاری خواردنەوەی مەی تەرك بکەن، بەڵکو تەنیا داوای میانڕەویی لە خواردنەوەیدا کردووە، ئەو دەبێژێت:

«.. بە لای پادشاوە فەلسەفە بریتییە لە تێکەڵکردنی میانڕەویی و قووڵبوونەوە لەگەل یەکدیدا بە ڕێژەی شیاو، یان بریتییە لە زێدەڕویی و پتەوی پێکەوە.. ئەمەش بۆئەوەی خۆگەورەبینی و خۆڕاگریی دەروونی هەبێت».

مشتومڕیش لەبارەی داوێنپاکییەوە کراوە کاتێك دامیس Damiss ـی قوتابی ئەپۆلۆنیۆس پرسیویەتی: ئایا دەکرێت فەزیلەتی داوێنپاکی لای خەساو هەبێت؟ ئەپۆلۆنیۆس وەها وەڵامی دەداتەوە: «فەزیلەتی داوێنپاکی ناکرێت لای خەساو هەبێت، لەبەرئەوەی داوێنپاکی سێکسی ناگەڕێتەوە بۆ ئەو، بەو واتایەی خۆی ئەوەی هەڵنەبژاردووە بەڵکو بەسەریدا سەپاوە، ئەو پێی وایە داوێنپاکیی ڕاستەقینە —هەر وەك میانڕەویی ــ مانای بێ توانایی نییە لە زێدەڕویی و کورتبڕی لە کردەوە و ئارەزووەکانی ژێر دەسەڵاتتدا»[١٩٣].

لە مشتومڕی ئەپۆلۆنیۆسەوە لەسەر عەدالەت دەبینین جەختی کردۆتەوە لەسەر واتای ئەرێنیانەی فەزیلەت و ئەم پرسیارە دەخاتە ڕوو: ئایا تەنیا خۆ گرتنەوە لە ستەم دادگەریی دروست دەکات؟ ئەپۆلۆنیۆس لە براهماکانی هیندەوە ئەوە فێر بووە کە عەدالەت زۆر زیاترە لە نا ستەم (ستەم نەکردن)، یان ئەنجام نەدانی کردەی ستەمکارانە، ئەوەش لەبەرئەوەی ئەوە لە مرۆڤ دەخوازێت ئەرێنی بێت لە ئەنجامدانی دادگەریی ، هاندانی ئەوانی دیکە بۆ ئەنجام نەنجام نەدانی کردەی ستەمکارانە[١٩٤].

"ئەپۆلۆنیۆس" تەنیا بایەخی بە ئاکاری تاك نەداوە، بەڵکو گرنگی داوە بە ئاکاری کۆمەڵگەیش، ئەو بەشێوەیەکی تایبەت بایەخی داوە بەو ڕێگەیەی بەهۆیەوە هارمۆنیا لە کۆمەڵگەدا دێتە دی ، فەلسەفە چۆن دەتوانێت فەرمانڕەوا دامەزرێنێت و لە کارەکانیدا یارمەتی بدات، لە پاڵییەوە بوەستێت و لە ڕەفتارەکانیدا ڕێنمایی بکات، ئەو لەلایەنی واقیعییەوە دان دەنێت بە بوونی کێبەرکێ لەنێوان شارەکان (یان دەوڵەتەکان)ـدا، بەڵام پێی وایە دەبێت ئەم کێبەرکێیە ئاراستە بکرێت بەرەو

زەقکردنەوەی ئەوەی کام شاریان ئەرکەکانی بە باشترین شێوە جێ بەجێ دەکات ، ئینجا ئەوەش وەدی دێنێت کە پێی دەڵێت بەرژەوەندی گشتی، بۆیە دەبینین زۆرجار ئەو قسەیە ئەفلاتوون دێنێتەوە کە لە "کۆمار"دا گوتوویەتی: «.. وای دەبینم وا باشترە هەر کەسێك ئەو کارە بکات کە باشتر لە هەر کەسێکی تر تێی دەگات ، ئەو کارە بکات کە دەتوانێت باشتر لە کەسانی تر ئەنجامی بدات»..

بەڵام لەڕووی فەلسەفەی سیاسییەوە، ئەپۆلۆنیۆس پێی وایە سیستەمی پاشایەتی باشترین شێوەی فەرمانڕەوایەتییە، بەتایبەت ئەگەر فەرمانڕەوای مێگەلی مرۆیی شوانێکی دادوەر بێت، ئەو خۆی لەژێر فەرمانڕەوایی ژمارەیەك ئەباترەی رۆماندا ژیاوە، باس لە دووانیان دەکات کە دژی فەلسەفە و فەیلەسوفەکان جەنگاون، ئیمپراتۆر نیرۆن Neron[195] ، نووسراوێکی دەرکرد بۆ قەدەغەکردنی فەلسەفە، بەو مەبەستەی نابێت لە رۆمادا کەس بیلێتەوە و توێژینەوەی لەبارەوە بکات، دومیشیان Domitian[196] ئیمپراتۆری دووەمیش هەمان کاری کرد کە وشەی "حیکمەت"ـی تەنیا کردە سوکایەتی و تاوانکردن و دەبێت خاوەنەکەی سزای خۆی وەربگرێت، هەروەها نوسراوێکیشی دەرکرد لەبارەی سزادانی فەیلەسوفەکان و سزایشی دان، ئەمە لە کاتێکدا ئەباترەی تری رۆمان هەبوون، لەوانە ڤێسپازیان Vespasian[197] و تیتس Titus[198] ـــ داوای یارمەتییان لە ئەپۆلۆنیۆس کردووە و پرس و راوێژیان پێ کردووە، لە وەڵامدانەوەی ڤێسپازیاندا گوتوویەتی: «پاشای خاوەن شکۆ کەس لێیەوە (واتە لە فەلسەفەوە —و.ك) فێر نابێت، بەڵکو هەموو ئەوەی دەتوانێت بیکات ئەوەیە کۆمەڵێك ئامۆژگاری و رێنمایی گشتی پێشکەش بکات، لەوانە:

- مومارەسەی دەسەڵاتت بکە بە میانەگیریی.
- لێگەڕێ یاسا، بەر لەوەی حوکمی گەلەکەت بکات، حوکمی خۆت بکات.
- رێز لە خواوەندەکان بگرە.
- جێنشینێکی باش و سوڵحاو بە.

له هەموو ئەمانە چی بەلای "جولیا"ی خانمە ئیمپراتۆرەوە گرنگ بووە؟ بێگومان ئەو بایەخی بە لایەنی ئەخلاقی و سیاسیش داوە: ئاکاری کەسەکی کە تاك لە رەفتاریدا مەبەستییەتی ، ئاکاری کۆمەڵایەتی کە رێ خۆش دەکات بۆ وەدیهاتنی هارمۆنیا لە کۆمەڵگەدا، ئینجا ئەو بەتەواوی قەناعەتی بەوە بوو فەلسەفە دەکرێت رێنما بێت نەك بە تەنیا لە ژیانی کەسییانەی مرۆڤدا، بەڵکو لە مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسیشدا.

وێڕای ئەوەی فلوستراتوس، هێشتا لە نووسینی کتێبی "ژیانی سۆفستاییەکان" نەبووبووەوە کاتێك جولیا ساڵی ٢١٧ ز مرد — بەڵام بێگومان زانیاری لەبارەی ناوەڕۆکی کتێبەکەوە هەبووە، چوون ئەو بوو فەرمانی بە نووسینی کرد و هاوسەردەمی قۆناغەکانی ئەم نوسینە بووە ، لە هەر قۆناغێکیشدا هاندەر و پشتیوانی "فلوستراتوس" بووە.

ئینجا نووسەرێك وای بۆ دەچێت، لەمەشدا لەسەر هەقە، کە ئەم کتێبە: «کۆمەڵێك ئاماژەی رۆشن دەخاتە روو لەبارەی زەینی ژنێکەوە کە رۆڵی پێشەوایەکی گێڕاوە لە ماوەیەکی یەکلاکەرەوەی مێژووی رۆمانیدا»، ئەوەش لەبەرئەوەی خۆی عاشقی فەلسەفە بووە، هەروەها باوەڕی بە نەمریی دەروون ، پێویستیی مرۆڤ بە فەزیلەتە عەقڵی و ئاکارییەکان هەبووە، بە ئەندازەی پێویستبوونی بە رێنمایی و ئاراستەکردن کە فەلسەفە دەتوانێت پێشکەش بەو کەسانەی بکات دەسەڵاتی سیاسییان هەیە و مومارەسەی دەکەن.

وێڕای ئەوەی رێبازی نوێی فیساگۆریی نیو ــ ئەفلاتوونیزم لەخۆیی گرت، کەچی گومانی تیا نییە "جولیا" زۆرێك لەو بابەتانەی لای ئەپۆلۆنیۆس بینییەوە کە بایەخی پێدەدان ، بە شایانی ئەوەی دەزانی پێی سەرسام بێت، هەروەها زۆر زانیاری و رێنمایی فەلسەفی بینییەوە کە لە فەلسەفەی کلاسیکدا باوبوون.

# کۆتایی

ئەمە ئەو ژنە درەوشاوە بوو کە مۆمێکی ڕووناك بوو لە شاری ڕۆمادا، ئەی بۆچی مێژوونوسەکان لە سەدەی سێیەمی زایینیدا نازناوی "جولیای فەیلەسوف"ـیان لێناوە؟

دەتوانین بە کورتی وەڵام بدەینەوە هۆکاری ئەم ناولێنانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵبوونی بە فەلسەفە ، توێژینەوەی زۆر بابەت و کێشەی فەلسەفی، هەروەها فەرمانی بە نووسینی کتێبێك کردووە لەبارەی فەیلەسوفێکی فیساگۆریزمی نوێ، کە پێی وابووە پێویستە خەڵکی بە گرنگییەکەی بزانن، وەك چۆن هزری سۆفستاییە کۆنەکان ، کاری وتاربێژیی سۆفستائییە دووەمەکانی سەردەمی خۆی ناسیوە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵیان هەبووە، وێڕای هەموو ئەوانەیش خۆیشی لە ڕێگەی صالۆنە ئەدەبییەکەی و بازنە فەلسەفییەکەیەوە زۆر شت فێر بووە ، خەڵکانی تریشی بۆ فێربوون هانداوە، بەڵام ئەو ڕاستییەی کە ئەو خانمە ئیمپراتۆر بووە واتایەکی تایبەتی هەیە، پێشتر بینیمان هەندێك لە فەرمانڕەوا پیاوە توندوتیژەکانی پێشتر وەکو "نیرۆن" و دومشیان" فەلسەفەیان چ وەك خوێندن و چ وەك وتنەوە قەدەغە کردووە و فەیلەسوفەکان و باڵادەستیان لە دەرەوەی وڵاتەکە چەوساندۆتەوە ، مامۆستاکانی فەلسەفەیان لە سێدارە داوە وەکو ئەوەی نیرۆن بە سینیکای فەیلەسوفی گەورەی ڕیواقی کرد، کاتێك فەرمانی خۆ کوشتنی بەسەردا سەپاند، ئەویش شادەماری خۆی بڕی و خوێنەکەی ڕژا هەتا گیانی دەرچوو! بەڵام "جولیا دونا" دەسەڵاتە ئیمپراتۆرییەکەی خۆیی بۆ پاراستنی فەلسەفە بەکارهێنا ، هاوکاربووە بۆ گەشەسەندنی فەیلەسوفەکان ، ئەو پێگەیەی پێ بەخشیون کە شیایەنیان بووە ، فەرمانی داوە لەبارەیانەوە بنووسن ، هزرەکانیان شی بکەنەوە ، تاوتوێی فەلسەفەکانیان بکرێت.. ئەمەش دەستکەوتێکی ئاسان نییە[١٩٩] .

ئیتیل کیرزی Ethel M. Kersey دەڵێت «"جولیا دونا".. یان "جولیای فەیلەسوف" ئەو ژنەیە کە دیۆجینز لایرتی Diogenes Laertius کتێبە بەناوبانگەکەی "ژیانی فەیلەسوفە بەنامییەکان"ـی پێشکەش کردووە»[٢٠٠] .

# بەشی حەوتەم

## ماكرینا .. Makrina

"جەوهەری دەروون توانایەتی بۆ بیركردنەوەی عەقڵی، لەمەشدا جیاوازی لەنێوان پیاو و ژندا نییە"

ماكرینا Makrina

**یەکەم: ژیان و بەرهەمەکانی**

ماکرینا (٣٣٠ ــ ٣٧٩ ز) ژنە قەدیس و فەیلەسوفێکی یۆنانی بووە، خاوەنی کۆنترین سیستەمی ئایینییە بۆ زوهد و خەڵوەتی ژنان، گریگۆر Gregory (٣٣١ ــ ٣٩٦ ز) ــی برای، ئەسقۆفی نیسا Nyssa لە ساڵی (٣٧٠ ــ ٣٧٦ ز) ، یەکێك لە باوکانی کەنیسەی رۆژهەڵاتی ، یەکێك لە پاڵەوانەکانی کۆمەڵەی قوستەنتینییە (ئەستەنبولی ئێستا)، ژیانی ئەوی بۆ گێڕاوینەتەوە.

لە قەیسەریی نوێ ساڵی ٣٣٠ لە سەدەی چوارەمی زایینیدا، لە خێزانێکی ئۆرستۆکراسی لە دایك بووە، دایك و باوکی –پاسیلۆس و ئیمیلیا ــ سەر بە چینی ئۆرستۆکراسی بوون، بە جۆرێك کە ئەم خێزانە زەوی و زارێکی بەرفراوانیان هەبووە کە کۆیلەکان کاریان تێدا کردووە، راستە موڵکەکانی خێزانەکە دەستیان بەسەردا گیرا، بەڵام وا پێدەچێ کاتێك ئیمپراتۆر قوستەنتین فەرمانڕەوایی گرتە دەست بۆیان گەڕێنراوەتەوە، باپیری لە دایکییەوە لە ئایینی مەسیحیدا فەقێ بووە و لە فەلسەفەی یۆنانیشدا شارەزا بووە، گریگۆری برای بۆمان دەگێڕێتەوە "ماکرینا"ی خوشکی لە زوهد و خەڵوەتا ژیاوە، "پاسیلۆس" و "پترۆس"ــی برایشی بەهەمان شێوە ژیانی زوهدیان هەڵبژاردووە ، برای سێیەمیشی "گریگۆری" بە نەمریی هێشتوویەتییەوە و کتێبێکی لەبارەوە نووسیوە بە ناونیشانی "ژیانی ماکرینا Vita Makrina" و تێدا ستایشی کردووە، گریگۆری باس لەوەش دەکات کە لەنێوان خۆی و خوشکەکەیدا مشتومڕی فەلسەفی لەبارەی نەمریی روح و زیندوو بوونەوە و هەستانەوەوە(قیامەت) روویداوە، تەنانەت ئەو کاتەیشی کە لەسەر جێی مردن بووە.

گریگۆری راستەوخۆ دوای مەرگی ماکرینا ئەم مشتومڕانەی لە دیالۆگێکدا تۆمار کردووە بە ناونیشانی "لەبارەی دەروون و قیامەتەوە De Anima et Resurrectione" لەم دیالۆگەوە ئەوە روون دەبێتەوە "ماکرینا" بە رۆشنبیرییەکی بەرز رۆشنبیر بووە ، شارەزاییەکی زۆر باشی لە فەلسەفەی یۆنانیدا هەبووە، "ئیمیلیا Emelia" ــی دایکی فێری کردووە، بەڵام بە فەرمی هیچی نەخوێندووە، وەك ئەوەی

براكانی له ئەسینا خوێندیان، "ماکرینا" بەڵگەیە لەسەر عەقڵییەتێکی نایاب و خاوەن زانیارییەکی بەرفراوان لەبارەی ئەو بابەتانەوە کە فەلسەفەی یۆنانی هەر لە ئەفلاتوونەوە پێوەی خەریك بووە و تاوتوێی کردووە، لێکۆڵەران لەبارەی ژیانییەوە وای بۆ دەچن دیالۆگی "لەبارەی دەروون و قیامەتەوە" لەتی دووەمی دیالۆگی فایدۆنی ئەفلاتوونە[٢٠١].

## دووەم: ماکرینا و.. ترادسیۆنی روحی

### ١- یەکێتی و نەمریی دەروون

ماکرینا لە دیالۆگی "لەبارەی دەروون و قیامەتەوە" بەرگری لە نەمریی دەروون دەکات، لەکاتێکدا گریگۆری، بۆ ئەوەی حەقیقەت زیاتر روون ببێتەوە و بدرەوشێتەوە ، بابەتەکە لە هەموو لایەکەوە تاوتویێ بکرێت رۆڵی دژ دەبینێت. بەڵام بوونی دەروون بە درێژایی دیالۆگەکە بەڵگەنەویستە وەك ئەوەی هەمیشە لە هەموو جیهانی کۆندا وەك بەڵگەنەویست بووە، ماکرینا سروشتی دەروون بەم جۆرە پەسن دەدات:

«دەروون جەوهەری بوونەوەری زیندوو و عەقڵانییە و هێزی ژیان ، توانای دەرکبردنی بابەتە هەستەکییەکانی لێوە هەڵدەقوڵێت، لە جەستەیەکی ئەندامی پڕ لە هەستەوەردا، بەو ئەندازەیەی سروشت ئەم هێزانەی بەخشیوە، بوونی هەیە»[٢٠٢].

پەسنەکانی ئەو بۆ تواناکان "مەلەکە"ـی دەروون وەسفەکانی ئەفلاتوونمان لە دیالۆگی "فایدۆن"دا بیر دەخاتەوە، تەنیا ئەوە نەبێت "ماکرینا" بە دەروون دەڵێت "جەوهەری ئەفرێندراو". بەڵام لە دیالۆگی "فایدۆن"دا ئەفلاتوون دەروون دەخاتە پێگەی نێوانکاریی جیهانی هەستەکی یان دیار و جیهانی ئایدیاکان یان جیهانی عەقڵی، ئەفلاتوون لە دیالۆگی "تیماوس Timaeus" ـدا دەڵێت، دەروون دروستکەرێك Demiurgos ئافراندوویەتی، بەتایبەتیش بەشی سەرەوەی ئەویش بەشی عەقڵییە»..[٢٠٣] ماکریناش پێی وایە دەروون بنەمای ژیان و بزوانە، چونکە پاشماوە و جێماوەکانی جەستەیەکی مردوو کاتێك دەبێتە ئێسك و پروسك

پاشماوەیەکی پەرش و بڵاون و لە کاتی مردندا ون دەبن، ئەو جیهانبینیەی دەڵێت دەروون بنەمای ژیانە لای ئەفلاتوونیش لە دیالۆگی فایدۆندا دەبینینەوە[٢٠٤] وەك ئەوەی جیهانبینییەکە پێی وایە دەروون توانا "مەلەکە"ی پەیبردن و تێهزرینە، بۆیە ناکرێت شتێکی ماددی بێت.

وەلیٚ، بەڵگەی مارکینا لەسەر نەمریی دەروون هەمان بەڵگەی ئەفلاتوون لە "فایدۆن" ـدا نییە، لای ماکرینا دەبێت هێزێکی عەقڵی و روحی هەبێت کە توانای تەباکردن و گونجاندن ، راڤەکردنی هەر کردەیەك لە کردەکانی پەیبردنی هەستەکی هەبێت، ئەم هێزە روحییە بریتییە لە: دەروون کە یەکە ، بەهۆی ئەم یەکایەتییەوە لەدوای لەبەینچوونی جەستەش هەر دەمێنێتەوە، چونکە سادەیە و لێکدراو نییە و کاتێکیش لێکدراو هەڵدەوەشێتەوە ئەو لەنێو ناچێت، ئەمەش واتای ئەوەیە دەروون کە بنەمای ژیانە نەمرە، ئەم بەڵگەیە لە بەشی حەوتەم لە دیالۆگ لەگەڵ براکەیدا دەردەکەوێت، براکەیشی دژی ئەو بیرۆکەیەی دەبێتەوە کە دەڵێت دەروون لەگەڵ ئەو رەگەزانەیشدا دەمێنێتەوە کە جەستەیەکی مردوو بۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام "ماکرینا" بەرگری لە تێزەکەی خۆی دەکات، جا بە بۆچوونی ئەو دەروون یەکە و روحیە و شیاوی لەنێو چوون نییە ، هەر جۆرێکیش بێت ناکرێت دابەش ببێت بۆ بەشەکانی[٢٠٥]، ــ وەك گریگۆریش دەیخاتە روو ــ ناکرێت دەروون لەگەڵ رەگەزێکدا بێت و رەگەزەکانی تر فەرامۆش بکات، یەکایەتی دەروون و دابەش نەبوونی، لەنێو نەچوونی مسۆگەر دەکەن.

لە خوارەوە لەبارەی زوهد و خەڵوەتی "ماکرینا"وە ئەدوێین، بەڵام لەبەرئەوەی لە ژێر رۆشنایی کانونی زوهدی مەسحی و نا مەسیحیشدا، کە سەدەگەلێکی درێژی بەردەوام بووە، لەم زوهدە باشتر تێدەگەین ئەوا دەردەکەوێت بەر لەوەی بە درێژی مشتومڕی فەلسەفەکەی ماکرینا بکەین، باشترە بە کورتی وەسفی ئەو ژیانە عەقڵی و روحییەی سەدەی چوارەم بکەین:

### ٢- زوهد و خەلْوەت Asceticism :

زوهد و خەلْوەت بە شێوەیەکی گشتی، بریتییە لە جڵەوکردنی ئارەزووە جەستەیی و دەروونییەکان و سەرکوتکردنیان، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی ئایینی یان نموونەیەکی بالاْی روحی، ئەمەش پرۆسەیەکی کۆنی روحییە و شوێنکەوتوانی ئایینە جیاوازەکان پەیڕەوییان لێ کردووە، بەلاْم زوهد لە مەسیحییەتدا -بە روالْەت ـ سیستەمێکی زۆر توندی هەیە کە دەلْێت جەستەی مرۆڤ و زەمین کە مرۆڤ بەشێکە لێی و بە هۆی هەلْەیەکی ئادەمەوە بەخۆوە گیراون، بۆ مەسیحییەکی راستەقینە تەنیا جێی گالْتەپێکردنن ، تاکە شتێك بەهای هەبێت روحە، لێرەوە دیاردەی رەهبانییەت Monasticism ـی مەسیحی سەری هەلْداوە، کە دەبێت ئەو کەسە لە دێرەکاندا خۆی قەتیس بکات و بە ئاسایی بژی: قەیرەیی و خواپەرستی و هەژاری و ئارامگریی و گوێڕایەلْییەکی کوێرانە. ئەم دیاردەیە تەنیا تایبەت بە مەسیحییەت نییە، بودایزمیش رەهبانییەتێکی هەیە کە نەرمتر نییە لە رەهبانییەتی مەسیحی.

دۆدز Dodds سەرنجی ئەوە دەدات سەدەی چوارەمی زایینی مەیلێکی بەهێزی بەرەو زوهد بەخۆیەوە بینیووە -جا لە ئایینی مەسیحییەتدا بێت یان ئایینەکانی تردا ـ بگرە ئەم مەیلە لە خەسلْەتە گشتییەکانی ئەو سەردەمە بووە، ـ ڕەنگە ئەم مەیلە لە سەدەی یەکەمی پێش مەسیحدا ـ لەسەر دەستی نیو ئەفلاتوونیزمی زووکات (المبکرە) دەرکەوتبێت، کە وا لە ژیانی سەر ئەم زەمینەی روانیوە نزمترە لە ژیانی بالاْ ، دەروونی لە جەستە و جیهانی دەورگرتووی مادی رزگار کردووە. بەلاْم لە روانگەی ئەفلاتوونیزمی پاشینەوە "دەروون"ی مرۆڤ نێوانکاری جیهانی عەقلْی و جیهانی هەستەکییە کە جەستە لەنێویدایە. ئینجا مرۆڤ کە لە سەر ئەم زەمینەدایە هەست ناکات لە مالْی خۆیدایە، بۆیە دەیەوێت ئەم ژیانە زەمینییە تێپەڕێنێت. خەسلْەتێکی سەرەکی و جەوهەری لە دەروونی مرۆڤدا هەیە ئەویش ئەوەیە بەردەوام هەولْ دەدات لە پەیوەندیدا بێت لەگەلْ جیهانی عەقلْیدا، بگرە ئامانجی مرۆڤ لەکاتی بوونیدا لە سەر زەمین گەیشتنە بە "جیهانی ئایدیاکان" بەوەی لە زوهد و خەلْوەت ،

پاکیزەیی ، خاوێنی ، سازگاریدا بژی، بە واتایەکی تر: دەبێت مرۆڤ بە جۆرێك بژی کە عەقڵ ئاراستەی بکات بۆ جیهانی عەقڵی، تا لە بەرجەستەبوونێکی دیکەی دوای مەرگدا خۆی بپارێزێت، بۆیە دەبێت ئەوە ئامانجی سەرەکی ژیانی مرۆڤ بێت لە سەر زەمین. دەروونی مرۆیی لە ئەفلاتوونیزم Platonism ـدا لە کاتی ژیاندا لە سەر زەمین ئەرکێکی دوو سەرە جێ بەجێ دەکات، ئەم ئەرکە دوو سەرە پێکدژی لە "دەروون" ـدا ئاشکرا دەکات، چونکە خۆی لە پێگەی ناوەندی نێوان جیهانی عەقڵی (معقول) و جیهانی هەستەکیدایە.. فرفۆریوس Porophyry (٢٣٢ ــ ٤٠٤ ز) پێی وایە پێگەی نێوانکاریی دەروون دەبێتە مایەی دەرکەوتنی زوهد و خەڵوەت وەك بەرەنجامی زێدە رەوی لە تێڕامانی ئەبستراکتدا.

بەم جۆرە خەسڵەتی گشتی نیو ئەفلاتوونیزم دەرکەوت، ئەویش کەم کردنەوەی لە بەهای هەر شتێکی مادی ، وێڵبوون —بە تاسەیەکی زۆرەوە ــ بۆ تێپەڕاندنی ئەم جیهانە زەمینییە لە ڕێگەی زوهد و خەڵوەتەوە، لەبەر ئەمە دەڵێن تەسەوف لای ئەفلۆتین تەسەوفە لە جۆرێکی تایبەت، واتە "تەسەوفی عەقڵی"[٢٠٦]، وەهایش تەماشای فەزیلەتی ئەخلاقی و ژیانی زوهد و تێڕامانی عەقڵی کراوە کە ڕێگایەکی سەرەکی ، هەوڵێکی پێویستە تا بگەینە جیهانی عەقڵی جیهانی ئایدیاکان کە نیو ئەفلاتوونیزم لەگەڵ عەقڵی خودایی یان نۆوس Nous ـدا یەکیان دەخات ، وا لێی دەڕوانێت ئایدیای حەقیقەتی فەزیلەتە.

"فرفۆریوس" بۆ مارسێلا Marcella ـی خێزانی نووسیوە و دەڵێت خۆپاککردنەوە و زوهد لەپشت خستنەگەڕی عەقڵەوە شاراوەن، ئەوەش تاکە ڕێگەیە بۆ گەشتن بە خودا، بۆیە ئەو وا لە پیاو و ژن دەڕوانێت کە لە رووی "دەروون"ـەوە یەکسانن ، هەردووکیشیان دەتوانن بچنە نێو ژیانی زوهد و خەڵوەت ، ئەنجامدانی مومارەسەی عەقڵی کە دوا ئامانجی ژیان وەدی دێنێت، ئەویش یەکگرتنە لەگەڵ خوادا[٢٠٧].

## ٣- گنۆسیەت Gnosticism ٢٠٨:

گنۆسیەت، یان ڕێبازی عیرفان، ڕێبازێکی عەقڵییە، لە ماوەی سەدەی یەکەمی زایینندا لە چوارچێوەی کەنیسەی مەسیحیدا سەریهەڵدا، بە شێوەیەکی تایبەتیش لە سەدەی دووەمی زایینیدا گەشەی سەند، یارانی ئەم ڕێبازە زیاد لە "باوەڕ" جەختیان لەسەر گرنگی مەعریفەی ڕوحی دەکردەوە، هەروەها هەوڵیان دا بۆ سازاندنی ڕێنماییەکانی مەسیح و فەلسەفەی گریکی و ڕۆژهەڵاتییەکان، نکوڵیشیان لە ڕاڤەکردنێکی حەرفییانەی کتێبی پیرۆز کردووە، هەر لەبەر ئەمە کەنیسە بە هەرتوقی Heretics و لە ئایین دەرچوواني داناون.

خەسڵەتگەلی زوهدی لە گنۆسیەتیشدا هەیە کە بە ڕقەوە لە جیهانی هەستەکی دەڕوانێت ، بە خراپە لە خۆیدای دەزانێت، مادەی بە بنەمایەکی سەربەخۆ ، سەرچاوەی هەموو خراپەیەك داناوە، ئەمە لە ڕێبازی "باسیلیدس Basilides"[٢٠٩] ـدا دەبینینەوە، کە یەکێك بووە لە شوێنکەوتوانی گنۆسیەت، هەروەها لە ڕێبازی "ڤالانتینۆس Valentinus"[٢١٠] ـدا خودای باڵای مەزن جیهانی هەستەکی نەئافراندووە، بەڵکو "دروستکەر" و هاوکارەکانی خولقاندوویانە، ئەوەش بوونەوەرانێکی شەرەنگێز و ڕوحە شەرنگێزەکانن لە ڕێگەی خۆیانەوە هەنگاو دەنێن بەرەو هێنانە بوونی هەڵچوونەکان و ئارەزووەکان، ئەم هێنانە بوونەش هەمان ئەو شتەیە کە خودای باڵا و مەزن تۆوێکی لە جەوهەری باڵای بۆ زیاد کردووە، ئەویش: ڕوحە ، هەموو مێژووی جیهانیش بریتییە لە مێژووی تێکۆشان دژی کۆمەڵی شەیتانەکان کە هەوڵی لەنێو بردنی ئەم تۆوە دەدات. خوێنەر دەتوانێت بە ڕوونی تێبینی ئەو دووانەکیە مانەوییانە بکات کە لە گنۆسیەتدا هەن، جیهان —و مادە لە خۆیدا ــ لە ڕێبازی مانی Mani[٢١١] ـدا خراپەیە، هێڵی هاوبەشی نێوان هەموو ڕێبازەکانی گنۆسیەتیش ئەوەیە کە دەبێت مرۆڤ لەم جیهانە ڕزگار بکرێت ، بە سووکی تەماشای جەستە و مادە و کاروبارە دنیاییەکان بکرێت، ئەم خەسڵەتە لە گنۆسیەتدا هەیە هەر لە سیمۆن Simon ــی مەجوسییەوە[٢١٢]، کە زۆر کاری سیحری

ئەنجام داوە و لێکچووی ئەو شتانە بووە کە گنۆسیەت بانگەشەی بۆ کردوون ــ بۆتە مایەی زوهد کە پایەکانی مەسیحییەتی زووکاتی هەژاند، بەڵام ئەم لێکچوونە پەیوەستی نێوان گنۆسیەت و مەسیحییەتمان بۆ دەرناخات.

**٤- گنۆسیەت و مەسیحیەت ، نزمیی ژن :**

کەواتە گنۆسیەت پێی وایە خراپەی بنەڕەتی بۆ ئەم جیهانە یەك حەقیقەتە، هەر ئەویش راڤەی بوونی ئەم خراپە دەکات بەهۆی ئەوەی "دروستکەر"ێك هەیە کە جیهانی لە مادەی شەرەنگێز دروست کردووە، نەك دروستکراوی خودای گەورە بێت، بەڵام مەسیحییەت لەلایەکەوە جەخت لەسەر چاکایەتی جیهان و چاکایەتی خواوەند دەکاتەوە، جیهان خودای باڵا و مەزن دروستی کردووە، ئەویش خواوەندی چاکەیە، لەبەرئەمە جیهان هەر لە بنەڕەتییەوە بە چاکە هاتووە، بەڵام کاتێك مرۆڤ لە ویستی خواوەند سەرپێچی کردووە ئەوا بۆتە جیهانێکی شەرەنگێز و خراپە، لەبەر ئەمە هەڵوێستی مەسیحی لەنێوان رەتکردنەوە و قەبوڵکردنی جیهاندا لە کێشمەکێشدایە، ئەم گەردوونەی دەیبینین دەبێت وا قەبوڵی بکەین کە چاکە یان باشەیە: «خوا بینایە بە هەموو ئەو کارانەی کە دەیکات ئەگەر ئەوە زۆر باشیش بێت» (سفر التکوین الإصحاح: ٣١) بەڵام بەهۆی ئەو راستییەی کە "خراپە"یە دەبێت رەت بکرێتەوە وا پێدەچێ تەوژمە زوهدییەکان کە لە سەدەی یەکەمی زایینیدا مابوونەوە — جێکەوتەکانی لەسەر هاوسەرگیری رەنگیان داوەتەوە، لەمەشدا لەژێر کاریگەری ئەوەدا بووە کە لە زمانی قەدیس پۆلسەوە —نووسەری سفری خەون رۆیا) ــ هاتووە و بینینی پاکیزەیی وەك ئەوەی لە هاوسەرگیری باشتر بێت[٢١٣] .

هەندێك توێژەر ئاماژە بەوە دەدەن، لە سەردەمی کۆندا لە جیهانێکدا کە گۆڕانکارییەکی بەردەوام بەسەریدا زاڵ بووە، مرۆڤ هەستی بە نائارامی کردووە بۆیە هەوڵی داوە لەدەست ئەم هەستە نیگەرانکەرانە هەڵبێت ، لە جۆرێك "گنۆس Gnosis" ــدا بەدوای ئارامگەیەکدا گەڕاوە بۆ خۆی، ئەوەش هەڵهێنجانی مرۆڤە ، خۆونکردنە لە ناوچە نەزانراوەکانی دەروون ، لە کینەی ئەم جیهانە ، ئەو ژنەیش کە

وا تەماشای دەکرا تەنیا جەستەیەکی مادییە —لە سەرجەم ڕێبازەکانی گنۆسیەتدا دابەزی بۆ ئاستی لە پیاو نزمتر، بەم جۆرەش ژن بە مەترسییەك لەسەر پیاو دانرا ، ئەو هەستانەیش بەرجەستە بوون کە لێیان رایدەکرد تا بوونە پاڵنەری گرتنە بەری ڕێگای ژیانی زوهد و باڵادەستی[٢١٤].

## سێیەم: ماکرینا و.. روحی ژن

گریگۆریی برای "ماکرینا" لە دیالۆگی "لەبارەی دەروون و قیامەتەوە" پێناسەی ماکرینامان بۆ دەروون بۆ دەگێڕێتەوە، بەڵام پێی ئەوایە ئەم پێناسەیە بۆ راڤەکردنی بەهرە "مەلەکە"کانی دەروون بەس نییە، ئەو (واتە گریگۆری) پێی وایە بەهرەگەلێکە زیاتر لە بەهرەکانی بیرکردنەوە ، ژیان پێدان ، دەرکبردنی هەستەکی هەن، بەهرەگەلێکی تر هەن تایبەت بە ئارەزوو و تووڕەیی کە دەکرێت وەك پاڵنەری زۆرێك لە هەڵچوونەکان تەماشا بکرێن، ئاشکرایە ئەم پاڵنەرانە پاڵنەری جەستەییش نین، بۆیە دەبێت زیاتر سەر بە دەروون بن وەك لەوەی سەر بە لەش بن، یان پێمان وابێت دەروونێکی تریش هەیە، ئەم دوو بیرۆکەیە لە ماکرینا دوور بوون، لەبەرئەوەی لای ماکرینا چییەتی (ماهیەت) دەروون مەلەکەی بیرکردنەوەیە بۆیە هەڵچوونەکانە —لەلایەك ـــ ناکرێت سەر بەو مەلەکەیە بن، ـــ لە لایەکی دیکەیشەوە ـــ ناکرێت گریمانەی بوونی دەروونێکی تر لە ناوەوەماندا بکەین.

ماکرینا وا وەڵام دەداتەوە کە گازاندەکانی (إعتراچات) گریگۆری لەجێی خۆیدان، بێگومان لە ناوەوەماندا هەڵچوونگەلێکی وەکو برسێتی و ئارەزوو هەن، بەڵام ئایا ئەم هەڵچوونانە سەر بە چییەتی (ماهیەت) دەروونن؟ یان دواتر بۆی سەربار خراون؟ ئەم پرسیارانە دەبێت بەدوایاندا بچین و وەڵامیان بدەینەوە، جا ماکرینا پێی وایە ئەو کەسانەی لەبارەی دەروونەوە قسە دەکەن دەبێت کتێبی پیرۆز بهێنن بە زەینی خۆیاندا، کتێبی پیرۆزیش دەڵێ دەروون لەسەر "شێوەی خودا"

ئافەریدە کراوە، کەواتە لە خودا ئەچێت، لەبەرئەمە ناکرێت نە هەڵچوونی تێدا بێت و نە پەژارە!

بەڵام "گریگۆری" دەچێتە سەر پرسیارەکە: ئەی چۆن بۆ هەڵچوونەکان دەچیت: ئارەزوو، تووڕەیی، برسێتی ، ئەوانی تر؟ ماکریناش وەڵام دەداتەوە: ئەم جووڵە ناوەکییانە سەر بە دەروون نین، بەڵکو تەنیا توێکڵەکان Incrustation ـی دەروونن، چونکە هەمووومان دەتوانین ڕووبەڕووی ئەم هەڵچوونانە ببینەوە و بەسەریاندا سەر بکەوین، ئەوەش توانایەکە زۆربەی کات سوودێکی زۆری بۆمان هەیە.

بە کورتی گرنگترین خەسڵەتەکانی مشتومڕی نێوان ماکرینا و گریگۆریمان خستەڕوو، بە جۆرێك پیشانمان دەدا کە ماکرینا شارەزای فەلسەفەی یۆنانی بووە بە دیالۆگی "فایدۆن"ـی ئەفلاتوون ، کتێبی دەروون De Anima ـی ئەرستۆیشەوە، پاش ئەوەش دیالۆگ هەر لەنێوانیاندا بەردەوام دەبێت بەهۆی تێبینییەکی ماکریناوە کە دەڵێت ئەکرێت هەموو هەڵچوونەکان بگەڕێنرێتەوە بۆ هەردوو هەڵچوونی: ئارەزوو و تووڕەیی، بیّ ئەوەی وا لەم دووانە بڕوانین سەر بە چییەتی (ماهیەت) دەروونن، چونکە مەلەکەی تێهزرین کۆششی دەروونە، گریگۆریش گازاندەی دوورخستنەوەی هەڵچوونەکان لە سروشتی دەروون دەکات وێڕای ئەوەی کتێبی دەروون هەمیشە هەڵچوونەکان بە خراپ دانانێت، پاشانیش نابێت بە بەردەوامی دوور بخرێنەوە و خۆمانیان لیّ قوتار بکەین، "ماکرینا"ش لەگەڵ ئەمەدا کۆك دەبێت، وەلیّ دیسانەوەش دەڵیّ ئەوە ئێمەین هەڵچوونەکان ئاراستە دەکەین جا هەندێك جار دەیانکەینە هەڵچوونی باش و هەندێك جاریش خراپ. هەروەها جەخت لەسەر یەکایەتی دەروون ، ناقابلییەتی بۆ لەنێوچوون ، جاویدبوونی بەهۆی ئەم تاکایەتییەوە دەکاتەوە، مکووڕیشە لەسەر ئەوەی دەروونی مرۆیی نەمرە و دوای مردنیش هەر دەمێنێتەوە.

"ماکرینا" پەیڕەوی لە پێناسەکەی ئەرستۆ بۆ دەروون ناکات کە "دەروون کەماڵی یەکەم جەستەی سروشتی خاوەن ژیانە وەك بوون بەهێز (بالقوە)"[٢١٥]، ئەرستۆ

وای دەبینێت دەروون "وێنە" یان چییەتی جەستەی سروشتییە، لەبەرئەمە ناکرێت لە لەشی جیا بکەینەوە، لێرەشدا بە مردنی جەستە دەروونیش دەمرێت ــ ئەمەش بە هەمان ئەو ئەندازەیەی بەسەر دەروونی مرۆییدا دەچەسپێت بۆ دەروونی رووکی و ئاژەڵییش راستە، وەلێ دەروونی مرۆیی لای "ماکرینا" مەلەکەی بیرکردنەوە یان نۆوس Nous ــی هەیە، ئەمەش لە دەرەوە دێت و شیاوی فەوتبوون نییە، "ماکرینا" تێبینی ئەوەیش دەکات کە مەلەکەکانی دەروون ئەو هێزانەن ژیان و بیرکردنەوە ، توانای ئافراندن و داهێنان لە مادەدا دەخەنە گەڕ، جا سەرەڕای ئەوەش ئەرستۆ لە هەموو دیاردەکانی دەروونی کۆڵیوەتەوە، کەچی وای بۆچووە دەروون فانییە، لەبەرئەمە "ماکرینا" لۆمەی ئەرستۆ دەکات چونکە لە ئەنجامی ئەم واقیعانەوە دەرکی بە تاکایەتی دەروون و ئینجا نەمرییەکەیشی نەکردووە. بۆچوونی "ماکرینا" بۆ تاکایەتی دەروون لە پشت رەخنەگرتنی روانگەی ئەفلاتوون بۆ هەڵچوونەکان خۆی حەشار داوە، کاتێك لە دیالۆگی "فایدرۆس" ــدا بە لێکچواندنێکی میتافۆرییانەی بەناوبانگی دەروون بە گالیسکەیەك کە دوو ئەسپی جڵەوکراوی بەرپرس لە هەڵچوونەکان رایدەکێشن، "ماکرینا" ئەم بۆچوونە رەت دەکاتەوە، چونکە لای ئەم دەروون، تاکە و لە خودا دەچێت ، هەر لە بنەڕەتیشەوە "بێ هەڵچوونە"[٢١٦].

لە مشتومڕەکەی "ماکرینا"وە لەسەر سروشتی دەروون و ئافراندنی مرۆیی ئەوە روون دەبێتەوە ئەو هیچ جیاوازییەکی جەوهەری نابینێت لەنێوان دەروونی پیاو و دەروونی ژندا، جەوهەری دەروون لای ئەو، توانایەتی بۆ بیرکردنەوەی عەقڵی لەمەشدا جیاوازی لەنێوان پیاو و ژندا نییە، هەڵچوونەکانیش بەشێگەلێك نین لە دەروون، هەروەها "ماکرینا" لۆمەی ژنان ناکات —وەك ئەوەی کلیمنت ئەسکەندەری کردی ــ لەسەر هەڵچوونە شەرەنگێزەکان و رەزیلەتە جیاوازەکان[٢١٧]، لەبەرئەوەی وەك بینیمان "ماکرینا" پێی وا نییە هەڵچوونەکان بەشێك بن لە چییەتی دەروون بەجۆرێك کە ببنە بەشێك لە سروشتی ژن «هێندەی دەگەڕێنەوە بۆ هەڵبژاردنی ئازادانە لای هەر

ژنێك، لێرەشدا بەرپرسیارێتییەکە دەکەوێتە ئەستۆی تاکەکەسییانەی ژنەکانەوە، بەڵام ناگەڕێنەوە بۆ سروشتی جەوهەرییانەی دەروون لای ژن ــ ئەوەش تێگەیشتنێکی زۆر قووڵترە لەوەی کلیمنت ئەسکەندەری کە وای داناوە سروشتی ژن بەو جۆرەیە «.. شتێکی تەواو بێ ئابڕوو و شەرمەزار».. [٢١٨]، بەڵام "ماکرینا" وای دەبینێت سروشتی دەروون یەك سروشتە، ئەمەش لای پیاوان و ژنان یەکسانە ، "لەسەر "شێوەی خودا" ئافەریدە کراوە و هەر لەویش دەچێت..!

وا دەردەکەوێت باسیلۆس Basilius ــی برای کە نازناوی گەورەی لێنرا بوو ، یەکێك لە "سێ مانگەکە"[٢١٩] ــوەك وایان پێ گوتوون ــ و مامۆستای کەنیسەش بوو ــ لەم تیۆرەدا بەشداری لەگەڵ کردووە، جا ئێمەش وای دەبینین ئیصحاحی یەکەم لە سفری دروستکردن (سفر التكوين) شرۆڤە دەکات، بەوەی دەڵێت:

«ژنیش دارای خەسڵەتەکانی ئەو هەبووەیە کە لەسەر شێوەی خودا ئافەریدە کراوە بە هەمان ئەو ڕێگایەی کە پیاو دەبێتە خاوەنی ئەم خەسڵەتانە، سروشتی هەردووکیان یەکە، لە شەرەفدا یەکسانن، لە فەزیلەتدا یەکسانن، لە سوودیشدا یەکسانن ، لە وەختی سووکایەتی پێکردنیشدا لە یەك دەچن».. [٢٢٠]. واتای ئەمەش ئەوەیە "باسیلۆس" وا لە دەروون ــیان زەین یان عەقڵ ــ لای پیاوان و ژنان دەڕوانێت کە یەك دەروونە ، لەسەر شێوەی خودایە، یاخود پریشکێکی خوداییە ، هەردووکیشیان پێکەوە ــپیاو و ژن دەتوانن لەڕێگەی فەزیلەتە جیاوازەکانەوە لێکچوون لەگەڵ خودا وەدی بهێنن، ئەگەر چی ــبە بۆچوونی ئەو ــ تەنیا خودی مەسیح کە لە هەموو لایەکەوە کامڵ بووە، لێکچوونی کامڵ وەدی دێنێت. بەم جۆرە باسیلۆس وا لە ژن دەڕوانێت، لە بواری توانای عەقڵی و روحییەوە، لەگەڵ پیاودا یەکسانە: «و لەبەرئەوەی لەسەر شێوەی خودا دروست بووە، بۆیە هەمان عەقڵ ــیان زەین ــ ی هەیە و ئینجا ــوەك پیاویش ــ هەمان زاڵێتی و باڵادەستی هەیە بەسەر بوونەوەرەکانی تردا (گیاندارەکان) و بەسەر ئارەزووە نزمەکانیدا».. [٢٢١].

## چوارەم: ماکرینا و.. ئافراندن و بەرجەستەکردن و قیامەت

بۆچوونەکانی "ماکرینا" لەبارەی "ئافراندن"ـەوە بەدوای بیرۆکەکەیدا دێن لەبارەی هەڵچوونەکانەوە: لە کتێبی پیرۆزدا مرۆڤ لەسەرەوەی بوونەوەران وەستاوە، ئینجا لە ریزبەندی بوونەوەرەکاندا رووەکەکان و ئاژەڵەکان لەدوای مرۆڤەوە دێن، جا ماکرینا وای بۆ دەچێت دەروونی رووکی لە رووەکدا بوونی هەیە، لە کاتێکدا دەروونی رووەکی هاوکات بە وەزیفەکان و مەلەکەکانی دەرکبردنی هەستەکییەوە لە ئاژەڵیشدا هەیە، بەڵام جەورهەی دەروونی مرۆیی توانایەتی بۆ بیرکردنەوە و تێهزرین، وەلێ دەروون پەیوەستە بە سروشتی ئاژەڵییشەوە، ئیدی "ماکرینا" باوەڕی بەوە کرد دەروون نەمرە ، پاسەوانی ئەو رەگەزانەیە کە جەستە دوای مەرگ بۆی دەگەڕێتەوە، لای ئەو جەستە دووبارە لە رەگەزە کۆنەکان لە لەشێکی وردتردا پێکدەهێنرێتەوە، ئەم لەشە روحییە نوێیەش لە جەستەکەی پێشوو ئەچێت ، تەنانەت دەروون بە ئاسانی دەیناسێتەوە.

### ١- ماکرینا و ترادسیۆنی ئەفلۆتین

وا دەردەکەوێت یەکخستنی میانەی خودا و چاکە و جوانی لەلایەن ماکریناوە، ریشەگەلێکی هەیە وان لە ئەفلاتوونیزمی نوێدا، بەتایبەتیش نۆنۆیی یەکەم و شەشەمی ئەفلۆتین، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەفلۆتین لە نۆنۆیی چوارەمدا ئەوە دووپات دەکاتەوە دەروونی مرۆیی ئەگەرچی یەك ــ ە بەڵام ئەرکێکی دوو سەرەی هەیە: «دەروون یەك ــ ە ئەگەرچی ئەو مەلەکەیەی کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا کار دەکات جیاواز بێت. هەموو مەلەکەکانی تر وان لە هەر یەکێك لەم دوو مەلەکەیەدا»..[٢٢٢]، هەروەها دەڵێت ئەو جوانیەی لە جیهانی هەستەکیدا هەیە هاندەرێکی دەروونی مرۆییە بۆ هەوڵدان بەرەو جوانیی جیهانی عەقڵی کە زانستی هەستەکی کۆپییەك یان وێنەیەك یان لێکچوویەکی ئەوە، ئەفلۆتین لە نۆنۆیی پێنجەمدا پرسیاری ئەوە دەکات بۆچی دەروونەکانی خودا باوکییان جێ هێشت؟ دەروون لە لەشدا بەرجەستە بووە بەڵام

تاسەی هەیە بۆ جیهانی عەقڵی، واتە بۆ خودا، ئەو پێی وایە جیهانی عەقڵانی خراپەی تێدا نییە، خۆ ئەگەر جیهانی هەستەکی وێنەیەك یان کۆپییەکی ئەو بێت ئەوا مانای وایە ئەم جیهانە بینراوە لە ئاستێك لە ئاستەکاندا بەشداری لە جۆرێك "چاکەکاری"ـدا دەکات، وێڕای بوونی ڕەگەزێکی تاریك لەم جیهانەدا ئەویش "هیولی" یان مادەیە، لای ئەفلۆتین دەروونی مرۆیی لە وەختی بوونی لە لەشدا ئەرکی پاراستنی لە ئەستۆیە، بەڵام ئەرکێکی تریشی هەیە ئەویش گەڕانە بە دوای ڕێگەیەکدا بۆ گەڕانەوە بەرەو ئەو جیهانە عەقڵییەی کە لێوەی هاتووە، ئەویش وەك ئەفلاتوون لە "تیماوس ٨٧ هـ"ـدا پێی وایە مرۆڤ لە دەروون و لەش پێکهاتووە (نۆنۆیی یەکەم) ئەمەش واتە جەستەی دووەم گونجاوترین جەستەیە بۆ سروشتی مرۆڤ ، فەوتبوونیشی پەیوەندی نییە بە لەکارکەوتنی دەروونەوە، جا تەنیا دەروونی بەرجەستە لە لەشدا دەتوانێت هەڵە بکات، بەڵام ناتوانرێت لە کۆتایی زەماندا جەستەی مرۆڤ بگەڕێنرێتەوە بۆ جیهانی بینراوی هەستەکی، چوون ئەوە بەشێکە لە ڕەوتی ئەزەلییانەی لێ ـــ کەوتنەوە (لێ ڕژان ـــ فیچ).

بە پێچەوانەی ئەمەوە ماکرینا پێی وایە فەنابوونی جەستەی مرۆڤی ئێستا هۆکارەکەی "تێکەوتن"ـە، واتە تێکەوتنی مرۆڤ لە گوناهی یەکەم، بەر لە گوناهەکە مرۆڤ خاوەنی جەستەیەکی بێ هەڵچوون بوو (بڕوانە کتێبەکەی لەبارەی دەروون و قیامەتەوە ـــ بەشی هەژدەیەم)[٢٢٣].

"ماکرینا" پێی وایە دەروون لە ڕۆژی قیامەتدا جەستەی ڕوحی کە خاڵییە لە سۆز و هەڵچوونەکان بەدەست دێنێتەوە، ئەفلاتوون لە دیالۆگی "تیماوس"ـدا پێی وایە لەنێوچوونی جەستەی مرۆیی لە سروشتی مرۆڤدایە ، خواوەندەکان بە بینراوی دروستیان کردووە، لە کاتێکدا دەروونی مرۆڤ پەروەردگار Demiurges خۆی دروستی کردووە، بەم جۆرەش مرۆڤ پێکهاتووە لە دەروون و لەش، لەم جیهانەیشدا ئەرکەکەی بۆتە ژیان —وەك لە دیالۆگی تیماوسدا (٤١ هـ و ٤٢ هـ) هاتووە، ئیدی مرۆڤ لە بەرجەستەبوون یان دۆنادۆن دەترازێت ئەگەر بێتوو بەشێوازێکی باش و ڕاست

ژیا، بەڵام ئاشکرایە "ماکرینا" لە بیرکردنەوەیدا لە ئەفلاتوون جیاوازە و پێی وایە جەستەی مرۆیی قیامەتی دەبێت ، لە کۆتایی زەماندا دەروون بە ڕێگەیەکی تایبەتی بەدەستی دێنێتەوە.

ئەو دەڵێت:

«ئەو کات دەبینیت ئەم بەرگە لەشییەی کە ئێستاکە بەهۆی مردنەوە هەڵدەوەشێتەوە، سەرلەنوێ لە هەمان ئەو ڕەگەزانە دروست دەبێتەوە، نەك لەسەر بنەمای پێکهاتە قورسەکەی ئێستای، بەڵکو لە کۆمەڵە داوێکی ناسکتر و باریکتر دەچنرێت».. [٢٢٤].

دەبێت سەرنجی ئەوە بدەین "قیامەت" بە توێکڵ و کاکڵەوە بیرۆکەیەکی مەسیحییە ، ماکرینا لەم بیرۆکەیەدا پشتی بە کتێبی پیرۆز بەستووە، وەك ئەوەی دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

**٢- ماکرینا و.. فرفۆریوس:**

لای "فرفۆریوس"ـی فەیلەسوفی ئەفلاتوونیزمی نوێ ـ قوتابیی ئەفلۆتین ـ تێڕوانینێك هەیە دەتوانین بە هزرەکانی مامۆستاکەی بەراوردی بکەین، قوتابییەکە پێی وا نییە شتە مادییەکان یان جەستەییەکان Corporeal خراپ یان شەرەنگێزن، وێڕای ئەوەی کە پێی وایە پێویستە دەروون لە هەموو شتە جەستەییەکان هەڵێت بۆ ئەوەی لە جیهانی باڵادا بگاتە ئامانجەکەی خۆی، دەبێت مرۆڤ وا وێنای خودا بکات ئامادەگی لە هەموو ئەو کارانەدا هەیە کە ئەنجامی دەدات، ئەو چاودێریی هەڵسوکەوت و کردەوەکانیان ئەکات، خودا هۆی هەموو شتە جوان و چاکەکانە لە جیهاندا، ئەمە لەکاتێکدا کردەوەی مرۆڤەکان هۆی خراپەی ئاکارییە، ئەفلۆتین پێی وا بوو گوناه لە جیهاندا هۆیەکەی ئەوەیە مرۆڤ ملکەچی شتانێك دەبێت کە لە دەروون نزمترن، لای ئەو کاتێك مرۆڤ لە دایك دەبێت (ئەو لێرەدا پەیڕەوی لە ئەفلاتوون دەکات لە تیماوس دا ٤١ م) جۆرێکی دیکەی دەروونی باڵای عەقڵمەندی

بۆ زیاد دەبێت، بەم جۆرەش دەروونی مرۆیی دەروونێکی پێکهاتوو و لێکدراوە، ئەم "پێکهاتەیەش" دەتوانێت هەڵەکان ئەنجام بدات، ئەمە لە کاتێکدا دەروونی باڵای مرۆڤ —کە خودی راستەقینەکەیە ــ وەك خۆی و بێ تێکچوون دەمێنێتەوە. بەڵام فرفۆریوس بە راشکاوی دەڵێت هۆکاری هەڵە گەورەکان نابێت لەنێو لەشدا بۆی بگەڕێین، بەڵکو لەنێو دەرووندا، ئەو وایدەبینێت فەزیلەت تاکە رێگەیە بۆ لای خودا، ئەو مرۆڤەیشی بەدوای چێژەکاندا هەڵپەیەتی بە رەهایی دژ بە خۆشەویستی خودایە، دەبێت مرۆڤ واز لە هەڵچوونەکان بهێنێت و جڵەوی ئەو هەستانە بکات کە دەیوروژێنن، بۆیە ئەویش وەك ئەفلاتوونی مامۆستای پێی وایە دەکرێت دەروون دوای مردنیش جارێکی تر بەرجەستە ببێتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە راشکاوی ئەو جیهانبینییەی ئەفلاتوون رەت دەکاتەوە کە لە تیماوسدا ختوویەتیەڕوو و دەڵێت دەکرێت دەروون جارێکی دیکە لە جەستەی ئاژەڵدا بەرجەستە ببێتەوە، مرۆڤ لە ماوەی ژیانیدا لەم سەر زەمینە دەتوانێت لەنێو دەروونیدا سامانە روحییەکەی خۆی بدۆزێتەوە، دەکرێت عەقڵ کار بکات، چونکە عەقڵی پیاوێکی دانا (یان ژنێکی دانا) خودا پەرستە، خوداش تاکە بوونێکە پیاوی دانا یان ژنی دانا پێویستی پێیەتی، هەروەها فرفۆریوس لە کتێبەکەیدا "دژی مەسیحییەکان Kata Christianoon" کە لە پازدە دەروازەدا نووسیویەتی— دژایەتی مەسیحییەتی کردووە لەبارەی هەستانەوەی جەستە، لای ئەو بیرۆکەی قیامەت پێکدژە لەگەڵ بۆچوونی ئەزەلییەتی جیهان، بەڵام ئەو پێی وایە روحی مرۆڤی باش هەرگیز ناکرێت جارێکی تر دابەزێتەوە، چوون ناکرێت حیکمەتی تەواو لەم ژیانەی دونیادا هەبێت ، ژیانی دوای مەرگیش پێویستە لەڕێگەی بوونی خوداییەوە کامڵ بکرێت.

### ٣- ماکرینا و.. ترادسیۆنی فیلۆ ئەسکەندەری:

فیلۆ ئەسکەندەری (٢٠ پ.ز ــ ٥٠ ز) فەیلەسوفێکی یەهودی بوو، لەو سەردەمەدا گەورەترین نوێنەری هزریی رۆشنبیریی یەهودی بە یۆنانی بوو،

کاریگەرییەکی بەهێزی کردە سەر هزری باوکان (باوکانی کەنیسە)، هەروەها ڕەگەزێکی تازەیشی بردە نێو مێژووی فەلسەفەوە وئەویش سروش (وەحی) بوو. بە ئەفلاتوونی دەگووت یەهود چونکە هەوڵیدا بۆ تەباکردنی نێوان یەهودییەت و ئەفلاتوونیزم، "فیلۆ" لە کتێبەکەیدا "لەبارەی ئافەریدەوە" و لە جێی دیکەشدا لە بابەتی ئافراندنی مرۆڤی کۆڵیوەتەوە و دۆکترینی "شێوەی خودا"ی ڕاڤە کردووە کە لە ئیصحاحی یەکەمی سفری دروستکردندا هاتووە، بەڵام ڕاڤەکەی ئاڵۆزە و بۆتە جێی بەد حاڵیبوون. ئەو لە هەندێك پەرەگرافدا پەسنی ژن دەدات وەك ئەوەی بوونێکی نزمترە لە پیاو ، بە بەرپرسی خراپکارییەکانی جیهانی دادەنێت، لە هەندێ کاتی تریشدا وەها لەبارەیەوە دەدوێت کە لە شێوەی خوادایە ، خودا لەسەر شێوەی خۆی دروستی کردووە، دەروونی عاقڵیش لای مرۆڤ، کە کۆپییەکە لە عەقڵی خودایی Divine Logos ڕەگەزی نییە، پێکدژییش لەنێوان ڕەگەزی نێر و مێدا سەر بە جیهانی هەستەکییانەی بینراوە ، "فیلۆ" لە لایەنی تیۆرییەوە بیری لەوە نەکردۆتەوە کە لای پیاو و ژن پێکەوە دەروونێکی عاقڵ هەیە، بۆیە هەردووکیان پێکەوە "لەسەر شێوەی خودا دروست کراون" بەڵام —وێڕای ئەوە — ژن وەك هەبوویەکی ڕاستی لە پیاو نزمترە ، هۆی خراپکارییە لەم جیهانەدا، هەروەها "فیلۆ" یەکەم کەسێك بوو ڕاڤەیەکی فەلسەفی بۆ ئیصحاحی یەکەمی سفری دروستکردن کردووە، فیلۆش —وەك ئەفلاتوون — قەناعەتی وا بووە ناکرێت خودا هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی خراپە دروست بکات، وەك چۆن چیرۆکی کەوتنەوە خوارەوە (دەرکردنی ئادەم حەوا لە بەهەشت و فڕێدانە خوارەوەیان بۆ سەر زەوی —و.ك)ی لە سفری دروستکردندا وا ڕاڤە کردووە کە ڕەمزێکە بۆ لەکارکەوتنی عەقڵ کاتێك هەست و سۆزەکان و هەڵچوونەکان لەخشتەیان بردووە، بەڵام مرۆڤ هەر بە هۆی ئەم عەقڵەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باردۆخە بنچینەییەکەی خۆی، وایشی دەبینێت خودا ناکرێت خراپەی دانابێت ، ناکرێت ببێتە هۆی هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی خراپە لە جیهاندا، بە ویستی چاکەی خۆی ئەم جیهانەی ئافەریدە کردووە ، ئامانجی مرۆڤیش لەسەر زەمین

مومارەسەکردنی فەزیلەتە هەمەجۆرەکانە لەگەڵ دەرودراوسێکانیدا، هەر ئەمەشە مانای یەککگرتن لەگەڵ خوادا، دەروونیش کە تاسەی خودا دەکات بەم ڕێگەیە ئامانجی خۆی وەدی دێنێت.

### ٤- ماکرینا و.. تیۆری بەرجەستەبوون:

"ماکرینا" ئەو تیۆرە جیاوازانەی بەرجەستەکردنی خوێندووە کە لای فەیلەسوفەکانی یۆنان باوبوون[٢٢٥] ، هەر هەمووپشیانی ڕەت کردۆتەوە، چونکە تیۆرەکان واتە جوڵەیەکی بازنەیی روحەکان لەنێوان ئاسمان و زەمیندا، ئەم جوڵەیەش لە گەڕانەوەیدا، پێش وەختە کەوتنەخوارەوەی دەروون دەخوازێت وەك هۆیەك بۆ سەرلەنوێ دەرکەوتنەوەی لەسەر زەمین، ماکرینا پێی وایە ئەم بیرۆکەیە پێکدژە لەگەڵ چاکەیی خودا و چاودێریی خواییدا، خۆ ئەگەر هۆکاری بوونی مرۆڤ هەڵە (گوناه) بێت، ئەوا مانای وایە بۆ فەزیلەت ناشێت، لە پەرەگرافی چوارەم لە کتێبی "لەبارەی دەروون و قیامەتەوە" ماکرینا بە روون و ئاشکرایی ئەو بیرۆکەیە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێت دەروونی مرۆڤی کارکەر دەکرێت سەرلەنوێ لە جەستەی ئاژەڵ یان رووەکدا وەك جۆرێك لە جۆرەکانی سزای ئەو تاوانانەی ئەنجامی داون بەرجەستە ببێتەوە یان دۆنادۆن ببێت، ئەفلاتوون ژیانی دەروونە جیاوازەکانی وێنا کردووە کە لە ئاژەڵە جیاوازەکاندا بەرجەستە دەبێتەوە، ئەم دەروونە لە شێوەی قوو (سەقاقوژ)دا بەرجەستە دەبێت، "دەروون"ــی "تامێریس Thameris"ــی سترانبێژ و شاعیر لە بولبولدا بەرجەستە دەبێت ، ئەوانی تریش لە شێوەی شێر و ئیدی بەم جۆرە[٢٢٦] ، هەروەها "ئەفلۆتین" بە تەواوی ئەگەری بەرجەستەبوونی دەروونی مرۆیی لە جەستەی ئاژەڵ و رووەکەکاندا بە دوور نەبینیووە، ئەمەیش واتە دەروونی مرۆیی لای ئەم دوو فەیلەسوفە دەتوانێت خاسیەتە "عەقڵمەند"ەکەی خۆی لەدەست بدات وەك بەرەنجامێکی کردەوە خراپەکانی ، پاشان لەبەر ئەم هۆیە لە بوونەوەرە نزمترەکاندا بەرجەستە ببێتەوە، پێشتریش بینیمان "فۆرفریوس" ئەم تیۆرەی ڕەت کردۆتەوە ، وای

بینیووە دەروونی مرۆیی هەرگیز ناکرێت خاسیەتە عەقڵییەکەی خۆی لەدەست بدات، ئینجا ئەوەیشی رەت کردەوە لە جەستەی ئاژەڵاندا بەرجەستە ببێتەوە.

بەڵام "ماکرینا" بەڕوونی دژایەتی بیرۆکەی بەرجەستەبوونی کردووە، بەتایبەتیش ئەگەری بەرجەستەبوونەوەی دەروونی مرۆیی لە رووەك ئاژەڵاندا ، پێی وابووە ئەمە واتە وێرانکردنی فەرق و جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ، وێڕای ئەوەش جوڵەی بازنەیی دەروونی مرۆڤ لای ئەو جێی رەتکردنەوە بووە، چونکە ئەمە تێکەڵاوکردنی چاکە و خراپە لە خۆ دەگرێت، جوڵەی بازنەیی لە راڤەکەی "ماکرینا"دا لە ئاسمانەوە دەست پێدەکات و هۆکارەکەیشی کەوتنەخوارەوەی دەروون بووە، ئەو رەخنە لەم بیرۆکەیە دەگرێت، چونکە واتای ئەوەیە گوناھ هۆکاری بوونی مرۆییە لەسەر زەمین، سەرەڕای ئەوەش لەبەرئەوەی ئاسمان وا لەم جوڵەیە دەڕوانێت کە جێگیر و نەگۆڕە بەهۆی وەسەنییەکانەوە (بتپەرستەکان)، ئەوا ناتوانین راڤەی ئەوە بکەین کە چۆناوچۆن کەوتنە خوارەوەی دەروون لە ئاسمانەوە روویداوە، لێرەوە روونە ماکرینا تیۆری ئۆریگن Origen (١٨٥ ــ ٢٥٢ ز) ــی فەیلەسوفی لاهوتناسی ئەسکەندەری بەناوبانگ رەت دەکاتەوە کە پێی وابووە کەوتنەخوارەوەی بوونەوەرە ئازاد و عەقڵمەندەکان بۆتە هۆی ژیانی مرۆیی لەسەر زەمیندا، وەلێ "ماکرینا" پێی وایە دەروون و لەش پێکەوە خودا بە ویستی ئازادی خۆی ئافراندوونی ، دەروون پێش لەش نەهاتۆتە بوون وەك ئەوەی هەندێك فەیلەسوف وای بۆچوون، هەمان شتیش لەبارەی وەچەخستنەوەوە بڵێ، دەروون و لەش پێکەوە لە وەختی سکپڕیدا دێنە بوون، ئەمەش لای "ماکرینا" واتە دەروونی ئامادە لە تۆودا کە دروستبوونی بوونەوەری زیندووی لێوە دەستپێدەکات ، کاتێك مرۆڤایەتی رێڕەوی خۆی وەردەگرێت و سەرپێ دەکەوێ ئیدی پرۆسەی دروستبوون و لەنێوچوون، یان دەرکەوتن و ونبوون، بزر دەبێت و لە ئارادا نامێنێت، ئەوەش رۆژی زیندووکردنەوە و قیامەتە، لەوێدا مرۆڤایەتی — بە دەروون و لەشەوە ــ بەشداریدەکات لە ژیانێکی ئەزەلییدا، هەر لەو رۆژەدا جەستەی فەوتبووی مرۆیی بونیادە نەمرەکەی خۆی وەدەست دەخاتەوە کە بەر لە

کەوتنەخوارەوە هەیبووە، ئەوەش لەبەرئەوەی "ماکرینا" پێی وابووە سیفەتی فەوتبوونی جەستەی مرۆڤ لە بەرەنجامی کەوتنە نێو گوناهی یەکەمی بووە، بەڵام ئەوەی کە بگوترێت مرۆڤ جەستەیەکی هەیە ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە کەوتنەخوارەوەوە نییە، بگرە بە پێچەوانەوە بوونی لەشێك بۆ مرۆڤ بەشێکە لە سروشتی خۆی، جیاوازی و ناکۆکییش لەبارەی ئەم خاڵەوە لە نێوان ماکرینا و ئۆریگندا بە روونی دیارە، لای ئۆریگن ئەو جەستە روحانییەی لە رۆژی قیامەتدا بوونی هەیە ئەگەری بزربوون و لەنێوچوونیشی دوور ناخاتەوە، وەلێ "ماکرینا" بیرۆکەکەی خۆی لەبارەی قیامەت و زیندووبوونەوە لەسەر بنەمای کتێبی پیرۆز دادەمەزرێنێت، وەك لە مزمارەکانی داوددا هاتووە کە لە رۆژی قیامەتدا هەموو شتەکان دەگەڕێنەوە و دەستدەخرێنەوە، ئەویش گەڕانەوە و وەدەستخستنەوەی ژیانی مرۆیی وەك بەشێك لەم وەدەستخستنەوە و گەڕانەوە سەراپاگیرە دەبینێت.

دیالۆگەکە لەنێوان "ماکرینا گریگۆریی برای"ـدا بە بەرگریکردن لە تیۆری مەسیحییەت لەبارەی زیندووبوونەوە و قیامەتەوە کۆتایی دێت، کە ماکرینا زۆربەی بەڵگەکانی لە کتێبی پیرۆزەوە دەست خستووە، هەر لەبەر ئەمەش لە کۆتایی دیالۆگەکەدا کۆمەڵێك رەهەندی لاهوتناسییانەی بەچێژ دەبینینەوە، ئەو هزرە زۆرانەیش کە دواتر براکەی لە کتێبی "ئافراندنی مرۆڤ"ـدا گوزارشتی لێ کردوون، خوشکە گەورەکەی بەرپەچیانی دایەوە و بەرگریشی لێکردن. رەنگە ویژدان وا بخوازێت توێژەر نووسینێکی درێژ لەبارەی ئەم ژنە بیرمەندەوە بنووسێت کە بە یەکێك لە گەورەترین ژنەکانی سەدەی چوارەمی زایینی دادەنرێت، کە زەینێکی تیژ و فیکرێکی قووڵی فەلسەفی هەبووە! هەر لەبەرئەمەیش پێگەیەکی بەرزی لەنێو "ژنە فەیلەسوفەکان"ـی جیهانی کۆندا داگیرکردووە.

## هیپاشیا: لەدایکبوون و پێگەیشتن

لەم ڕەوشەدا ساڵی ٣٧٠ ز"هیپاشیا"ی خانمە فەیلەسوفی ئەسکەندەریی هاتە دنیاوە، کچی تیۆن Theon ـی مامۆستای بیرکاری لە مۆزەخانەدا ، دوا گەورە زانا لەو زانایەنەی ناویان لە تۆماری مامۆستایانی مۆزەخانەی ئەسکەندەرییەدا تۆمار کراوە[٢٢٧] .

بەڵگەنامەیەکی ئەوتۆ لەبارەی فێربوونی منداڵییەوە لەبەردەستدا نییە، وێڕای ئەوەی زۆرینەی مێژوونووسەکان وای بۆ دەچن لە سەرەتادا لای باوکی خوێندوویەتی و فێربووە کە بیرکاری و فەلەکناسیی لە مۆزەخانەکەدا گوتووەتەوە، وەلێ لەبەرئەوەی شتێك لەبەردەستدا نییە دڵنیامان بکاتەوە لەوەی باوکی فەلسەفەی خوێندووە ، لەبەرئەوەیشی "هیپاشیا" فەلسەفەی خوێندووە و پاشان لە شاری ئەسکەندەرییەدا (لەنێو مۆزەخانە و دەرەوەی مۆزەخانەکەدا) بە وانە گوتوویەتییەوە ــ ئەوا دەبێت لایەنی کەم گریمانەی ئەوە بکەین فەلسەفەی لای فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی ئەفلاتوونییەتی نوێ خوێندووە، ئەم فەلسەفەیەش لەو وەختانەدا لە شاری ئەسکەندەرییەدا باو بوو، یاخود دەبێت بە خوێندنەوەی مێژووی فەلسەفە ، بەتایبەتیش یەکەمجار کتێبەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ئینجا دواتر ئەفلۆتین و ئەفلاتوونیزمی نوێ، خۆی خۆی پێ گەیاندبێت[٢٢٨] .

بۆچوونێکی لاواز هەیە موعجەمی سویداس Suidas Lexicon[٢٢٩] بڕوای پێیەتی کە دەڵێت هیپاشیا فەلسەفەی لە ئەسینا خوێندووە، زۆرینەی مێژوونووسەکان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا کێشەیان هەیە ، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە هیپاشیا لای بیرکاریزانەکان لە مۆزەخانەی ئەسکەندەرییەدا فێربووە، هەروەها فەلسەفەیشی لای توێژەرانی دیکە خوێندووە (ڕەنگە لە فەیلەسوفەکانی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە بووبن)، ئەوەی لە گێڕانەوەکەی سویداسدا جێی گومانە ئەوەیە کە دەڵێت:

«کاتێك هیپاشیا گەیشتە ئەسینا، باڵادەستانی ئەو نەتەوەیە بە پەلە و هەڵداوان چوون بۆ لای» ــ ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت مانای ئەوە بووە ئەو کەسایەتییەکی

بەناوبانگ و ناسراو بووە، نەك قوتابییەك كە سەردانی شارەكەی كردبێت، وایش پێدەچێت كە «باڵادەستانی شاری ئەسینا پێشوازییان لێ كردووە، واتای ئەوەیە یان فەیلەسوفە گەورەكان لە ئەسینادا، بەشێوەیەكی باش مامەڵەیان لەگەڵ ئەو كەسە گشتییانەدا كردووە كە سەردانی شارەكەیان كردووە، یان ئەوەی هیپاشیا پێگەیەكی بەرزی هەبووە و نەتەوەكە لە ئەسینادا وەها سەردانیان كردووە ــ كە ئەو نەتەوەیە لە شاری ئەسكەندەرییە سەردانی بكەن»[٢٣٠].

كەواتە، وا پێدەچێت هیپاشیا ماوەی قوتابێتی لە شاری ئەسكەندەرییە بەسەر بردبێت وەك ئەوەی لە ئینسكلۆپیدیای بەریتانیدا هاتووە: «ژنە فەیلەسوفێكی میسری و زانایەكی بیركاری بووە ساڵی ٣٧٠ لە ئەسكەندەرییە لەدایك بووە ، هەر لەشاری ئەسكەندەرییەش ساڵی ٤١٥ كۆچی دوایی كردووە.. یەكەم ژن بووە كە لە بواری بیركاریدا درەوشاوەتەوە و بەوە ناوبانگی دەركردووە تێدا زانایە[٢٣١]» ــ بگرە ئەم گوزارشتە ئەوە بە هۆشدا دێنێت هەرگیز ئەسكەندەرییەی بەجێ نەهێشتووە. بە هەرحاڵ ئەوە ساغ بۆتەوە كە لایەنی كەم ماوەی قوتابێتی لەم شارەدا بەسەر بردووە ، قوتابییەكی بە كۆشش و جیامەند بووە ، دارای تواناگەلێكی زۆر بووە، ئەوەش لایەنی كەم لەبەر دوو هۆ:

یەكەم: ئەوە ساغ بۆتەوە لەسەر خەرجیی دەوڵەت فێر بووە ، لە سامانی گشتی خەرجییەكانی فێربوونی بۆ خەرج كراوە[٢٣٢]، ئەوەش شتێكی دەگمەنە یان ئاوارتەیەكە (إستپناو) دەلالەتی گرنگی هەیە، بەتایبەت ئەگەر زانیمان ژنان بەشێوەیەكی تایبەتی هەڵنەدەبژێردراون تا لەسەر سامانی گشتی خەرجییان بكێشرێت[٢٣٣].

دووەم: لە نزیكی كۆتایی ساڵی ٤٠٠ ز لە مۆزەخانەكە دامەزرێنرا، لەو كاتەدا تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو (یان لایەنی زۆر سی ساڵ) . دیسان لێرەشدا ئاوارتەكە روون و ئاشكرایە، بەتایبەتیش ئەگەر زانیمان حكومەتی ئەسكەندەرییە لەو كاتەدا مەسیحی (یان نیمچە مەسیحی) بووە، لە كاتێكدا هیپاشیا هێشتا لەسەر ئایینی یۆنان بووە، هەندێك لە مێژوونووسان وایدەبینین لەبەرئەوەی دامەزراندن لە

مۆزەخانەدا بە فەرمانی ئیمپراتۆر یان نوێنەرەکانی ئیمپراتۆر بووە، ئەوا بێتو نەبێ هیپاشیا مامۆستایەکی بەرز و لێهاتوو بووە و تەنانەت لەو تەمەنە کەمەیشدا تایبەتمەندییەکانی زانایانی مۆزەخانەکە گرتوویەتیەوە (وەك مووچە و شوێنی نیشتەجێبوون و پێگە و..هتد)[٢٣٤].

هیپاشیا وانەکانی لە مۆزەخانەکە (یان رەنگە لە کتێبخانە) گوتووەتەوە.

سوکراتی —مێژوونووسی مەسیحی ــ دەڵێت کاتێك هیپاشیا بە مامۆستای فەلسەفە لە ئەسکەندەرییە دامەزرا پیش فەیلەسوفانی سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی لە هەموو چوار قورنەوە پەلەپروزەیان بوو بۆ وانەکانی، قوتابییەکان لە هەموو لایەکەوە پۆل پۆل قەرەباڵغییان دروست دەکرد و کۆمەڵیان دەبەست، وتارەکان بە ناوی سەرپەرشتیار "Muse" یان "خانمی فەیلەسوف"ــەوە ئاراستەی دەکران، کاتێکیش هیپاشیا شرۆڤەی رێبازی ئەفلاتوون یان ئەرستۆی دەکرد — هۆڵی وانەکەی پڕ دەبوو لە دەوڵەمەندان و گەورەپیاوانی ئەسکەندەرییە.. ئەوان بۆ ئەوەی گوێبیستی بن لە هۆڵەکەیدا جیاواز لەوەی دەرەوە بوون، ئەو لەم بابەتانەدا لێکۆڵینەوەی کردووە کە لەمێژ بوو مایەی گفتوگۆ بوون: من کێم؟ بەرەو کوێ دەڕۆم؟ دەتوانم چی بکەم یان چی بزانم؟ شوێنی من لە سیستەمی شتەکاندا لە کوێدایە؟ سروشتی خوداوەند چۆنە؟ سروشتی چاکە و خراپە چییە..؟[٢٣٥]

لەکاتێکدا هیپاشیا بە جوانییە ئەفسانەییەکەی بەناوبانگ بووە[٢٣٦]، کەچی لە هاوسەرگیری دووریگرت و خۆی بۆ فیکر تەرخان کرد، بۆیە ئاساییە تووشی هەندێك تەنگ و چەڵەمە بووبێت لەلایەن ئەو قوتابییانەوە کە داوای هاوسەرگیری ، شێوەکانی تری دڵدارییان لێ کردووە، لەو گەنجانەی کە خوێندن بە جددی وەرناگرن، مێژوونووسەکان نموونەکانی ئەم تەنگوچەڵەمانەمان بۆ دەگێڕنەوە: یەکێك لە قوتابییەکان بەدوایەوە بوو، دوای ئەوەی لە وانەکانی بوویەوە بە ئەنقەست دوای کەوت، بەڵام دەرسی ئەم گەنجە قۆزە "مێباز"ەی دادا بەوەی پێش دامێنــە بەکارهێنراوەکەی، ئەگەر چی خاوێن بوو، کێشا بە سەروچاویدا ، بەسەریا قیژاندی

«ئەی گەنجی گەمژە ئامانجی تۆ چێژ وەرگرتنە لە سێکس، نەك چێژ وەرگرتن لە فەلسەفە»[237]، هەندێك لە مێژوونووسانیش وا دەگێڕنەوە کە "بە میتۆد و ڕێنماییە فەلسەفییەکان" هەوڵی چارەسەرکردنی هەڵچوونە بێ ئامانەکانی گەنجانی داوە. بەڵام مێبازەکە سڵی نەکردەوە و ئەو پەرۆیەی برد کە بەکاری هێنابوو، دیسانیش بەگژیدا چووەوە و گووتی: «گەنجی گەمژە ئەوە ئەو شتەیە کە خۆشت دەوێ، ئەوەیش جوانی نییە» لەبەر ئەمە ئەفلاتوونییەکان، کە ئەویش یەکێکە لەوان، پێیان وایە چاکە و حیکمەت و فەزیلەت و..هتد لەنێو خۆیاندا بەهای خۆیان هەڵگرتووە، بۆیە خەڵکی ئارەزوویان دەکەن لە خۆیاندا، بەڵام ئەگەر کەسێك روخساری جوان بێت، سیمای سەرنج ڕاکێش بێت، جەستەی کۆك بێت.. هتد، ئەوا ئەمانە بەهاگەلی تایبەتی مرۆیی ئەوتۆ نین، تەنیا بە لێکچوونی ڕواڵەتی پەیوەستن بە بەهاکانەوە، "هیپاشیا"ش توێژینەوەی لە بیرۆکەی ڕاستەقینەی خۆشەویستی ئەفلاتوونی کردووە و مومارەسەی کردووە، بەم جۆرەش توانی وا لە قوتابییەکی فەلسەفە لە ئەسکەندەرییە بکات بە قۆناغێك بگات کە هەست بە شەرم لەخۆی بکات، ئەمە باشترین ڕێگەی چارەسەرکردنیشییەتی[238].

"ویل دیورانت" بە گواستنەوەی لە موعجەمەکەی "سویداس Suidas"ـەوە چیرۆکێکی دیکەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە زێدەڕەویی زۆری تێدا کراوە، وێڕای ئەوەی ڕەفتارێکی ئابڕووبەریشی لێ هەڵبەستراوە کە ئەستەمە مرۆڤ بڕوا بەوە بکات وەك دەڵێن پاکیزەیەکی وەك "هیپاشیا" کاری وای لێ بوەشێتەوە، ناوەڕۆکی چیرۆکەکەیش بەم جۆرەیە: «گەنجێك بە پێداگرییە بەردەوامەکانی ئەوەندە وەڕزی کردووە تا ئارامی لێ بڕاوە، ئیدی هیچی تری پێ نەکراوە ئەوە نەبێت جلەکەی هەڵ بداتەوە ، پێی بڵێت: ئەوەی حەزت لێیەتی هێما بۆ وەچەخستنەوە دەکات ، هەرگیزیش ئەمە شتێکی جوان نییە»[239]، گومانێکی زۆر هەیە کە ئەم چیرۆکە جیاوازە ڕاست بێت، بەو دەلیلەی دیۆرانت خۆی گومانی لێی هەیە و دەڵێت: «ڕەنگە دوژمنەکانی بۆیان هەڵبەستبێت»[240]، چوون ئەو مێژوونووسانەی لەبارەیەوە نووسیویانە هەر هەموویان

کۆکن لەسەر ئەوەی هیپاشیا کەسایەتییەکی بەڕێز بووە، ئاکارێکی بەرزی هەبووە، بۆیە زۆر دوورە رەفتارەکەی پێشوو وەڵامدانەوەی ئەو بووبێت بۆ گەنجێکی بێ مێشك.

هەر چۆن بێت ئەوە سەلمێنراوە هاوسەرگیری لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی داوایان کردووە ببێتە هاودەمیان رەت کردۆتەوە.. لە هەموو ژیانیشیدا هەر بە پاکیزەیی مایەوە، وەك چۆن کەسایەتییەکی وەها بەهێز بوو کە بەسەر هەمووآندا سەپاندبووی رێزی لێ بگرن، ئیدوارد گیبۆن E. Gibbon (١٧٣٧ ــ ١٧٩٤ ز) کە گەرەترین مێژوونووسی ئینگلیزە لە سەردەمەکەی خۆیدا ــ بە گوازرشتێکی کورت ئاوەها پەسنی دەدات: «وێڕای ئەوەم ئەم پاکیزە خاکەڕایە جوانێکی کەم وێنە ، خاوەنی داناییەکی پێگەیشتوو بووە، کەچی عاشقەکانی رەت دەکردەوە ، قوتابییەکانی فێری وانەکان دەکرد، لەبەرئەمە خەڵکانی پایەدار و بەناوبانگ پەلەپروزەی سەردانکردنی ئەم فەیلەسووفەیان بووە»[٢٤١]، لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیشدا هاتووە.. «زمانپاراویی و خاکیبوون و جوانی لەگەڵ توانا عەقڵییە نایابەکانیدا لەخۆیدا کۆکردبوویەوە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری قوتابی بەلای خۆیدا راکێشا بوو»[٢٤٢]، سوکراتی مێژوونووسیش دەبێژێت: «لە زۆربەی ئەو کاتانەی لە بەردەم داوەران ، فەرمانڕەواکانی شاردا وەستاوە ــ کە لە بەردەم پیاواندا بووە ــ ئێجگار خۆ جڵەوگیر و رەوشتبەرز بووە کە لە عەقڵە رۆشنبیرەکەیەوە کەوتوونەتەوە، بێ ئەوەی ــشێوازە خاکییە شکۆدارەکەی خۆی لە دەست بدات، کە بەهۆیەوە لە کەسانی دیکە جیادەبوویەوە ، رێز و سەرسامیی هەموو خەڵکانی بۆ خۆی بەدەست دەهێنا»..[٢٤٣].

بەڵام ئەم سەرسامییە ــلە راستیدا ــ هەر هەموو خەڵکیشی نەگرتۆتەوە، گومانی تیا نییە مەسیحییەکانی ئەسکەندەرییە بە چاوێکی پڕ لە رق و کینەوە لێیان روانیوە، ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێك:

یەکەمیان: ئەو لەسەر ئایینی وەسەنی "بتپەرستی"ی یۆنانی مابوویەوە.

دووەم: مەسیحییەکانی یەکەم وا لە "هیپاشیا"یان دەڕوانی کە بەرجەستەبوونی زانست و فەلسەفە و کەلتوورە بە شێوەیەکی گشتی، ئەمانەش لە روانگەی ئەوانەوە لەگەڵ وەسەنییەتدا لە یەك شوناسدا یەکدەگرن، ئەی. وۆڵف A. Wolf دەڵێت:

« لە سەردەمی یەکەمی مەسیحیەتدا دوژمنایەتییەکی توند هەبوو لەنێوان مەسیحییەت لەلایەك و فەلسەفە و زانستدا لەلایەکی دیکە، ئەم دوژمنایەتییە لە هەڵوێستی ئەو سووك تەماشاکردنەدا مانیفێست دەبێت کە مەسیحیەت بەرامبەر ئەم دووانە هەیبوو»[٢٤٤] . ئەمەش لەسەر ئاستی زانستی ستەم لێکردن و چەوسانەوەی بیرمەندە وەسەنییەکان ، رووخاندنی پەرستکاکانیان ، سوتاندنی کتێبەکانیان ، وێرانکردنی رۆڵی هەر زانستێك کە لێی نیگەران بوون ، تالانکردنی ئەو شتانەی تێیاندا دەیان دۆزییەوە ــ پیشان دەدات، ئەمەش "تۆفیلۆس"ی گەورە ئەسقۆف ڕێبەرایەتی دەکرد.

سێیەم: بە بۆچوونی ئەوان "هیپاشیا" پەیوەندییەکی هاوڕییەتی نزیك و بەهێزی لەگەڵ ئۆرستیس Orestes ــی فەرمانڕەوای وەسەنی شارەکە هەبوو، کە لە زۆر پرسی فەلسەفیدا راوێژی بە هیپاشیا دەکرد، کاتێکیش ناکۆکی لەنێوان ئەم فەرمانڕەوایە و گەورە ئەسقۆفدا بەردەوام بوو، ئەوا بەرپرسیارێتی ئەم ناکۆکییانەیان خستە ئەستۆی هیپاشیا و لەمەشەوە بووە خاڵی نێوەندی لەو نالەباری و گرژی وئالۆزییانەدا کە لەنێوان مەسیحییەکان و دوژمنەکانیاندا روویدەدا ، زیاد لە جارێکیش لە شاری ئەسکەندەرییە دەردەچوو»[٢٤٥].

دەبێت لێرەدا کەمێك لەسەر سەرۆکی ئەسقۆفەکان بوەستین کە ئەو ژنە فەیلەسووفە هاوسەردەمی بوو، مەبەستیشمان لە "قەدیس کیرلس"ــە، ئەو لەبەرامبەر ئەو تاوانانەی لەبەرامبەر مافی گروپ و تایفەکانی تردا بۆ سەرکەوتنی مەسیحییەت ئەنجامی دەدا نازناوی "قەدیس"ــی پێ بەخشرا، وەك گیبۆنیش دەڵێت: «نازناوی قەدیس کە پێی بەخشرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بۆچوونەکانی و تیمەکەی لە دواجاردا زاڵبوون چارەنووسییانە»..[٢٤٦].

کیرلسی ئەسکەندەری ساڵی ٤١٢ ز وەك جێگرەوەی توفیلۆس Theopillus ـی مامی گەیشتە پێگەی سەرۆکی ئەسقۆفی شارەکە، دوای ئەوەی لە ماڵی ئەم مامەیدا وانەی ئیرەیی و رق و هەوەسی ئایینی وەرگرت، راستە پێنج ساڵی گەنجی خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك راهیبدا لە دێری بیابانی ناترۆندا بەسەر برد، کاتێك سیستەمی رەهبەنەی مەسیحی بۆ یەکەمجار لە میسر و بە دیاریکراویش لە شاری ئەسکەندەرییە دەرکەوت[٢٤٧]، بەڵام وێڕای ئەوەش "بەها وخۆشییەکانی ژیانی دونیا" بەسەریدا زاڵ بوو. یان بە گووتەی ئیدوارد گیبۆن «کاتێك کیرلس لە بیابان بوو نوێژی دەکرد و رۆژووی دەگرت وەلیّ هزرەکانی (ئەمە سەرزەنشی هاوڕێیەکییەتی) هەر بە دونیاوە گیرسابوونەوە»[٢٤٨]، لەبەرئەمە بە پەلە بە تاسە و پڕتاوەوە وەڵامی بانگهێشتێکی دایەوە کە لە مامەیەوە پێی گەیشتبوو کاتێك «تۆفیلۆس بانگهێشتی کردبوو بۆ نێو کۆمەڵان و قەرەباڵغی شار کە: پلە و پایە ، رۆشنایی ، لایەنگران و رازاندنەوەی ژیانی تێدایە، کابرای خەڵوەتگێڕی ئارەزوومەندیش دەستپێشخەری کرد بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بانگهێشتە ، مامەیشی هانیدا بۆ وەرگرتنی پێگەی "ئامۆژیاری گەل" و لەم بوارەشدا ئەو ناو و ناوبانگەی دەرکرد کە ئاواتەخوازی بوو، بلّندگۆیەکەی بە جەستە قەبە بە شان و شەوکەتەکەی پڕ دەکردەوە ، دەنگی پڕ سۆزی لە هەموو لایەکی کاتێدرائییەکەدا دەنگی دەدایەوە، هاوڕێیان و لایەنگران و ناسیاوان لێرە و لەویّ لێی دادەنیشتن و لە هەمووان زیاتر دەیانکردە چەپڵەلێدان و قرپ و قاڵ. لەو لایشەوە نووسەرەکان قسە و ئامۆژگارییەکانیان لە یادگاریی خێرادا تۆمار دەکرد بۆ ئەوەی بەسەر جەماوەردا دابەشی بکەین.

کاتێك کیرلس چووە سەر تەختی ئەسقۆفی، کە دواتر لە دەست دەرباری ئیمپراتۆری دەرهێنا ، سەرۆکایەتی ئایینی پایتەختێکی گەورە لە جیهانی کۆندا ئەویش شاری ئەسکەندەرییە بوو ، کە هێدی هێدی ئەتکی پێگە و دەسەڵاتی "ئۆرستیس" ـی فەرمانڕەوا مەدەنییەکەیی کرد، ئیدی بە تەواوی ویستی خۆی هەڵسوکەوتی بە سەدەقەی گشتی و تایبەتی شارەکەوە دەکرد ، دەنگی گڕی لە

هەست و سۆزی ئەو جەماوەرە بەر دەدا کە تازە بووبوونە مەسیحی، بەم جۆرەش شوێنکەوتوان و لایەنگرانی زۆر بوون ، بگرە زۆرێك لەو کەسانەی دیمەنەکانی مەرگیان دادەنا دەرمارگیرییان بۆ بۆچوونەکانی هەبوو ، کوێرانەش دوای فەرمانەکانی کەوتبوون[249] .

پەرۆشی کیرلس بۆ رووبەڕووبوونەوەی "هەرتوقییەکان" وەها تین و تاوی سەند کە لای ئەو ئەم چەمکە ئەو کەسانەیشی دەگرتەوە کە قەرزارباری فیکری ئەسقۆفە گەورەکان بن تەنانەت ئەگەر مەسیحییش نەبووبن. یەهودییەکان کە ژمارەیان زیادی کرد تا ئەوەی گەیشتە زیاتر لە چل هەزار کەس[250] ــ بگرە هەندێك وا دەگێڕنەوە ژمارەی کەسانی کۆمیونیتەی یەهود لە ئەسکەندەرییە لەو کاتەدا لە ژمارەی یەهودی ئۆرشەلیمی تێپەڕاندبوو[251] ــ لە رەوشێکی پڕ لێبوردەییدا دەژیان کە قەیسەرەکان و بەتلیمە "وەسەنییەکان" ماوەیەکی درێژیی حەوت سەد ساڵی بوو هەر لە زەمانی دروستکردنی ئەسکەندەرییەوە بۆیانیان رەخساند بوو، وەلێ کیرلس، بە بێ هیچ پشتیوانێکی یاسایی ، بێ هیچ پرس و رایەکی پادشایی ، بێ ئەوەی هیچ دەسەلاتێکی سیاسی هەبێت لە بەیانی رۆژێکدا سەرکردایەتی —وەك چۆن پێشتر مامەی کردی ــ کۆمەڵێك "ئاژەوەگێڕ"ی لە جەماوەری یاخی ، لە تێکدەران و فیتنەچی کرد، بۆ هێرش بردنە سەر پەرستگاکانیان، یەهودییەکانیش توانای بەرگرییان نەبوو، چوون ئەوان لە پەناوە بوون و بەو دۆخانە را نەهاتبوون، بۆیە شوێنی پەرستشەکانیان وێران کردن و لەگەڵ زەویدا تەختیان کردن، ئینجا ئەسقۆفی تێکۆشەر هێزە براوەکەیی بەوە پاداشت کرد کە رێی دا بە تالانکردنی ماڵ و سامانی یەهودییەکان، پاشان ئەوانەی لە نەوەکانی "گەلی کافر" مابوونەوە دەریکردن بە پاساوی ئەوەی لە دەولەمەندیدا زێدەڕەون ، رقیشیان لە مەسیحییەکانە.

ئۆرستیس Orestes ــی فەرمانڕەوای میسر لای ئیمپراتۆر سکالای لەو تاوانانە کرد کە کیرلس ئەنجامی داون، بەڵام سکالا دادوەرانەکەی بە باچوو، کە وەزیرەکانی "تیۆدسیۆس" بە خێرایی لەبیریان کرد، بەتایبەت سەرۆکی ئەسقۆفەکان پەنای

بردبووه بەر خەڵاتی گرانبەها کە یارمەتی یادەوەریی دەدا بۆ لەیادکردن، لەگەڵ ئەوەیشدا ناخی کیرلس هەر لە رق و کینە بەرامبەر ئەم فەرمانڕەوایە پاك نەبوویەوە ، خۆیی بۆ نایەوە تا هەلێکی بۆ هەڵبکەوێت، «کاتێك کەژاوەکەی فەرمانڕەوا بە شەقامەکانی شاردا تێدەپەڕی تاقمێکی پێنج سەد راهیبی لە راهیبەکانی بیابانی نەتران، هێرشیان کردە سەری، پاسەوانەکانی فەرمانڕەوا لە بەرامبەر وەحشەکانی بیاباندا هەڵهاتن، بە بەردباران بەرەنگاریەکانی قەبوڵ کرا بەوەی مەسحییە و کاسۆلیکییە، ئیدی خوێن بە روخساریدا هاتە خوار ، هاونیشتمانیە دڵسۆزەکانی ئەسکەندەرییە خۆیان بۆ رزگارکردنی گورج کردەوە»[٢٥٢] . دەبێت ئەم چرۆکەمان زۆر باش لە یاد بێت کە "گیبۆن" بۆمانی دەگێڕێتەوە، چونکە جارێکی تریش لە ژنە فەیلەسوفە ئەسکەندەرییەکە، بە رێگایەکی تۆکمەتر و وەحشیانەتر، دووبارە دەبێتەوە.

"هیپاشیا"، وەك باسمان کرد دوای ئەوەی رەتی کردەوە هاوسەرگیری بکات، تەنیا بۆ هزر دەژیا ، لە میحرابی فەلسەفەدا بووە راهیب، ئەم رێگەیە زۆر جیاواز بوو لە رێگەی ئەو راهبانییەتەی پێشتر باسکراون، ئەم پاکیزەیە لە ژیانێکی راستەقینەی روحیدا ژیاوە کە ئامانجی گەڕان بوو بەدوای حەقیقەتدا، خۆشەویستییەکەی بۆ فەلسەفە گەیشتبووە رادەیەك —وەك دیۆرانت دەڵێ[٢٥٣] — لە شەقامەکاندا دەوەستا و هەر کەسێك دەربارەی خاڵگەلێکی قورس لە نووسینەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆدا پرسیاری لێ بکردایە بۆی شرۆڤە دەکرد، هەروەها ئەفلۆتین و ئەفلاتوونیزمی نوێی خوێندووە ، جەختی لەسەر خۆشەویستی روحی کردۆتەوە نەك جەستەیی کە هەڵبەت لەگەڵ ئەفلاتوونیزمدا بە گشتی ، ئەفلاتوونیزمی نوێ بەتایبەتی کۆك و تەبایە[٢٥٤] ، دە تۆ بەراوردی نێوان خۆشەویستی وەسەنییەك و کافرە "راهیبەکان" لە دۆڵی نەترۆن بکە.

وەك گیبۆن دەگێڕێتەوە، خەڵکی بەتاسەی گوێگرتن بوون «لەم پاکیزە خاکەڕا جوان و قەشەنگە»، هەروەها خەڵکانی شارەکە هەوڵیان دەدا سەردانی ئەو ژنە

فەیلەسوفە گەنجە بکەن.. کیرلس بە چاوی رق و کینەوە سەیری ئەو ئاپۆرە زۆرەی گەورەپیاوانی دەکرد کە لەبەردەم دەرگای ئەکادیمییەکەیدا ریز بووبوون.. بۆیە پروپاگەندەیەکی بڵاو کردەوە —کە واپێدەچێ خۆی سەرچاوەکەی بووە ــ دەڵێت گوایە "کچی تیۆن" تاکە کۆسپە لە سەر رێگای "ئۆرستیس"ــی فەرمانڕەوا و "کیرلس"ــی سەرۆکی ئەسقۆفەکان[٢٥٥]، وەك ئەوەی ئەو پاگیزە خاکەڕایە ئەو سەرچاوەیە بووبێت کە بە سەرۆکی ئەسقۆفەکانی راگەیاندووە سەردەمی خۆی وەها دەست پێ بکات نەوەکانی وفاشیانۆس ــ کە لە تایفەکانی تر پاکتر و بێ ئازارتر بوون ــ [٢٥٦] بکاتە پەند، یاخود ئەو بووە ئاماژەی بۆ کردووە تا هێرش بکاتە سەر گەڕەکی یەهودییەکان لە شارەکەدا ، هەرچی تێدا یە تالآن بکرێت ، هەر کێی تێدایە دەر بکرێت، یاخود ئەو بووە پێنج سەد پیاوی رێکخستووە تا رێ لە فەرمانڕەوا بگرن و هێرشی بکەنە سەر.

هیچ شتێك لەمانە راستی نەبوون، بەڵام سەرۆکی ئەسقۆفەکان زەمینەسازیی ئەکرد بۆ تاوانێکی نوێ، لە رۆژێکی شوومی وەرزی رۆژووی گەورە "پیرۆز"دا ، بە دیاریکراویش لە شەوێکی تاریکی شەوانی مارسی ساڵی ٤٥١ ز، لەبەر هۆیەکی نادیار کە تا ئێستاش مێژوونووسەکان تیاماون لەو هۆکار و پاساوانەی مەبەستدارەکان تەخش و پەخشیان کردووە، ــ کۆمەڵێك لە رەهبانەکانی بیابانی نەترۆن ــ کە ساڵانێکی درێژیان لە بیابان بەسەر بردبوو، وەك دەیانگووت "ململانێی هەهوو هێزە خراپەکانیان دەکرد" خوازیاری جەنگ بوون «ململانێی ناخەکی دژی شەهوەتەکانی جەستە ، ئامرازەکانی دەروونی فەرمان بە خراپە"[٢٥٧] ــ ئەم راهیبانە بە ئاماژەیەك لە کیرلسی گەورەیانەوە رێگرییان لە کەژاوەکەی "هیپاشیا" کرد و وەستاندیان ، ئەو فەیلەسووفە گەنجە جوانەیان دابەزاند —وەك پێشتر لەگەڵ فەرمانڕەوای شارەکە کردییان ــ پاشان بەکێشیان کرد بۆ نێو کەنیسەی قەیسەرۆن Caesarun، لەوێ کۆمەڵێك لەو راهیبانە لێی چوونە پێشوو و دانە دانە جلەکانیان لەبەری داکەند تا هیچ پۆشاکێکی پێوە نەما و رووت و قووت بوویەوە وەك ئەو

کاتەی لە دایکییەوە هاتە دنیا[٢٥٨] ــ دیمەنێکی ئێجگار سەیر کە ئەم خەڵوەتگێڕە پاك و بێ گوناهانە ئەنجامیان داوە ــ بە هەر حاڵ دوای ئەوە پەترۆسی خوێنەر Peter th reader "نوێژخوێن بوو لە کەنیسەکەدا" لێی چووە پێش و بە رووتی سەری بڕی، کۆمەڵە راهیبەکەی دیکەش گرتبوویان تا نوێژخوێنەکە بتوانێت گۆشا و گۆش سەری ببڕێت، ئینجا راهیبە "دڵ پاکەکان" دەستیان کرد بە ئەنجامدانی ئەرکێکی زۆر سەیر ئەویش پارچەپارچەکردنی جەستەکەی بوو لەم کارەیش چێژیان وەردەگرت، پاشان هەر کۆمەڵێك پارچە دوای پارچەیان هەڵگرت و گۆشتەکەیان لە ئێسکەکەی بە کێردێکی هەردوو دەم تیژ داماڵی ، لە شەقامی سینارۆن Cinaron ئاگرێکی بە تینیان کردەوە «ئەندامەکانی جەستەیان فڕێدایە نێو ئاگرەکە، کە وەك رەسل دەڵێ شنە شنی بوو لە ژیان، تا ئەوەی جەستەکە بووە خۆڵەمێش، ئەوانیش، بە گووتەی ویل دیورانت "لە شادییەکی پیسی وەحشییانەدا" لە دەوری بانەزیان بەستبوو.

ئایا دەکرێت ئەم وەحشییانە قوتابی مەسیح بن؟ ئایا دەکرێت بڵێین ئەمانە "ڕووناکیی جیهان" و "خوێی زەمین"ن وەك حەوارییەکان پەسنی دەکەن؟ مەسیح کە لە مەرییەی مەجدەلیی زیناکار خۆش بوو ، پێی گوت: «لە گوناهەکانت بەخشراویت» (لۆقا ٤ ــ ٤٨) بە زیناکارێکی دیکەیشی گوت: «کێ لە ئێوە گوناهی نییە با یەکەمجار بەردێك بهاوێژێت» (یوحەننا ٧:٨).. ئایا دەکرێت کەسێك خانمێکی فەیلەسوفی سەر بڕیبێت کە خەڵکی سەردەمەکەی شاهید حاڵی بوون، قوتابی "کوڕی مرۆڤ" بێت کە لە ئامۆژگاریی چیادا دروشمی بەگژدا نەچوونەوەی خراپەی بە خراپە بەرز کردەوە: «بە خراپە بەر لە خراپە مەگرن، بەڵکو هەر کەسێك زللەیەکی سرەواندە روومەتی راستت روومەتەکەی دیکەیشی بۆ بسوڕێنە» (مەتتا ٥ ــ ٩)..

دەبێت—بەر لە هەموو ئەوانە ــ بپرسین بۆچی راهیبەکان بەر لەوەی بیکوژن جل و بەرگەکەیان لێ کردەوە؟ خۆ گەر تەمای"سەربڕین"ــیان هەبوو ئەی بۆچی بە تەواوی رووتیان کردەوە؟ ئایا دەروونناسی ناتوانێت شتێکی زۆرمان لەبارەی ئەم

هەڵوێستە سەیرەوە پێ بڵێت؟ ئایا پەیوەندییەك نییە لەنێوان ئەم هەڵوێستە ، ئەوەی هاوڕێکەی کیرلس لەبارەی کیرلسەوە گوتی "فیکری هەر لای دنیا بوو"؟ ئایا ئەمە مانای ئەوەنییە راهیبەکان کاتێك چوونەتە نێو جەنگەوە لەگەڵ شەهوەتەکانی جەستەدا تێیدا سەر نەکەوتوون ، بگرە سەرکەوتنیان رواڵەتی بووە، کاتێك هەر شەهوەتەکان بە زاڵێتی ماونەتەوە؟ ئایا جلەکانی داکەنراوە تا راهیبە "دڵ سافەکان" بتوانن جەستەیەکی پاکیزە "ببینین"، کە بەر لە سەربڕین بە تەواوی رووت و قووت بووە؟ پێشتر بینیمان هەمان ئەم دیمەنە چۆن لە "ئۆرستیس" ـی فەرمانڕەوا روویدا، خەریکبوو راهیبەکان لەنێوی بەرن ئەگەر هاتبا نەوە دڵسۆزەکانی ئەسکەندەرییە فریای نەکەوتنایە، ئەی ئایا جلەکانی ئەویشیان دادەکەند بەر لە کوشتنەکەی ئەگەر بیانتوانیبا ئەو کارە بکەن؟

رەنگە بەم پرسیارە خەندەیەکی خۆ نەویستانە دەموچاوی خوێنەر بگرێتەوە، ئەمەش وامان لێ دەکات پرسیاری یەکەم دووبارە بکەوینەوە: کەواتە بۆچی جلەکانی ئەو "پاکیزە"ـیان داکەند، ئەگەر شەهوەتەکانی جەستە هێشتا زاڵ نەبووبن؟ دەیانویست دڵی پاك و بێ گەرد چێژ لە دیمەنی جەستەیەکی رووتی جوان ببینێت، خۆ ئەگەر بۆ راهیبەکان دژوار بووبێت کە پێی بگەن، ئەوا بۆیان ئاسان بوو هەڵی درن!

**کارەکانی: چالاکییە فێرکارییەکان**

زانیارییەکان لەبارەی چالاکییە فێرکاریی و رۆشنبیرییەکانییەوە کە "هیپاشیا" ئەنجامی داون لە ژمارەیەك سەرچاوەوە بۆمان هاتوون لەنێویشیاندا هەندێك لە قوتابییە بەناوبانگەکانی، فەیلەسوفی یۆنانی دەمشیوس Damascius –لە شوێنکەوتووانی ئەفلاتوونیزمی نوێ ـــ بۆمان دەگێڕێتەوە کە هیپاشیا لەبارەی ئەندازەناسی و بیرکارییەوە وانەی گوتۆتەوە، "فلۆستگۆریۆس Philostogorius ـی زانای ئەسکەندەریی لە بواری وشەناسیی ڕێزمان (نحو)ـدا پێمان دەڵێت ئەو لە بیرکاریی تیۆن Theon ـی باوکی کە لەم زانستەدا بەناوبانگترین زانای مۆزەخانەی ئەسکەندەرییە بووە سەرکەوتوو بوو، هیسیچیوس Hesychius زانای ئەسکەندەری لە وشەناسیی ڕێزماندا لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی زایینیدا و خاوەنی موعجەمی وشە یۆنانییەکان ـــ بۆمانی دەگێڕێتەوە "هیپاشیا" وەك باوکی زانای فەلەکناسیی لێهاتوو بووە، ئەو لە هەموو ئەم بوارانەدا ناوبانگی خۆی لەو وتارانەدا تۆخ کردۆتەوە کە لەگەڵ سینسیوس Synesius ـی قوتابی خۆیدا، کە بە ناوبانگترین قوتابی بوو، ئاڵوگۆڕی کردووە، پێویستە هەندێك لای ئەم قوتابییە بوەستین:

«سینسیوس لە قورینا (هەرێمی بەرقەی ئێستە) لە دایك بووە، بۆیە زۆرجار نازناوی ئەم شوێنە دراوەتە پاڵی و پێیان وتووە سینسیوسی قورینایی ـــ دەوروبەری ساڵی ٣٦٥ لەدایك بووە، ساڵی ٣٩٣ لە پێنتاپۆلس Pentapolis –واتە پێنج شارەکەی بەرقە ـــ وە چوو بۆ ئەسکەندەرییە بۆ ئەوەی لای خانمە فەیلەسوفێك بخوێنێت کە تەمەنی بیست و سێ ساڵ بووە، بە نزیکەیی لە هەمان ئەو بەروارەدا کە سینسیوس گەشتی بۆ ئەسکەندەرییە کرد بۆ ئەوەی لای "هیپاشیا" بخوێنێت ـــ ئیمپراتۆری ڕۆمانی تیۆدوسیوس Theodosius مومارەسەی ریتواڵە ئایینیە وەسەنییەکانی لە میسر قەدەغە کرد، کە لەوێ هەر بە ڕاستی کاری گرژی و تێکدەری لەنێوان وەسەنییەکان و مەسیحییەکاندا بڵاو بووبوویەوە.

سینسیوس هاتە ئەسكەندەرییە بۆ ئەوەی بیركاری و فەلسەفە لای "هیپاشیا" بخوێنێت، بەڵام تا كۆتایی ژیانی بە هاوڕێیەكی بە ئەمەكی مایەوە، ئەو بە هیپاشیای دەگوت : «شرۆڤەكاری راستەقینەی فەلسەفەی راستەقینە». پاشان سەردانی ئەسینای كرد و دۆكترینە وەسەنییەكەی بەهێزتر بوو، بەڵام ساڵی ٤٠٣ لەگەڵ ژنێكی مەسیحی هاوسەرگیریی كرد، لەمەوە چووە سەر ئایینی مەسیحی ، سیانەكیی ئەفلاتوونیزمی نوێی كە پێكهاتبوو لە: یەك و عەقڵ و دەروون، گۆڕی بۆ باوك و روح و كوڕ، لەبارەی مەسیحییەتیشەوە زۆری نووسیوە لەوانە كتێبێك بەناونیشانی: "لەبارەی خەوزڕانەوە Deinsommis" و كتێبێكی تر بەناونیشانی "دیۆن Dion"، پاش كەمێكی تر لەبارەیانەوە دەدوێین.

جێی تێبینییە وێڕای گۆڕانی باوەڕی سینسیوسی قۆرینایی لە وەسەنییەتەوە بۆ مەسیحییەت، كەچی "هیپاشیا"ی مامۆستای هەر لە سەر ئایینی یۆنان مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە سینسوس زویر و توڕە نەبوو ، هەرگیزیش هەستەكانی بەرامبەر نەگۆڕا، كاتێكیش دواتر بە "ئەسقۆف لە كەنیسەیەكی كاسۆلیكی لە كەنیسەكانی بەتلیمە"دا دامەزرێنرا خۆشەویستییەكەی بۆی كەمی نەكرد ، ئیرەیی دڵی نەدەخوارد كاتێك پێیان دەگوت "ئەسقۆفی فەیلەسوف". دەی بەراوردی ئەم هەڵوێستە بكە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی قەدیس "كیرلس" لە بەرامبەر "هیپاشیا" كە پێشتر باسمان كرد، جا، لە یەك كاتدا، چ لەڕووی باوەڕ (دۆكترین)ـەوە بێت، یان لەڕووی پێگەوە.. پەیوەندی لەنێوانیاندا لەسەر بنەمای خۆشەویستی و رێزی دوو لایەنە هەر مایەوە، جۆرج سارتۆن دەڵێت: «.. ١٥٩ وتارمان (خگاب) بۆ ماوەتەوە، مێژووەكەیان لە ٣٩٤ ز دریٚ دەبێتەوە هەتا ٤١٣ ز.. ئەو لە وتاری پازدەدا داوا لە هیپاشیا دەكات ئامێرێكی بۆ دروست بكات بۆ پێوانەكردنی كێشی جۆریی پرسیار Baiyilion، ئەوەش جۆرێكە لە هایدرۆمەتر ــ لەم وتارەدا یەكەم وەسفێكی ئەم ئامێرەیە كە پێی گەیشتبێت»[٢٥٩].

"سینسیوس" له وتارەکانیدا باس لەوە دەکات لە سایەی "هیپاشیا"وە بە تەواوی رۆشنبیر بووە، ئەو کتێبەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆی —لەگەڵ شرۆڤەی تێر و تەسەلدا ــ پێ وتۆتەوە، هەروەها لای ئەو میتافیزیکای ئەفلاتوونیزمی نوێ و نهێنییەکانی خوێندووە، ئەمە وێڕای هەندێك زانستی سروشتی وەکو: فەلەکناسی و میکانیك و بیرکاری[٢٦٠]، لە سەرچاوەی دیکەیشەوە دەزانین، سینسیوس لای "هیپاشیا" فەلسەفەی ئەفلۆتین ، فەلسەفەی ئایینی وەسەنییەتی خوێندووە کە —تا رادەیەك ــ دژی ئایینی مەسیحی بووە، فەلسەفەی ئەفلۆتین بە شێوەیەکی گشتی، بۆتە لایەنێکی کامڵ لە پرۆسەی خۆ گواستنەوەی عەقڵیی لە فەلسەفەی وەسەنیی یۆنانییەوە بۆ مەسیحییەت، توێژینەوەی سینسیوس لە ئەفلۆتین لای "هیپاشیا" ئەوە بوو کە بوو مایەی بڕواهێنانی بە مەسیحییەت، پاشان دواتریش —وەك پێشتر باسمان کرد ــ ببێتە ئەسقۆف لە یەکێك لە کەنیسە کاسۆلیکییەکاندا، ئەو لە یەکێك لە وتارەکانیدا دەڵێت خەڵکی، لەو سەردەمەدا، وا سەری "هیپاشیا"ـیان نەکردووە کە تەنیا گەورەترین شرۆڤەکەری فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرستۆ بووە کە لە ژیاندا بووە، بەڵکو قوتابییەکانیشی دەهاتن بۆ لای هەر لە سینسیوسەوە ساڵی **٣٩٥** هەتا هیکیولانوس Hercullianus، ئەو دەڵێت گەنجەکان لە قورینا Cyrene وە گەشتیان بۆ ئەسکەندەرییە دەکرد تاکو لای ئەو بخوێنن:

«.. کەسایەتییەکی زۆر ناسراو، دیارە ناوبانگەکەی لەسەرووی پەسندانەوەیە، ئێمە خۆمان بینیمان، دوای ئەوەی گوێمان لەو ژنە بووە کە بە شەرەفەوە چووبووە ترۆپکی نهێنییەکانی فەلسەفە»..[٢٦١].

ساڵی ٤٠٤ ز سینسیوس دوو کتێبی لە نووسینی خۆی بۆ "هیپاشیا" نارد، ئەوانیش: "لەبارەی خەوزڕانەوە" و "دیۆن" بوون، ئەو لەکاتەدا بە ژنە سەرۆکی قوتابخانەی ئەفلاتوونیزمی نوێ لە ئەسکەندەرییە دامەزرابوو ــ سینسیوس لەم وتارەیدا داوای لێ دەکات سەرنجی خۆی لەسەر هەردوو کتێبەکە بۆ بنووسێت، "سینسیوس" خۆی تێبینی کردووە رەنگە کتێبی "لەبارەی خەوزڕانەوە" سروشی

خودایی بێت، بۆیە سوور بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی هەر چەندە چەندیش بۆچوونەکان لەبارەیەوە جیاواز بن، خۆ ناتوانین لەم وتارەیەوە ئەنجامگیریی ئەوە بکەین کە بۆچوونە ئەپستمۆلۆژییەکانی "هیپاشیا" نکوڵی لە بڕوابوون بە سروشی خودایی وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی مەعریفە کردووە، گومانی زۆر ئەوەیە هیپاشیا لەو پێشەکییانەوە کە لێیەوە دەستی پێکردووە مشتومڕی لەسەر نەکردووە، بەڵام دۆخی کتێبی دووەم جیاواز بوو، کە نامەکەی سینسیوس باس لەوە دەکات کتێبی دیۆن Dion بڵاو ناکاتەوە هەتا "هیپاشیا" بۆچوونی خۆیی لەبارەوە نەنوسێت، ئەویش پەسەندی کرد کە شایەنی بڵاو کردنەوەیە ، لەبەرئەوەی هەر بە راستیش کتێبەکە بڵاو بوویەوە ئەوا بۆمان هەیە لەوەوە ئەنجامگیری ئەوە بکەین "هیپاشیا" پەسەندی کردووە، کتێبی "دیۆن"یش لای خۆیەوە بەرگرییە لە فەلسەفە دژی وتاربێژەکان کە خۆیان وا پۆلێن کردووە فەیلەسووفن، هەر لەو کتێبەدا "ئەسقۆفی فەیلەسوف" لەبارەی ئەفلاتوونیزمی نوێوە دەدوێت کە لای "هیپاشیا" فێری بووە، ئەویش تێکەڵەیەکە لە سۆفیگەرایی و رێبازی سینیکی (المژهب الكلبی)، لێرەوە خودا تەنیا بوونێکی ترانسێندنتال نییە بەڵکو یەك ـــ ـیشە ، مرۆڤ ناتوانێت بە هچ رێگایەك بەڕاستەوخۆیی بیناسێت، لە بوونی ترانسێندنتالیشەوە نۆوسی هەمەکی Nous "عەقڵ" دەکەوێتەوە، لێرەدا بۆچوونەکانی لە تیۆرەکەی ئەفلاتوون دەچێت، لە نۆوسیشەوە مادە، کە چییەتی بوونی مادیی و بوونەوەرە هەستەکییەکانییەتی دەکەوێتەوە، کاتێك مادە "خراپە"یە و نۆوس پیرۆزە ، لەبەرئەوەیشی مرۆڤ لە لایەنێکییەوە مادەیە و لە لایەنەکەی دیکەیەوە روح و عەقڵە، ئەوا مرۆڤ لە لایەنێکییەوە خراپکارە و لەلایەنێکی دیکەوە روحێکی پیرۆزە، مرۆڤ لەڕێگای جڵەوگیریی دەروون ، ملکەچکردنی هەمەکیی هەستەکانەوە دەتوانێت لە نۆوسەوە سروشی راستەوخۆی لەبارەی حەقیقەتی خودایییەوە پیٚ بگات، واتە لە عەقڵی هەمەکییەوە، ئەم فەلسەفە خاوەن ئەپستمۆلۆژییە ئایینییە لەنێوان "سینسیوس" و

"هیپاشیادا" لێك نزیك بۆتەوە، كە بە تەواوی لەگەڵ وەسەنییەتی "هیپاشیا" و مەسیحییەتی "سینسیوس"ـدا، گونجاو و تەبایە[٢٦٢].

لەو چالاكییە فێركارییانەی كە "هیپاشیا" ئەنجامی داون ئەوەیە —وەك پێشتریش باسمانكرد ــ كتێبەكانی گەورە فەیلەسوفە وەسەنییەكانی گوتۆتەوە: ئەفلاتوون و ئەرستۆ، هەروەها فەلسەفەی فیساگۆرس و زینەفۆن و قوتابخانەی سینیكی گوتۆتەوە، هەندێك لە مێژوونووسەكان قوتابخانەی ریواقیشی بۆ زیاد دەكەن، لەمەش زیاتر شرۆڤەی فەلسەفەی ئەفلۆتینی كردووە، لەبەرئەوەی وەك باوكیشی بایەخی داوە بە بیركاری و زانستەكان، بۆیە هەندێك كات —زیاتر لە بایەخدانی بە فەلسەفەی سیاسی و ئەخلاقی ــ جەختی لەسەر وتنەوەی ئەو كتێب و نووسینە كۆنانەی كە پەیوەستن بە میتافیزیك ، كۆسمۆلۆژیا ، ئەپستمۆلۆژیاوە كردۆتەوە، لەوانەیشە كتێبی —زانستی ژمێریاری Arthmeticorum" دیۆفنتوس Diophantus ــیشی وتبێتەوە[٢٦٣].

ئاسانە ئەوەمان لا روون بێت چۆن رۆشنبیریی "هیپاشیا" یارمەتی داوە لە پێكهێنانی بنچینەی سروشتی بۆ ئەو بوارەی بووە یەكەم بایەخپێدانی عەقڵییانەی، مەبەستم: فەلەكناسییە، ئەویش وەك "تیۆن Theon" ــی باوكی، فەلەكناس بووە، بیركاریزان بووە (فەلەكیش لقێكە لە بیركاری) و لە كاتێكدا فەلسەفە دایكی زانستەكان، یان شاژنی زانستەكان Reginea sceintiarum بوو، ئەوا فەلەكناسی لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی زایینیدا لە گرنگترین زانستەكانی نێو توێژینەوە فەلسەفییەكان بووە، كە لەنێو خۆیدا لقە جیاوازەكانی مەعریفەی مرۆیی دەگرتەوە. لێرەدا لە یەك كاتدا هەم زانا ئەزموونگەراكان و هەم زاناكانی بیركای (بیركاریزانەكان) هەوڵیان دا بۆ تێگەیشتن لە میتافیزیكای ئەرستۆ و پراكتیزەكردنی، ئەمە وێڕای فیزیك و كۆسمۆلۆژیاش، هەروەها تێگەیشتن لە ئیپستمۆلۆژیای ئەفلاتوون و پراكتیزەكردنی لە گەردوونی بینراودا بە بەكارهێنانی تیۆرەكانی بیركاری و ئەندازە ، كەرەستە و ئامرازە زانستییەكان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە سەرەكییە

فەلسەفییەکانی وەك ئێمە کێین؟ بەرەو کوێ دەچین؟ پێگەی مرۆڤ لە سیستەمی شتەکاندا لە کوێدایە؟.. هتد[٢٦٤].

**شرۆڤەکان:**

وەك سویداس دەگێڕێتەوە ــ "هیپاشیا" سێ کتێبی گرنگی نووسیوە، ئەوانیش:

١- شرۆڤەی کتێبەکەی دیفۆنتس Diophantus ــی ئەسکەندەری بەناویشانی "زانستی ژمێریاریی Arthmeticorum (ئارتمیتیکا).. وەك ئەوەی عەرەبەکان وای پێدەڵێن.

٢- شرۆڤەی کتێبی کۆمەڵەی بیرکاری یان سێنتاکسی بیرکاریی Syntaxis Mathematica بەتلیمۆس (ئەوەش ناونیشانە سەرەکییە یۆنانییەکەی ئەو کتێبەیە کە لە ترادسیۆنی عەرەبیدا بە ناوی (المجسگی/ مەجستیێ) ناسراوە، لە کاتێکدا هەندێك جاریش بەو کتێبە دەڵێن Magiste Syntaxis واتە سێنتاکسی گەورە یان کۆمەڵە گەورە، عەرەبەکان وشەی Magiste ــ واتە گەورە ــ ـیان وەرگرتووە، ئامرازی ناساندنی (Al؟/ الـ)ـیان خستۆتە سەر و بۆتە (المجسگی)، یان کتێبە گەورەکە!

٣- شرۆڤەکانی کتێبی "پارچەکانی قوچەك Conic Sections" ــی ئەپۆلۆنیۆسی پێرگیوسی Apollouinus Pergaeus.

وێڕای ئەوەی سویداس وا بۆمانی دەگێڕێتەوە کە هەر سێ کتێبەکە ون بوون، کەچی "ماری ئیلین وێت" لایەنی کەم بوونی دوو کتێبیانی دەرخستووە، ئەوانیش کتێبی یەکەم و دووەمن، بەڵام کتێبی سێیەمیش ڕێی تێ دەچێت بە ناوی شرۆڤەکردنی تیۆرە ئەندازەییەکانی پێرگیوس Pergaeusـەوە مابێتەوە.

جێی خۆیەتی بە کورتی لەبارەی ئەم کتێبانەوە بدوێین:

## یەکەم: شرۆڤەکردنی کتێبی Arthmeticorumـی دیفۆنتس:

دیفۆنتسی ئەسکەندەری کە دەوروبەری ساڵی ٢٥٠ ز ـــ دەرکەوتووە، زانایەکی بەناوبانگی بیرکاری بووە لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی زایینی دا، خاوەنی ئەو کتێبەی بە ناوی ئارتمتیکا واتە "زانستی ژمێریاری" ناسراوە، کە لە سێزدە کتێب (یان وتار)دا دانراوە ، جگە لە شەش کتێب هیچی دی لێ نەماوەتەوە، لێکۆڵەران لەبارەی ئەو وتار یان کتێبانەی لە کتێبەکەی دیفۆنتس ون بوون ، ئەو وتار و کتێبانەیشی تا ئێستا ماونەتەوە، بۆچوونی جیاوازیان هەیە، وەلێ لەگەڵ ئەوەیشدا لەسەر ئەوە کۆکن کە "هیپاشیا" لە جیهانی کۆندا گەورەترین و بەناوبانگترین شرۆڤەکەری ئەم کتێبە بووە، لە هەندێك سەرچاوەی نوێشەوە دەزانین ئەو پاکنووسی (تنقیح) و دەستکارییانەی "هیپاشیا" لە کتێبی زانستی ژمێریاریدا کردوویەتی ـوا پێدەچێ ـــ بایەخدارترین و قووڵترین نوسخەی ئەم کتێبە دەستنوسەی بێت[٢٦٥] .

بایەخی دیفۆنتس و کتێبەکەی (و ئینجا شرۆڤەکردنی لەلایەن هیپاشیاوە) دەگەڕێتە بۆ ئەوەی کە ئەم زانایە یەکەم کەس بووە ئەو تۆوەی چاندووە کە دواتر زانستی جەبر بووە بەرهەمەکەی، ئەگەرچی کۆدەنگی هەیە لەبارەی ئەوەی کاریگەری میسری و بابلییەکان لە کارە بیرکارییەکانیدا زۆر زەق دیارە، بە جۆرێك کە هەر پرسێکی شیکار کردووە چارەسەرێکی سەربەخۆی بۆ خستۆتە روو کە نە دەچێتەوە سەر هیچ رێگەیەکی زانستی و نە دەگەڕێتەوە بۆ رێسایەکی تەواو، وەلێ لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو یەکەم کەس بووە رووبەڕووی بیرۆکەی دۆزینەوەی بڕی نادیار بەهۆی رێژەی بڕە دیارەکانی ترەوە بۆتەوە، ئەگەر چی لە چارەسەرەکەی ئەم بیرۆکەیەدا کە بەرهەمەکەی جەبر بوو لەسەر رێگە فیساگۆرییەکان هەڵوەستەی کردووە کە بۆ هەر ژمارەیەك بە هێڵێك یان شێوەیەکی ئەندازەیی ئاڵۆزتر رەمزێکی داناوە ، بەڵگە ئەندازەییەکانی خستۆتە شوێنی پرۆسە ژمێریارییەکانی ئەو سەردەمە[٢٦٦] .

بۆ ئەوەی رادەی گرنگی شرۆڤەکانی "هیپاشیا" بۆ ئەم کتێبەمان بۆ روون بێتەوە ئەوا دەبێت ئەو لێکدابڕانە بە زەینی خۆماندا بهێنین کە ئەفلاتوون لە دیالۆگی

گۆرگیاس Gorgias ـدا لەنێوان زانستی تیۆری ئەبستراکت، کە بێ پسپۆڕێتی تاوتوێی بابەتە گشتییەکان دەکات ، هونەری پراکتیکی ئەم زانستەدا بەرپای دەکات، سوکرات لەم دیالۆگەدا زانستی ژمێریاری Arithmetic و هونەری ژمارە Calculation (جیاوازی دەخاتە نێوان لایەنی تیۆری ئەبستراکت و لایەنی کردارەکی و پراکتیکی ژمێریاری) لێك جودا دەکاتەوە، بە تێبینی ئەوەی «زانستی ژمێریاری لەبارەی ژمارەی جووت و ژمارەی تاکەوە لێکۆڵینەوە دەکات بە چاوپۆشین لە چەندێتی یان بڕی هەر یەکێکیان».. بەڵام هونەری ژمارە «دەکۆڵێتەوە لە چەندێتی یان چۆنیەتی پەیوەستبوونی ژمارەی جووت یان تاکەکان خۆیان لە رووی چەندێتی لەلایەك ، هەندێکیان بە هەندێکی تریانەوە لە لایەکی دیکەوە»[٢٦٧] .

بەڵام لێك جیاکردنەوەی ژمارە ئەبستراکتەکان –بەشێوەیەکی گشتی وەك ژمارە جووت و تاکەکان (واتە زانستی ژمێریاری) ـــ و ژمارە تایبەت یان جۆریی یان دیاریکراوەکان (هونەری ژمارە) بەزۆری لای "دیفۆنتس" ونە، ئەوەش بەهۆی ئەوەی بەزۆری لای ئەو "هونەری ژمارە" شێوەی ئەبستراکت وەرناگرێت، بۆیە رۆڵی "هیپاشیا" یەکەم ئەوە بوو کە ئەم لێك جیاکردوەیە شرۆڤە بکات ، ئینجا دووەم ئەوە بوو چووە نێو کێشەگەلێکی نوێوە، هەروەها بەشداریی کرد لە گەیشتن بە هەندێك چارەسەری ئەڵتەرناتیڤ بۆ کێشە سەرەکییەکان لای دیفۆنتس، ئەمەش بووە مایەی روونکردنەوەی مۆرکە ئەبستراکەتەکە، ئەمە وێڕای روونکردنەوەی زانستی ژمێریاری بە شێوەیەکی گشتی، هەروەها بەشدارییەکانی دیفۆنتسی زەق کردەوە کە دواتر تیۆری جەبری بەرهەم هێنا[٢٦٨] .

"ماری ئیلین وێت Mary E. Waithe" لە کتێبی "مێژووی ژنانی فەیلەسوف" بەرگی یەکەم لا پەڕە ١٨٢ ـــ تێبینی و پاکنووسییەکانی زیادکراوەکانی "هیپاشیا"ی وەرگێڕاوە. هەروەها لایەنێکی ئەو شرۆڤانەی وەرگێڕاوە کە ماونەتەوە و بەهۆیانەوە "هیپاشیا" لە جیهانی کۆندا ناوبانگی دەرکردووە. ئەوەش لە لاپەڕە ١٧٨ و لاپەڕە ١٨٠ دا، بە گواستنەوە لە بڵاوکردنەوەکەی "پۆل تانری Paul

Tannery" ـیەوە کە دەقە یۆنانییەکەی بڵاو کردۆتەوە ، لە بەرامبەریشیدا "دەقە لاتینییەکە"ی کتێبی زانستی ژمێریاریی دیفۆنتس، هەروەها قەشە ئەی. رۆم .A Rome هەمان دەقی بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ پێداچوونەوەکەی تیۆن Theon ـی باوکی "هیپاشیا"[٢٦٩].

**دووەم: شرۆڤەکردنی کتێبی "کۆمەڵەی بیرکاری Syntaxis Mathematica" ـی بەتلیمۆس:**

"بەتلیمۆس کلۆدیۆس Ptolemy Claudius" کە لای عەرەب نازناوی بەتلیمۆسی قەلوەزی لێ نراوە، بەناوبانگترین زانا بوو لەو قۆناغەدا ، دوای ئەرستۆ لە هەمووان زیاتر کاریگەری لەسەر رۆژهەڵات و رۆژئاوا داناوە، تا هاتنی کۆپەرنیکۆس Copennicus ـی فەلەکناس و بیرکاریزان (وەك وتیشمان فەلەك لقێکە لە بیرکاری) هەر بەو جۆرە مایەوە. جوگرافیزان و فیزیکزانێکی میسریی یۆنانی بوو، لە صەعیدی میسر لەدایك بووە، لە چارەکی کۆتایی سەدەی دووەمی زایینیدا (دەوروبەری ساڵی ١٧٠ ز)[٢٧٠] لە شاری ئەسکەندەرییە پێگەیشتووە، بەتلیمۆس ژمارەیەکی زۆر کتێبی داناوە بەناوبانگترینیان کتێبی "کۆمەڵە یان پێکهاتەی بیرکاری" بوو، کە لە یۆنان بەناوی "پۆلێنکردنی گەورە لە بیرکاریدا" و لە ترادسیۆنی عەرەبیدا بەناوی "المجسگی Al Mageste" بە داتاشین لە وشەی Magisteی یۆنانی کە بە مانای "گەورە" دێت، ناسراوە ، زیادکردنی ئامرازی ناساندنی (Al/ الـ) مەبەست لێی ـــ وەك پێشتریش باسمان کرد ـــ "گەورەکە" بووە، ئەویش کتێبە گەورەکەیە، چوون ئینسکلۆپیدیایە لەبواری فەلەکناسی و سێگۆشەدا و بابەتەکانی: خڕێتی جیهان، جێگیریی زەمین لە ناوەڕاستی گەردووندا، کەلوەکان، پانی وڵاتان، جووڵەی خۆر، هەڵگەڕانەوە بەهاری و پاییزییەکان، شەو و رۆژ، جووڵەکانی مانگ و ژماردنی، مانگیران و رۆژگیران، ئەستێرە جێگیرەکان و هەسارە گەڕۆکەکان (الكواكب المتحيره)[٢٧١].

ئەوەی زۆرتر مایەی سەرقاڵیی بەتلیمۆس بوو هەسارە گەڕۆکەکان و جووڵەکانیان بوو (بە بینینی چاو)، خۆ ئەگەر زەوی لە ناوەندی گەرووندا جێگیر بێت ، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و هەسارەکان لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا بە دەوریدا بسوڕێنەوە، ئەی بۆچی مانگ و پێنج ئەستێرەکە (عەتارد و زوهرە و مەریخ و موشتەری و زوحەل) لە ئاسماندا دەگەڕێن، دەمێك پێش خۆر دەكەون و دەمێك دوای دەكەون، جار دوای جاریش هەندێکیان پێش هەندێکی تریان دەکەون و لەم کاتەوە بۆ ئەو کاتی دیکە شوێنەکانیان لە ئاسماندا دەگۆڕن، ئەمە سەرەڕای ئەستێرە جێگیرەکان؟

راستییەکەی کێشەی هەسارە گەڕۆکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باوەڕەی کە زەوی لە ناوەندی گەرووندا جێگیرە، نەك هەسارەیەك بێت و بە دەوری خۆردا بسوڕێتەوە کە لە ناوەندی کۆمەڵە خۆرییەکەماندایە[٢٧٢].

"پاپۆس Pappus" و "تیۆن Theon"ـی باوکی "هیپاشیا" —لەو سەردەمەدا گەورەترین شرۆڤەکاری کتێبی "المجسگی" بەتلیمۆس بوون ــ بەڵام "هیپاشیا" بەوە ناسرابوو کە پاکنوسکەرەوەی (منقحە) فەلەکناسیی بەتلیمۆسە، ئەوەش مێژوونووسانێکی وەکو "فایبریکۆس Fabricus" ، سوکراتی مێژوونووس و "سویداس Sauidas" و ئەوانی تر، بۆمانی دەگێڕنەوە. ئەم مێژوونووسانە گریمانەی ئەوەیان کردووە ئەوەی ئەم ژنە فەیلەسوفە کردوویەتی لەنێو چوون، وەلێ کۆمەڵێك کتێبی کۆتاییەکانی سەدەی چوارەم و سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی زایینیمان، بە چەندین کۆپی شرۆڤەکانی "تیۆن"ـیشەوە لەسەر کتێبی کۆمەڵی بیرکاریی بەتلیمۆس ، ئەو خشتە فەلەکییانەی کە لێکۆڵەران پێیان وایە "هیپاشیا" دروستی کردوون بۆ ماوەتەوە، پۆل تانریش سەرنجی ئەوە دەدات هێنانەوەی ئەو بانگەشەی "فابریکۆس"ـی مێژوونووس برەوی پێ داوە گوایە شرۆڤەکانی "هیپاشیا" ون بوون ــ وای لە مێژوونووسانی بیرکاری کردووە شکست بهێنین لە ناسینەوەی جیاوازییەکی دوو سەرەدا، ئەویش دەرکەوتنی خشتە فەلەکییە نوێیەکان لە سەردەمی شرۆڤەکەرەکاندا کە هاوشێوەی کارە بنچینەییەکەبوون لەلایەك، ئینجا ونبوونی

کارێکی گرنگ (شرۆڤەکانی "هیپاشیا") بێ ئەوەی شوێنەوارێکی لێ مابێتەوە.. بەم جۆرە تانری دەگات بەو ئەنجامەی کتێب و شرۆڤەکانی هیپاشیا لەبارەی کتێبەکەی بەتلیمۆسەوە هەموویان ون نەبوون، کاتێك جەی. ئێف. مۆنتوکلا J. F. Montucla سەرنجی ئەوە دەدات:

«کتێبی سێیەم لە شرۆڤەکان (بۆ المجسگی Almageste) ماوەتەوە، ئەوەش ئەو شرۆڤانەن کە "تیۆن"ـی باوکی بە راشکاوی بۆی گەڕاندۆتەوە.. وا دەردەکەوێت تیۆن خەریك بووە بە ئامادەکردنی شرۆڤەکان لەبارەی کتێبەکەی بەتلیمۆسەوە ، داوای لە "هیپاشیا" کردووە پێداچوونەوەی دەستنووسەکە و چەندین پرسی بیرکاری و میتۆدی و عەقڵی بکاتەوە —کە پێشتر هیچ کەسێك لەسەریان نەوەستاوە: نە "تیۆن" و نە بەتلیمۆس خۆیشی، بۆیە هیپاشیا کەوتە توێژینەوەیان و رووبەڕووبوونەوەیان، بەڵام لەکاتی شیکارکردنی ئەم پرسانەدا، دووبارە توێژینەوەی لە بەها بیرکارییەکانی رووداوە ئاسمانییەکان کرد، کە زانایانی کۆنی فەلەکی بە "بەتلیمۆس"ـیشەوە پەسنیان داون، هەروەها خشتە فەلەکییەکانیشی داناوە کە بەرەنجامی ئەم توێژینەوەیە بوون. شرۆڤەکانی ئەو بۆ کتێبی سێیەمی "المجسگی" (و رەنگە کتێبەکانی دواتریش) وای کرد شیکارییەکانی بۆ بابەتە فەلسەفی و بیرکارییەکان دەوڵەمەندتر و بەهێزتر بێت ــ ئەوەش ئەو بابەتانە بوون کە تیۆنی باوکی لە شرۆڤە بنەڕەتییەکاندا ئیلهامبەخشی بوو، کاتێکیش ئەم شیکارییانە پەرەیان سەند بوونە شرۆڤە، شرۆڤەی هیپاشیا، لەبەر ئەم هۆکارە دەبینین مێژوونووسەکان دەڵێن باوکی ئەم شرۆڤانەی داوەتە پاڵی.

شرۆڤەکانی "هیپاشیا" بۆ کتێبی سێیەم لە کتێبی "المجسگی" یان کۆمەڵەی بیرکاریی بەتلیمۆس دەکەوێتە لاپەڕەکانی ٨٠٧ تا ٩٤٢ لە بەرگی سێیەم لەو چاپەی کە ئەب رۆم A. Rom بڵاوی کردۆتەوە، تا ئێستا هیچ وەرگێڕانێکی ئەم شرۆڤانەدا بە زمانی نوێ دەرنەکەوتووە، چونکە ئەم کتێبە هێشتاش بە سەختی و ئاڵۆزییەکەی رووبەڕووی وەرگێڕەکان دەبێتەوە! چونکە تێگەیشتنی دەقەکە تەنیا پێویستی بە

زانینی زمانی یۆنانی ئەسکەندی نییە کە سەدەی پێنجەمی زایینی باو بوو، بەڵکو شارەزاییەکی ورد دەخوازێت لەو چاپانەی کە زوو بۆ کتێبەکانی بەتلیمۆس کراون، هەروەها شارەزایی دەوێت لە بیرکاری و فەلەکناسیی میسری کۆن.

راستییەکەی ئەگەر ئێمە بمانەوێت شرۆڤەکانی "هیپاشیا" لەسەر کتێبی سێیەمی (المجسگی) بنرخێنین، ئەوا دەبێت ئەم شرۆڤانە بخەینەوە کۆنتێکستە مێژووییەکەیان، بەتلیمۆس سیستەمێکی تا رادەیەك کامڵی بۆ فەلەکناسی دانا، خۆ نەخشەڕێژیی ئەندازەیی بۆ ئاسمان وەك ئەوەی فەلەکناسان دەیبینن بە نزیکەیی هاوشێوەیە لەگەڵ تیۆری ئەندازەیی، بەڵام پێکدژی لەنێوان تیۆر و تێبینییە فەلەکییەکاندا، بەتلیمۆس بە گریمانەیەکی سادە راڤەی کردووە کە زەوی کردۆتە ناوەندی گەردوون، ئەم تیۆرەش پشتی پێ بەسترا هەتا هاتنی کۆپەرنیکۆس Copernicus (١٤٧٣ ــ ١٥٤ ؟) ـی فەلەکناسیی ناسراوی پۆلەندی، ئەو پێی وابوو زەوی و هەموو هەسارە گەڕۆکەکانی دیکەیش بە دەوری خۆر و بەدەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوە، تۆ بڵێیی کۆپەرنیکۆس سەرنجەکانی "هیپاشیا"ی لەبارەی کتێبی سێیەم نەخوێندبێتەوە؟! لە رووی مێژووییەوە ئەوە سەلمێنراوە کە کۆپەرنیکۆس بۆ خوێندنی فەلەکناسی چووە بۆ ئیتالیا ، شەیدای خوێندنەوەی هەر شتێك بوو کە لەبارەی فەلەکناسە کۆنەکانەوە بهاتبایە بەردەستی، بەتایبەتیش بەتلیمۆس، هەروەها بە بایەخەوە ئەو شرۆڤانەی دەخوێندەوە کە لەسەر بەتلیمۆس نووسرابوون، ئایا دەکرێت ئەو شرۆڤانەی نەخوێندبێتەوە کە هەندێك دەڵێن گەورەترین و گرنگترین شرۆڤە لەبارەی بەتلیمۆسەوە پێمان گەیشتبێت، شرۆڤەکانی تیۆن و "هیپاشیا"ی کچی؟! لەڕووی مێژووییەوە ئەوەش سەلمێنراوە کۆپەرنکیۆس لەو کاتی کە ئەم شرۆڤانە لە کتێبخانەی بۆرنزودی میدیچی Le Renzo Di Midiclau بە ژمارە ١٨٠٢٨ پۆلێن کرابوون، سەفەری بۆ فلۆرەنسا کردووە، ئێ تۆ بڵێیی کۆپەرنیکۆس سەردانی فلۆرەنسای کردبێت و نەچووبێتە ئەو کتێبخانەیەی کە مەزنترین و

بەناوبانگترین دەقە کۆنەکانی لە ئیتالیادا لەخۆ گرتبوو؟! ئایا دەکرێت "هیپاشیا"ی نەخوێندبێتەوە؟!

سێیەم: شرۆڤەی کتێبی پارچەکانی قوچەك Conic Sections :

"موعجەمی سویداس" و سوکراتی مێژوونووس و فابریکۆس و ئەوانی تریش باس لەوە دەکەن "هیپاشیا" کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی شرۆڤەکان لەبارەی کتێبی " پارچەکانی قوچەك Conic Sections"ی ئەپۆلۆنیۆس پێرگیوسی Apollouinus Pergaeus، وا دیارە تەنیا ئەم کتێبە لە سێ کتێبەکەی "هیپاشیا" لەنێو چووە. ئێدمۆند هالی Edmund Hally (١٦٥٦ ــ ١٧٤٢ ز) ــی فەلەکناسی بەناوبانگی ئینگلیزی لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا کۆپییە عەرەبی و لاتینییە کۆنەکانی کتێبی "پارچەکانی قوچەك"ــی کۆ کردەوە، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ سەرلەنوێ کۆکردنەوەی دەقە بنچینەییەکە ، ئەو شرۆڤە و تێبینییانەی کە لەبارەیەوە نوسراون، لەنێو هەموو ئەو شرۆڤانەدا کە کۆی کردبوونەوە شرۆڤەکانی "هیپاشیا"ی ناسییەوە، ئەگەرچی تەنیا لاپەڕەی ناونیشانەکەی تێدا بوو، بێ ئەوەی دەقی کتێبەکە خۆی بدۆزێتەوە، هەروەها "ماری وێت"ــیش سەرکەوتوو نەبووە لە بەدەستهێنانی ئەو بابەتە زانستییەی کە "هالی" پێوەی سەرقاڵ بوو، ئێستاشی لەگەڵ بێت ئومێدی بەدەستهێنانەوەی ئەم کتێبەی شرۆڤەکانی "هیپاشیا" لەبارەی دەقە بنچینەییەکە لەخۆ دەگرێت، ئومێدێکی لاوازە[٢٧٣] .

ماوەتەوە ئاماژە بە دوو داهێنان بکەین کە مێژوونووسەکان دەیدەنە پاڵ "هیپاشیا":

**داهێنانی یەکەم:**

پلانسفێر Plansisphere، نەخشەیەکی سێ ڕەهەندی نیوە گۆی ئاسمانە، ئامێرێکی هەیە ئاماژە بە بەو بەشە دەدات کە لەوە وەختێکی دیاریکراودا تەماشای دەکرێت. یاخود ئامێرێکی پاشایەتی کۆن بووە بە ناوی "ئەسترۆلاب Astrolabe"

کە سینیوسی قوتابی خۆی داوای لێکرد ، دواتریش سینسیوس کردیە دیاری بۆ پاینۆسوس Paenius کە خانەدانێك بوو لە دەرباری ئیمپراتۆردا لە قوستەنتینییە[٢٧٤].

**داهێنانی دووەم:**

لە وتاری پازدەیەمدا سینسیوس داوای لێ دەکات ئامێرێکی بۆ دروست بکات بۆ پێوانەکردنی کێشی جۆریی شلەمەنییەکان Baryllio کە جۆرێکە لە هایدرۆمەتر TerHydrome، لەم وتارەدا یەکەم پەسنێکە کە لەبارەی ئەم ئامێرەوە پێمان گەیشتبێت[٢٧٥]، "تانری"ـیش دەڵێت ئەم ئامێرە کە "هیپاشیا" دایهێناوە بەکاردێت بۆ زانینی کێشە جیاوازەکانی ئەو شلەمەنییانەی کە بەتایبەت نەخۆشەکان بەکاری دەهێنن، کاتێك زانستی پزیشکیی کۆن ڕێنمایی نەخۆشەکانی دەکرد بۆ خواردنەوەی ئەو شلەمانییانەی کێشیان سووکتر بوو چونکە باشترن[٢٧٦].

# کۆتایی

ئەوە کورتەیەك بوو لەبارەی "هیپاشیا"ی خانمە فەیلەسوفی ئەسکەندەرییەوە، کە لە رەوشێکی رۆشنبیریی ئەوتۆدا لەدایك بوو کە پاشا بەتلیمییەکان مکورِ بوون لەسەر ئەو رەوشە، فەلسەفە و بیرکاری و فەلەکی خوێند و بەم زانیارییانە لە خەڵکی سەردەمەکەی ناسراوتر بووە، لە فەلسەفەدا بەتوانابوو بەتایبەتیش گەورە فەیلەسوفانی هزریی یۆنانی زینەفۆن و فیساگۆرس و ئەفلاتوون و ئەرستۆ، ئینجا ئەفلۆتین و ئەفلاتوونیزمی نویٚ، لە بارەی میتافیزیك و ئیپستمۆلۆژیاوە وانەی گوتۆتەوە، ئایدیای بەو بنچینە تیۆرییانە گەیاندووە کە لە هەڵسەنگاندنی تیۆرە فەلەکی و ئەندازەییەکاندا بەکاری هێناون، تەنانەت بەر لەوەی تەمەنی بگاتە ٣٠ ساڵان عەقڵێکی پێگەیشتووی بەنێوبانگ بووە، لە ژینگەیەکی عەقڵی وەهادا ژیاوە ژنان لێیەوە دوور بوون کەچی لە پۆستێکدا دامەزرێنرا کە هەرگیز پێشتر ژن پێی نەگەیشتبوو: سەرۆکی قوتابخانەی ئەفلاتوونیزمی نویٚ ، لە سەردەمەکەی خۆیدا بە خانمە فەیلەسوفە مەزنەکە ناسرابوو[٢٧٧].

ئەم "فەیلەسووفە مەزنە" لەلایەن دەمارگیرژیی ئایینی، یان بە واتایەکی وردتر لەلایەن ئارەزووی ئایینیەوە، تووشی چەوساندنەوە بووە، بۆیە پارچە پارچە کراو بەشە لەرزیوەکانی —وەك گیبۆن دەڵیٚ ــ هەڵدرایە نێو کڵپەی ئاگر «... پاشان بەتریرك یان گەورەی ئەسقۆفەکان بە دیاریی گونجاو رێرِەویی بەدواداچوون و سزادانی دادوەرانەی وەستاند، وەلیٚ کوشتنی هیپاشیا پەڵەیەکی رەشی ئەخلاقی کیرلس و ئایینەکەیەتی نە دەسرِێتەوە و نە لاش دەچیٚ»..[٢٧٨]. رەسلیش دەڵێت «دوای ئەوە فەیلەسوفەکان هەرگیز گۆمی ئەسکەندەرییەیان نەشڵەقاندووە»..[٢٧٩]. هەر دوای مردنی هیپاشیا مامۆستا وەسەنییەکانی فەلسەفە بەرەو ئەسینا رۆیشتن بۆ ئەوەی تێیدا خۆیان لە ئازار بپارێزن، کە لەویٚ خوێندنی مەسیحی هێشتا بە رێژەیی ئازاد بوو ، هێشتا مامۆستاکانی لە شارەکانی تر باوەرِیان بەخۆیان بوو[٢٨٠].

بەڵام بایەخدان بەم ژنە ناوازەیە لە رابردووە بەردەوامە و درێژ بۆتەوە، ئەگەرچی بەهۆی هۆکاری هەمەجۆرەوە لە ماوەی پچڕ پچڕدا بووە، لە سەدەی حەڤدەدا ئەدیبی فەرەنسی Gille Menange لە کتێبی مێژووی فەیلەسوفە ژنەکاندا قەسیدەیەکی کورتی نووسیوە بەناونیشانی "لەبارەی داناییەوە" ، تێیدا دەڵێت:

«هەرکەسێك لە ماڵە پاك و بێ گەردەکەت بڕوانێ و رابمێنێ..

کە لە هەر رازاندنەوە و جوانکارییەك تەواو خاڵییە

دەبێت خۆی بە رۆشنبیرییەوە سەرقاڵ بکات..

بە راستی، بە ئاسمانەوە خەریك بوویت، تۆ..

ئەی خانمی دانا "هیپاشیا"..

زمانی تۆ ئازارە.. و ئەستێرەکەیشت لە ئاسمانی داناییدا جریوەی دێ»..[٢٨١].

لە سەدەی نۆزدەدا رۆماننوسی ئینگلیزی چارلز کینگزلی Charles Kingsley (١٨١٩ ــ ١٨٧٥) ژیانی ئەوی کردە بابەتی رۆمانێکی و ناوی نا "هیپاشیا"، کاتێکیش ئەو خۆی لە زانکۆی کامبریج مامۆستای مێژوو بوو هەستێکی مێژوویی ئاشکرای هەبوو —ئەگەرچی هەمیشە نەپێکاوە و ورد نەبووە ــ کەچی ساڵی ١٨٥٣ ز "هیپاشیا" چاپ کراو و تێیدا زەمەن دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ ئەوەی وێنای ئەسکەندەرییە لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا بکات، کە تێیدا کەنجێکی مەسیحی دەبینینەوە بەناوی فیلامۆن Philammon لە بیابانەوە دێتە شارەکە کە بە تووندی بەرەو خۆی رایکێشاوە بۆ ئەوەی لە مۆزەخانە لای "هیپاشیا" بخوێنێت، لێرەدا نووسەرەکە بە شتێك وردەکاری و درێژییەوە وەسفی شاری ئەسکەندەرییە دەکات، وەسف و وێنەیەکی قەشەنگی شاری ئەسکەندەرییە و شەقامە قەرەباڵغەکانی ، کێشەکانی ژیان لەو کاتەی شارەکەدا پیشان دەدات، هەروەها نووسەرەکە وێنای شۆڕشی جەماوەری تووڕە و یاخی دەکات و ــ بە کوشتنی هیپاشیا دوایی دێت. ئەو کات دووبارە فیلامۆنی گەنج دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیابانەی کە لێوەی هات.

راستییەکەی نووسەر ویستویەتی ئەو ململانێیە وێنا بکات کە لەنێوان مەسیحییەت —کە لە سەرەتای سەردەمەکەیدا خۆی بەهێز دەکرد ـــ و فەلسەفەی یۆنانی وەکو ئەوەی لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا لە ئەسکەندەرییە هەبوو، بەرپا بووە[282].

لەگەڵ پەیدابوونی بزووتنەوەی ژنان ، گەڕانی زیاتر بەدوای هەوڵە ژنانەکان لە رابردوودا ، کۆکردنەوەی ئەو بەڵگانامانەی بەشداریی ژنان لە چالاکییە ئەدەبی و فەلسەفی و زانستییەکاندا دەسەلمێنن، گرنگی زیاتر بە "هیپاشیا" درا، بەم دواییانەش رۆژنامەیەك لەبارەی فەلسەفەی ژنانەوە دەردەچێت ناونراوە "هیپاشیا" وەك رێزلێنانێك لە داپیرە گەورەی[283].

ئەوەیش "ڕۆژنامەیەکی فەلسەفییە" و مارگرێت سیمۆنز Margaret Simons سەرنووسەریەتی و زانکۆی ئیلینۆی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەریدەکات[284].

لە کۆتاییدا دەبێت لەگەڵ جۆرج ساروتۆندا بڵێین ئەم ژنە مەزنە «شەرەفێکی دوو سەرەی پێ براوە، ئەو یەکەم ژن بووە بە بیرکارییەوە سەرقاڵ بووە، هەروەها لەو کەسە بەراییانەیە کە لە پێناوی زانستدا شەهید بوون»..[285].

## کۆتایی لێکۆڵینەوەکە:

لە هەشت بەشی ئەم کتێبەدا، کۆمەڵێك "ژنی فەیلەسوف"ــی جیهانی کۆنمان پیشاندا، لە هەوڵێکدا کە ویستمان بەهۆیەوە پەردەی سەر چاوی ژنان هەڵدەینەوە کە رێی روانینیان لێ دەگرێت بۆئەوەی لەم رۆژگارەدا بینایيەکەی ببێتە ئاسن، هەروەها بۆ گەڕاندنەوەی متمانە بەخۆی ، گێڕانی رۆڵی خۆی لە پاڵ پیاودا پێکەوە لە بونیادنانەوەی کۆمەڵگە، هەموو ئەمانەش سەرناگرن تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە ژیریی ژن ، دروستی بۆچوون ، توانای بیرکردنەوەی زانستییانەی نەسەلمێنرێن کە هیچی کەمتر نییە لە توانای پیاو، بەتایبەتیش لە بواری فەلسەفەدا کە وا دەردەکەوێ

کایەیەکی داخراوە و تەنیا لە پیاودا کورت کراوەتەوە، بەوەش لەو بیرۆکە هەم باو و هەم ساولکانەیە دەدەین کە گوایە "عەقڵییەتی ژن لاواز و نوقسانە، لێرەشەوە دەگەینە سڕینەوەی ئەو بیرۆکە نەزۆکەی کە عەقڵی مرۆیی بەسەر عەقڵی دوو بەشی "پیاوانە" و "ژنانە"ـدا دابەش دەکات.

لەم کۆتاییەدا دەمانەوێت ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ بدەین:

خاڵی یەکەم: شتێکی ئاساییە کە سەرەتاکانی فەلسەفە لای ژن سادە و سانا بووە ، پێکهاتووە لە دەربڕینی کورت و لەو فراگمێنتە پەرژ و بڵاوانەی بۆمان ماونەتەوە و لە دەوری بابەتی سادە دەسوڕێنەوە، یان گیرساونەتەوە بە درێژکردنەوەی بیرۆکەیەکەوە بۆ بوارگەلێکی فراوانتر و وەك ئەوەی لای ژنە فیساگۆرییەکان هەبوو، بەڵام دەبێت ئەم خاڵانەمان لە یاد نەچێت:

أ- سەرەتاکانی فەلسەفە لای پیاوانیش هەر بەم جۆرە سادە سانا بووە، وەك ئەوەی ئاو بنچینەی هەموو شتێکە "بۆ نموونە لای تالیسی یەکەم فەیلەسوف"، بگرە هەر ئەو گوزارەیە خۆی لە بیرۆکەیەکی میسرییەوە وەرگیراوە لەبارەی نیلەوە کە هەمیشە لەکاتی داکشاندا بەروبومی داوە، ئەمە وێڕای دەلتا ــ ئەوەش ئەو بیرۆکەیە کە تالیس گواستویەتییەوە کاتێك لە میسر بووە و لە پەرستگاکانیدا فێر بووە.

ب- کاتێك ڕەوشی کۆمەڵایەتی بۆ ژن لە جیهانی نوێدا لە بار دەبێت، ئەوا لە سەدەی حەڤدەدا فیکری ڕوونتر دەبینین تا ئەوەی لە سەدەی بیستدا ئەم فیکرانە دەگەنە چڵەپۆپە، لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا "ژنانی فەیلەسوف" لە سەردەمی نوێدا، ژنانی وەکو "مارگرین کافندیش" (١٦٢٣ ــ ١٦٧٣ ز) خانمە فەیلەسوفێکی ئینگلیزی کە لەبارەی "فەلسەفەی سروشتی"ـیەوە نوسیویەتی و "کریستینا فازا" (١٦٢٦ ــ ١٦٨٩ ز) شاژنی بەناوبانگی سوویدی و قوتابی دیکارت، کە ساڵی ١٦٥٠ دیکارتی بۆ ستۆکهۆڵم بانگ کردووە ، "ئان فینش کۆنووای" (١٦٣١ ــ ١٦٧٩ ز) کە زۆر لە ژێر کاریگەری "لایبنیتز"دا بوو و بگرە کۆمەڵێك توێژەر ئایدیای بەناوبانگی "مۆناد Monad" لە فەلسەفەی لایبنیتزدا بۆ ئەو

